لە سەردەمی منداڵیمەوە بەردەوام پیاوێکی ڕیشسپیی کورتەباڵا، ڕەنگی چاوەکانی قاوەیی و لووتێکی قنج، کەوا و سەڵتەی لەبەردایە و مشکییەکی ڕەشی بەتوندی بە سەریەوە پێچاوە، گەلێک جار فەرەنجییەکی ڕەنگ بۆری لەبەردایە و فەقیانە سپییەکانی زوو زوو لە بازووی توند دەکات و بە لاچاوێک بەسەرنجەوە لێم دەڕوانێت، دەتوانم بڵێم، پیاوێکی جرپنە و جەستە و قسەکانی بەردەوام پەلەپەلیان پێوە دیارە، کاتێک دەدوێت هەناسەی بۆنی ڕازیانەی لێ دێت.

لەوەتەی بیرم کردۆتەوە ئەو کابرایە زوو زوو دێتە خەونم، یان لەناکاو لێرەولەوێ دێتە سەر ڕێگام.

ئەگەر باش لەبیرم بێت، ئەو پیاوە ڕیشسپییە کورتەباڵایە لەدوای ئەو ڕۆژەوە لە ژیان و ناو خەون و خەیاڵەکانی مندا پەیدا بوو، کە دایکم خەونێکی خۆی بۆ من و باوکم گێڕایەوە، گوایا بە قسەی دایکم بێت، پیاوێک لەو شێواز و چەشنە هاتبووە خەونی دایکم و پێی وتبوو، "پێویستە خایمی کوڕت ببێت بە حاخام!"

چاوەڕوان بووم، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان پێم بڵێت، تۆ دەبێت ببیت بە حاخام! ئەوەم لێ نەبیست، بەڵام هەموو جارێک هەمان قسەی دووبارە دەکردەوە و پێی دەوتم، 'کوڕە ئاگادار بە! هەموو شتێک لەوێ ڕوو دەدات، دەستوبردی لێ بکە و تۆ دەبێت لەوێ بیت!'

ئەو پیاوە پیرە گرگنە، تەنها جارێک چییە بواری پێ نەداوم وەڵامی بدەمەوە، یان بتوانم پرسیاری ئەوەی لێ بکەم، ئاخۆ هەموو شتێک لەکوێ ڕوو دەدات و من دەبێت لەکوێ بم؟

دوای مردنی دایکم و باوکم، جارێک ئەو خەونەم بۆ مامە سلێمانم گێڕایەوە، لە وەڵامدا پێی وتم، 'ئەوە تەنها ترسە و هیچی تر نییە! ئەو ترسەیە کە دایکت خستویەتیە دڵتەوە و وەکو میراتییەک و دێوەزمەی خەونەکانی خۆی بۆی جێ هێشتویت!'

# ١

گەڕەکی جوولەکان، بە درێژایی تەمەنم لەبەرچاوی مندا گەڕەکێکی بچووک و داخراو بووە، سالانی سەردەمی منداڵیم و دواتر کاتێک کە لاو بووم، بەردەوام بە ڕۆژی نیوەڕۆ و بە چاوی کراوەوە خەونم بە بەزاندنی سنووری ئەو گەڕەکەوە دەبینی، ئەو سنوورەی کە ترس و دوودڵی لەو گەڕەکەدا بەدەوری ئێمەی جوودا کێشابوویان.

باش لەبیرمە، کاتێک تەمەنم شەش سالان بوو، ڕۆژانە دەچوومە سەربانی ماڵەکەمان و لەوێوە لە منداڵانی گەڕەکەکانی چوارباخ و سەرشەقامم دەڕوانی، لە دوورەوە دوو منداڵی ڕووتەڵەم لە نێویاندا دەستنیشان کردبوو، کە ڕانکوچۆغەیان لەبەردا بوو، نازانم بۆچی هەمیشە چاوم لەسەر ئەو دووانە بوو، پێم وا بێت تەنها لەبەر ئەوە بووبێت، کە ئەو دوو منداڵە لە هەموو ئەوانی تر بزێوتر بوون، لە خەیاڵی خۆمدا ناوی ئەحە و خولەم لێ نابوون، بە خەیاڵ بەردەوام بە دوایانەوە بووم و بە ناوی خۆمەوە بانگیان دەکردم و پێکەوە یاریمان دەکرد، چنگ و گیرفانی شەرواڵەکانمان پڕ بوون لە بەرد، هەموو ڕۆژێک شەڕەبەردمان لەگەڵ منداڵانی گەڕەکەکانی تردا دەکرد، پێکەوە بەردمان دەگرتە هەموو غەریبێک، یان پەلەوەر و گیاندارێک، کە ڕێگای لێ هەڵە ببووایە و بەو ناوەدا تێپەڕیبایە، لەبیرم دێت ئەو دوو ناوەم لە دەمی باوکمەوە وەر گرتبوو، ئەوسا باوکم دەیوت: منداڵی کوردە موالییەکان زۆربەیان ئەحە یان

خولەیان ناوە. لە کۆتا مانگی هاوینی ئەو ساڵەدا، کاتێک لەگەڵ مامە سلێمانم چووم بۆ دەشت، بینیم لەناو پەڵەگەنمەکەیدا دوو داهۆڵی داکوتابوو، مامە سلێمان وتی، 'ئەو داهۆڵانە پاسەوانن، بۆ ئەوەی پەلەوەرەکان بترسێنن و گەنمەکە نەخۆن.'

چەند هەفتەیەک دوای ئەو ڕۆژە، درووێنە دەستی پێ کرد و بەهەرەوەزی گەنمەکەیان دوورییەوە، منیش دوو داهۆڵەکەم لەگەڵ خۆمدا بۆ ماڵەوە هێنایەوە، جلەکانیانم گۆڕی و لە ژوورێکدا و لە شانی یەکەوە دامنان، بەردەوام لەو ژوورەدا بەتەنیا بووم و یاریم لەگەڵ داهۆڵەکاندا دەکرد و لەگەڵیاندا دەدوام، لە خەیاڵی خۆمدا ناوی ئەحە و خولەم لە داهۆڵەکان نابوو، لەو ڕۆژانـەدا، کاتێک لەگەڵ ئەحە و خولەی هاوڕێم سەرقاڵی یاریکردن بووم، بێئاگا بووم لەوەی دایکم و باوکم لەناو 'دەرگای ژوورەکەدا وەستاون و لێم دەڕوانن، بە مەزەندەی ئەوان من منداڵێکی نوقسانم و لەگەڵ خێو و جنۆکەدا قسە دەکەم، ئەو ڕۆژە باوکم بەتووڕەیییەوە پشتەملی ئەحە و خولەی هاوڕێمی گرت و دوای ئـەوەی جلەکانی لەبەر داکەندن، هەموو ئازای گیانیانی بە پێلەقە تێک شکاند و بێڕەحمانە چوارپەلیانی کرد بە قوڕگی زۆپاکەماندا، ئێوارەی ئەو ڕۆژە دایکم و باوکم بۆ کنێسەت پێش خۆیان دام و تەسلیمی حاخامیان کردم، پێکەوە باسی ئەوەیان بۆ حاخام دەگێڕایەوە، کە چۆن من بەتەنیا لە ژوورێکدا دادەنیشم و لەبەرخۆمەوە قسە لەگەڵ دوو پارچە داردا دەکەم، دایکم بەدەم گریان و نزاکردنەوە بە حاخامی وت، 'جنۆکە چۆتە ناو جەستەی کوڕەکەمەوە!'

لـەدوای ئـەو ڕۆژەوە، هـەموو ڕۆژێـک بەیانیی زوو پێش خۆرکەوتن دایکم دەیبردم بۆ کنێسـەتەکە و بەتەنیا لە سووچێکدا دای دەنام، جاجمێکی ڕەشوسپیی بەسەردا دەدام و منیش لەترساندا

توند لچکی جاجمەکەم دەگرت و لەبەرخۆمەوە بەردەوام ئەو نزایەم دەخوێند، کە حاخام فێری کردبووم، لە دوورەوە بێدەنگ و بە لاچاو لەو منداڵانەم دەڕوانی، کە ڕۆژانە لە کنێسەتەکە وانەیان دەخوێند، لەبیرم دێت حاخام چەند جارێک بە خوێندکارەکانی وت، 'کەس توخنی ئەو بەڵایە نەکەوێت!'

چەند مانگێکم بەو جۆرە تێپەڕاند، ڕۆژێکیان دایکم لە تەشتێک ئاوی شلەتێندا بە سابوونی ڕەقی شۆردمی و ڕانکوچۆغەیەکی نوێی لەبەر کردم، دایکم پێی وا بوو جنۆکەکان جەستەی منیان جێ هێشتووە و ئیتر کاتی ئەوە هاتووە لە کنێسەت تێکەڵاوی منداڵەکانی تر ببم و وانەیان لەگەڵدا بخوێنم، لەدوای ئەو ڕۆژەوە نەموێرا بچمە سەربانی ماڵەکەمان، تاکو بووم بە هەرزەکار و تەمەنی باڵقبوونیشم تێپەڕاند، نەموێرا لە منداڵانی گەڕەکەکانی تر بڕوانم، تەنانەت ئەحە و خولەی هاوڕێشم لە خانەی نێو خەیاڵەکانمدا سڕییەوە و جارێکی تر بیرم لێ نەکردنەوە و ئیدی چاوم بۆ نەگێڕان.

## ٢

'کورگەل گیان، لە بازاڕ لێم دوور نەکەونەوە با لێم ون نەبن.' مامە سلێمانم کاتێک ئەمەی بە من و یاقووبی کوڕی وت، پێکەوە گەیشتبووینە سەر شیوەکەی قازی و بۆ بازاڕ بەڕێوە بووین، ئەو ڕۆژە بردینی تاکو پێڵاومان بۆ بکڕێت، منیش لەو کاتەدا دەستم بۆ چەند منداڵێکی هاوتەمەنی خۆم ڕاکێشا و وتم، 'ئەرێ مامە سلێمان ونبوونی چی، ئەوە نییە منداڵانی هاوتەمەنی ئێمە بۆ خۆیان بەتەنیا لە بازاڕن؟'

'ئاخر ڕۆڵەکەم ئێوە جیاوازن!' دوای ئەوەی مامە سلێمانم ئەمەی وت، بەدەم ڕێگاوە بەسەرنجەوە لە هەموو کەسێکم دەڕوانی، بەتایبەتی لەو منداڵانەی لە ڕێگا بینیمن، ڕوخسار و جلەکانیانم لەگەڵ خۆم و یاقووبی ئامۆزامدا بەراود دەکرد و بەردەوام لەبەرخۆمەوە دەموت، 'ئەرێ کام جیاوازی!'

ئەو ڕۆژە یەکەم جارم بوو لە سنووری گەڕەکی جوولەکان بچمە دەرەوە، نازانم چەندی پێ چوو تاوەکو لە مەبەستی ئەو قسەیەی مامە سلێمانم تێگەیشتم، هەرچەندە تا ئەمڕۆش لە خەیاڵی خۆمدا بەردەوام ئەو پرسیارە لە خۆم دەکەم، 'ئایا بۆچی بە مەزەندەی مامە سلێمانم ئێمەی منداڵانی جوو جیاواز بووین لە منداڵەکانی تری ئەو شارە؟'

پاشان لە تەمەنی شەش ساڵیمەوە هەموو دوانیوەڕوانێک باوکم لەگەڵ خۆیدا بۆ سەر دوکانەکەی دەیبردم، کە لە قەیسەریی نەقیب

بوو، دەتوانم بڵێم چەندین ساڵ ئەو قسەیەی مامە سلێمان تەواوی خەیاڵی منی داگیر کردبوو، بەردەوام لە بیرکردنەوە و گەڕاندا بووم بەدوای ئەو جیاوازییەی ئەو باسی لێوە دەکرد، بەڵام بە چاو و زهنی سەردەمی منداڵیم هیچ جیاوازییەکم لەنێوان خۆم و منداڵانی تری ئەو شارەدا نەدەبینی.

باوکم لە گۆشەی پشتەوەی دوکانەکەی سندووقێکی داری بۆ دانابووم و دەبووایە زۆر بەوریاییەوە ئاگاداری کڕین و فرۆشتنەکانی ئەو بوومایە، هەموو ڕۆژێک پێی دەوتم، 'ئێرە بۆ تۆ جێگای فێربوونە و ئیشی تۆ تەنها ئەمەیە: دانیشە و بڕوانە و گوێ بگرە، فێر بە، فێر، فێری کار و کاسپی ببە!'

ئێوارانیش کاتێک بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتین، لێی دەپرسیم، 'ئادەی پێم بڵێ گوێ ڕووت، ئەمڕۆ چی لە کار و کاسپی فێر بوویت؟'

بە درێژایی ئەو چەند کاتژمێرە لە ترسی باوکم نەم دەوێرا لە جێگای خۆم بجووڵێم، ئەوەندە قنج و قیت لەسەر ئەو سندوقە دارە ڕەقە دانیشتبووم، ئێواران کاتێک دوکانەکەمان دادەخست و بەرەو ماڵەوە دەچووین، بەگێرەگێر دەڕۆیشتم، پاشان باوکم زەمیلەیەکی حەسیری قورسی پێ هەڵدەگرتم و دەستی دەکرد بە ئامۆژگاریکردنم، ئینجا تاکو دەگەیشتینەوە ماڵەوە پرسیاری ژمێریاریی لێ دەکردم، کاتێک وەڵامەکەم دوا دەکەوت، لەپی دەستی بەتوندی دەکێشا بە بناگوێمدا، ئەگەر هەر نەمزانیایە، ئەوا بە نووکی کڵاشەکەی شەقێکی توندی تێ هەڵدەدام.

زیاتر لە دوو ساڵم بەو جۆرە گوزەراند، ئێوارەیەک مامە سلێمان هات بۆ لای باوکم و پێی وت، 'تورکەکان ئاگادارییان پێ داوین و پێویستە لەسەرمان منداڵەکانمان بۆ قوتابخانەی ڕوشدییەی سەربازی بنێرین!'

کاتێک مامە سلێمان ئەمەی بە باوکم وت، مانگی ئابی ساڵی ١٩٠٨ بوو، پاشان بە درێژایی ئەو هاوینە باوکم ناڕازی و تووڕە دیار بوو، دەمزانی بەوە ڕازی نییە من بچم لە دەرەوەی کنێسەت و لە قوتابخانەیەکی هاوشێوەی ڕوشدییەی سەربازی بخوێنم، بەڵام باوکم ئەوسا نەیدەتوانی دواکاریی حاخام و مامە سلێمان پشتگوێ بخات، هەر وەکو مامە سلێمانم دەیوت، 'هیچ دەسەڵاتمان نییە و لەلایەن کاربەدەستانی سەربازیی تورکەوە ئەو داوایەمان لێ کراوە، پێویستە لەسەر ئێمەی جوو منداڵەکانمان بۆ قوتابخانەی ڕوشدییە بنێرین.'

دوای ئەوەی دانیشتووانی گەڕەک ئەو فەرمانەی تورکەکانیان لە کنێسەت تاووتوێ کردبوو، پێکەوە بڕیاری ئەوەیان دابوو، شەش منداڵی تەمەن حەوت بۆ هەشت ساڵان بەناچاری بۆ قوتابخانەی تورکەکان بنێرن.

باوکم دەیوت، 'خوێندن لەو مەکتەبە بۆ ئێمەی جوولەکە و مەسیحی و تەنانەت بۆ کوردە موالییەکانیش زۆر زەرەرە، تورک بەو جۆرە زمان و کولتووری ئێمە دەسڕێتەوە و منداڵەکانمان لەدەست دەر دێنێت و لە مەکتەبێکی حەربیی لەو جۆرەدا بۆ مەرامی خۆی پەروەردەیان دەکات!'

باوکم تاوەکو مردیش بە کوردە موسوڵمانەکانی دەوت، 'کوردە موالییەکان!'

یەکەم ڕۆژی چوونم بۆ قوتابخانەی ڕوشدییە باش لەبیرە، لە حەوشەکە تێکەڵاوی کۆمەڵێک قوتابیی تریان کردین، ئێمە شەش منداڵی جوو بووین، دوای ئەوەی کۆمەڵێک قوتابیی بەتەمەن لە ئێمە گەورەتر چەند سروودێکی تورکییان بە کۆرس خوێند، ئاڵای عوسمانی و بە قسەی قوتابییەکان بێت ئاڵای ئیسلامیان هەڵکرد،

وەکو چۆن هەموو منداڵێکی کوردی موسوڵمان لە ماڵەوە ئاوا فێر کرابوو.

پۆلەکەی ئێمە سیودوو قوتابی بووین، هەموو بێدەنگ و وشک وەستابووین و زیتەی چاومان دەهات و لە قوتابییە گەورەکان و مامۆستاکانمان دەڕوانی، چەند پۆلیسێکیش لەولاوە بە تفەنگی درێژەوە ڕاوەستابوون، لە سەرەتاوە هیچکام لە قوتابییە جووەکان تورکیمان نەدەزانی، ئەو مامۆستایانەی وانەیان بە زمانی تورکی پێ دەوتینەوە، هەموو ڕۆژێک لەسەر نەزانینمان سزایان دەداین، هەروەها هاوپۆلەکانمان جنێویان پێ دەداین و بە تەمبەڵ و نەزان بانگیان دەکردین، ساڵی یەکەمی خوێندنمان بە هیچ جۆرێک پەیوەندیمان لەگەڵ هاوپۆلەکانماندا نەبوو، ئیتر ئێمە و ئەوانیش لە ماڵەوە ئاوا پەروەردە کرابووین، باوکم زوو زوو پێی دەوتم، 'لە مەکتەب ئاگات لە خۆت بێت و هەوڵ بدە تێکەڵی منداڵی بێگانەکان نەبیت!'

لە ڕاستیدا لە سەرەتاوە دەترسام و ئاگام لە وانەکان نەبوو، نەمدەوێرا هەنگاوێک لە سیمانە سەعادەت و خامێی موشێی عەتار دوور بکەومەوە، کاتێکیش دەچوون دەست بە ئاو بگەیەنن، دەچووم لە تەنیشتیانەوە ڕادەوەستام.

لە دوای قوتابخانە بەغاردان بەلای گەڕەکی سەرشەقام و چوارباخدا تێدەپەڕین، بەردەوام منداڵانی ئەو دوو گەڕەکە بەردیان تێدەگرتین و تاکو سنووری گەڕەکی جوولەکان دوامان دەکەوتن، پاشان ئێمەش چنگمان پڕ دەکرد لە بەرد و شەڕەبەرد تاکو دەمەو ئێوارە درێژەی دەکێشا، تاکو دەگەشتە ئەوەی زۆربەی ژن و پیاوی گەڕەکیش بەشدارییان دەکرد.

لە قوتابخانەی ڕوشدییە، ساڵی یەکەممان بە بێدەنگی و

دوورەپەرێزی تێپەڕاند، ساڵی دووەم خامێی موشێی عەتار نەهاتەوە و وازی لە قوتابخانە هێنا، ڕۆژانە لەگەڵ باوکیدا دەچوو بۆ قەیسەریی نەقیب و ئیشی عەتاریی دەکرد، لەسەر ئەوەی کوڕەکەی وازی لە قوتابخانە هێنابوو، موشێی عەتار چەند جارێک بانگ کرا بۆ مەخفەرەکەی سەرشەقام و لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرا، پاشان باوکم وتی، 'تورکەکان دوو لیرەی زێر سەرانەیان لە موشێ سەندووە!'

لە قوتابخانەی ڕوشدییە و ڕۆژی یەکەمی ساڵی دووەمی خوێندنم، کاتێک هەموو چووین بۆ پۆلەکەمان، قوتابییەکان دوو دوو چوون و ڕەحلەیەکیان گرت و بێدەنگ پێکەوە دانیشتن، من بەتەنیا مامەوە و لە دوورەوە چەند جارێک لە مامۆستاکەم ڕوانی، چونکە ساڵی پێشوو لەگەڵ خامێی مۆشێی عەتار لەسەر ڕەحلەیەک دانیشتبووین، ئەوە بوو خامێ وازی لە قوتابخانە هێنا و منیش ساڵی دووەم بەتەنیا مامەوە، کاتێک مامۆستاکە ئاماژەی بە ڕەحلەیەکی بەتاڵ کرد، چووم لە تەنیشتی ڕەحلە بەتاڵەکەوە ڕاوەستام، کوڕێکی سپیکەلانەی باریکەلە بەرامبەرم وەستابوو، بەردەوام لە یەکتریمان دەڕوانی، نەموێرا دانیشم و دیار بوو ئەویش هەمان هەستی هەبوو، لەو کاتەدا مامۆستاکە هات و دەستێکی خستە سەر شانی من و وتی، 'دانیشن دەی، پێکەوە دانیشن.'

من خێرا بەترسولەرزێکەوە گوێڕایەڵی بووم و دانیشتم، کوڕەکە هێشتا بەپێوە وەستابوو، بە هەردوو دەستی توند قەراغی ڕەحلەکەی گرتبوو، بەردەوام بەتووڕەییەوە لە منی ئەڕوانی، مامۆستاکە چەند جارێک داوای لێ کرد دانیشێت، بەڵام ئەو کوڕە، وەکو ئەوەی شەختەڵان بێت و خوێنی بەستبێتی، نەیدەتوانی لە تەنیشتی منەوە دانیشێت، کاتێک مامۆستاکە چوو بۆ لای، زۆر بەناڕەحەت توانیی

دەستی لە قەراغی ڕەحلەکە بکاتەوە، ناچار بوو گوێی گرت و بە دەستەکەی تری دوو شەپازلەی توندی کێشا بە بناملیدا و بەزۆر لە تەنیشتی منەوە دای نا، منیش بە لاچاو لێم دەڕوانی، تەواوی جەستەی دەلەرزی و فرمێسک بە چاویدا دەهاتنە خوار، مامۆستاکە گەڕایەوە لای تەختەڕەشەکە و بێدەنگ بەرامبەرمان ڕاوەستا، ڕوانیم قوتابییەکانی تر هەموو لە منیان دەڕوانی، منیش لەو کاتەدا خۆم پێ ڕانەگیرا و دەستم کرد بە گریان، لە خەیاڵی خۆمدا وتم، 'بە هۆی منەوە ئەو کوڕە داماوە لێدانی خوارد!'

دوای ئەوە مامۆستاکە یەک یەک ناوی خوێندینەوە، ئێمەیش هەڵدەستاینە سەر پێ و بەڵێمان بۆ دەکرد و لە جێگای خۆمان دادەنیشتینەوە، مامۆستاکە دوای ناوی من، ناوی فوئاد مەعرووفی خوێندەوە، قوتابییەکەی تەنیشتم بەترسولەرزێکەوە هەستایە سەر پێ، هەستم پێ کرد، کە زۆری لە خۆی دەکرد تاکو بەڵێ بۆ مامۆستاکە بکات، سەری داخستبوو لە بەرپێی خۆی دەڕوانی، بەبێزارییەکەوە سەری هەڵبڕی و لە مامۆستاکەی ڕوانی و پاشان لەژێر لێوەوە و بە نووزەنووزێک وتی، 'بەڵێ.'

لەدوای ئەو ڕۆژەوە و تاکو کۆتایی ئەو ساڵە لەگەڵ قوتابییەکەی تەنیشتم، کە ناوی فوئاد مەعرووف بوو یەکتریمان نەدواند.

کاتێک لە ماڵەوە ئەو بەسەرهاتەم بۆ دایکم گێڕایەوە، ئەو بەدەم گریان و نزاخوێندنەوە پێی وتم، 'نەخەڵەتابیت و توخنی ئەو کوڕە نەکەویت!'

زۆربەی ئەو ڕۆژانەم باش لەبیرە، کاتێک لەگەڵ فوئاد مەعرووف لە تەنیشتی یەکەوە دانیشتبووین، ئەوەی لەو ساتانەدا بە خەیاڵمدا گوزەری دەکرد، ئەوە بوو، کە بەردەوام بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ چی ڕوو دەدات ئەگەر شانم بەر شانی ئەو کوڕە موسوڵمانە

بکەوێت، وا بزانم چەندین جار ئەوەم تاقی کردەوە و شانم بە شانی فوئاد مەعرووفەوە دەنووساند، ئەو کردەوەیەم بەنهێنی لە دڵی خۆمدا هێشتەوە و لای کەس باسم نەکرد، هەستم بەوە کردبوو، کە فوئاد مەعرووف زۆر خۆی لە من دەپاراست و بگرە لێم دەترسا، لە کاتێکدا دەمویست لە نهێنیی جیاوازیی نێوان ئێمە و ئەوانی موسوڵمان تێبگەم، دایکم هەموو ڕۆژێک پێش خۆرکەوتن لە خەو هەڵی دەساندم، پێش ئەوەی بڕۆم بۆ قوتابخانە بەدەم گریانەوە تاوێک نزای بەسەردا دەخوێندم، پاشان پرچی بۆ لوول دەکردم و کاپلاکەی لەسەر دەکردم.

ئەو ڕۆژەم باش لەبیرە، پێم وا بێت لە کۆتاییی ساڵی دووەمی خوێندنماندا بوو، دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بەتەنیا لە قوتابخانە مابوومەوە و هاوڕێکانم هەموویان گەڕابوونەوە بۆ گەڕەکی جوولەکان، منیش هەرچیم دەکرد نەمدەوێرا بەتەنیا سەر لە قوتابخانەی ڕوشدییە بێنمە دەرەوە، نازانم چۆن ئەوە هات بە خەیاڵمدا، چووم بۆ لای ئەو مامۆستایەی زمانی تورکیی پێ دەوتینەوە، هەرچەندە لە وانەکەی ئەودا زۆر خراپ بووم، بەڵام خاتری زۆر دەویستم و مرۆڤێکی زۆر لەسەرخۆ بوو، کاتێک گەیشتمە ژووری مامۆستایان، بینیم فوئاد مەعرووف لەوێ دانیشتبوو، مامۆستای زمانی تورکی قسەی بۆ دەکرد، ویستم بگەڕێمە دواوە، لەو کاتەدا مامۆستاکە سەری هەڵبڕی و بانگی کردم، خێرا چووم وەکو سەرباز قاچێکم دا بە عەرزدا و سڵاوێکم لێ کرد، داوای لێ کردم لەلای فوئادەوە دانیشم، پێش ئەوەی قسە لەگەڵ مندا بکات، لە فوئاد مەعرووفی ڕوانی و پێی وت، 'لە ماڵی خۆمان چاوەڕوانتانم.'

دوای ئەوە چاوی لەسەر فوئاد مەعرووف گوێزایەوە و لە منی ڕوانی و لێی پرسیم، 'خێرە کوڕە، ئادەی بزانم!'

بە جۆرێک ئەمەی لێ پرسیم و لێی ڕوانیم، لە ترساندا لەبیرم چوویەوە بۆ چیی چووبووم، هەرچەند زۆرم لە خۆم کرد نەمتوانی دەمم بکەمەوە، فوئاد مەعرووف هەستایە سەر پێ و خواحافیزیی لە مامۆستاکە کرد و لە ژوورەکە چووە دەرەوە.

کاتێک دەستی خستە سەر شانم، تاوێک هێواش بوومەوە و لەژێر لێوەوە و بەترسەوە پێم وت، 'ناوێرم بەتەنیا بۆ گەڕەکی جوولەکان بڕۆمەوە.'

لەگەڵ ئەمەم پێ وت، هەستایە سەر پێ و دەستی گرتم و بەدوای خۆیدا بۆ ناو ڕاڕەوی قوتابخانەکە ڕای کێشام، لەبەر خۆیەوە چەند جارێک بانگی لە فوئاد مەعرووف کرد، ئەوەندەم نەزانی فوئاد لەبەردەمماندا پەیدا بوو، مامۆستاکە بە فوئادی وت، 'لەگەڵ خایم بۆ گەڕەکی جوولەکان بچۆ، تاوەکو بەردەرگای ماڵی خۆیان دەستی لێ بەر نەیەیت.'

## ٣

'ئەوەی لە مشک بووبێت جەواڵ دەدڕێت!'

کاتێک باوکم ئەمەی وت، من لە وەڵامدا پێم وت، 'مەرج نییە حەمەجان لە حاجی سەلیمی باوکی بچێت!'

حەمەجان، کوڕی حاجی سەلیم پێنجوێنی، دراوسێی دوکانمان بوو، باوکمان نێزیکەی دە ساڵ دەبوو درواسێی دوکان بوون، قسەیان لەگەڵ یەکتری نەدەکرد و بەردەوام دژایەتیی یەکترییان دەکرد، کاتێک من و حەمەجانی سەلیم بەتەنیا لەسەر دوکانەکانی باوکمان دەماینەوە و چاوی ئەوانمان لێوە دیار نەدەبوو، پێکەوە دادەنیشتین و بە زمانی عەرەبی کتێبمان دەخوێندەوە، ئەگەر کتێبی عەرەبیمان دەست نەکەوتایە، حەمەجان بە تورکی کتێبی بۆ دەخوێندمەوە و دێڕ بە دێڕ بە زمانی کوردی یان عەرەبی ماناکەی پێ دەوتم.

باوکمان ئاگاداری پەیوەندیی نێوان ئێمە نەبوون و من و حەمەجان بەنهێنی هاوڕێ و دۆستی یەکترین بووین.

لەو ڕۆژانەدا بەیانییەکیان زوو بەدەم گریان و کڕووزانەوەی دایکمەوە لە خەو ڕاپەڕیم، بینیم دایکم بەرامبەر باوکم هاتبووە سەر چۆک و دەستی بەرەو ڕووی پان کردبووەوە و پێی دەوت، 'لەوەتەی خایمم لێ بووە پیاوچاکێک هەموو شەوێک دێتە خەونم و پێم دەڵێت، خوا ئەو کوڕەی پێ بەخشیویت بۆ ئەوەی لە پاشەڕۆژدا ببێت بە حاخام.'

هەروەها دایکم باسی لەوە دەکرد، گوایا ئەو پیاوچاکە لە خەونیدا پێی وتووە، ئەگەر ئەوان ئەو داواکارییە بەجێ نەهێنن، ئەوا خوا کوڕەکەیان لێ دەسەنێت.

بۆ ئەوەی خەونەکەی دایکم بهێنمە دی، باوکم زۆری لێ کردم تاکو واز لە قوتابخانەی ڕوشدییە بێنم و بچم لە کەرکووک یان لە بەغداد بۆ حاخامی بخوێنم.

ئەو ڕۆژە باوکم ناردمی بۆ لای مامە سلێمانم و چۆن ئامۆژگاریی کردبووم بێ کەم و زیاد پێم وت، مامم لە وەڵامدا وتی، 'کوڕێ گیان، تۆ و حاخامیان نەوتووە! بەڵام مادام باوکت سوورە لەسەر ئەوە و دایکت خەونێکی لەو جۆرەی بینیوە، ئیتر بڕۆ بەختی خۆت تاقی بکەرەوە.'

ئێوارەی ئەو ڕۆژە مامە سلێمانم هات بۆ ماڵی ئێمە و بە باوکمی وت، 'دەزانی ئەگەر کوڕەکەت واز لە مەکتەبی ڕوشدییە بێنێت تۆ لای تورکەکان تووشی چەرمەسەری دەبیت.'

لەو کاتەدا باوکم بەتووڕەیییەوە لە منی ڕوانی و وتی، 'ئێ، سلێمان گیان چی بکەم، کوڕەکە خۆی نایەوێت بخوێنێت، خۆ بەزۆر نایتنێرم بۆ مازوو، ئەگین ئەو نارەسەنە بە دارا هەڵناڕوانێت؟'

'ئیتر خێری پێوە بێت، بەڵام تورکەکان ئەوە نازانن و تووشی سەرئێشەمان دەکەن.'

'ئەگەر مەسەلەکە تەنها بەدەل بێت! ئەوا ڕازیم کوڕەکەم ڕۆژانە لەسەر ئەو شێوە بۆنی گوی شێخ و ئاغاکان هەڵمژێت، لای من لەوە باشترە لە مەکتەبی تورکەکان بخوێنێت، سلێمان گیان مادام بە پارە چارەسەر دەبێت، ئیتر خەمی ناوێت.'

دوای ئەو ڕۆژە باوکم بەنەخۆشی چەند جارێک لەگەڵ مامە سلێمان چوو بۆ سەرا و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا کرد، پاشان وەک

بەدەل بۆ وازهێنانی من لە قوتابخانەی ڕوشدییە، دوو لیرەی زێڕی بە تورکەکان دابوو.

ئەو شەش منداڵە جووەی پێکەوە بۆ قوتابخانەی ڕوشدییەی سەربازی چووبووین، چوارمان وازمان لەو قوتابخانەیە هێنا، شیمۆن شاول و حایم عەزرا، ئەو دوو هاوتەمەنەی ئێمە لە خوێندن بەردەوام بوون و دوای قوتابخانەی ڕوشدییەی سلێمانی چوون بۆ بەغداد و پاشان لەوێوە بۆ ئەستەمبوڵ نێردران، ئەوانیش وەکو سەدان گەنجی تری شاری سلێمانی لە ڕیزی سوپای عوسمانیدا بوون بە ئەفسەر. فوئاد مەعرووف و چەند هاوپۆلێکی ترم سالانی دوایی بە جلی ئەفسەرییەوە لە سلێمانی بینییەوە، لەو ڕۆژانەدا ئەو گەنجانەی بوون بە ئەفسەر و ئەو خەڵکانەی سەردانی ئەستەنبوڵیان دەکرد و پاشان گەڕانەوە، بە جۆرێک باسیان لە شاری ئەستەمبوڵ دەکرد، کە خوایش بۆ خۆی لە کتێبە پیرۆزەکانیدا بەو چەشنە گوزارشتی لە بەهەشت نەکردبوو، ئیتر لەناو خەڵکی شاردا تەنها باس باسی چوون بۆ ئەستەنبوڵ بوو، شێخ و مەلا و واعیزەکان بە پایتەختی خەلافەتیان ناو دەبرد و لەوێوە بە چوونیان بۆ حەج خەلات دەکران، بازرگانەکان پارە و موڵکیان لەپێناودا دەدا، گەلێک کەسیش لەو پێناوەدا نۆکەرییان بۆ تورکەکان دەکرد، لاوەکانیش بەردەوام خەونیان بە قولی ڕووت و چاوی گەشی کچ و ژنە تورکەکانەوە دەبینی، منیش سالانێک ئەو نەخۆشییەم گرتبوو، بەتایبەتی ئەو دوو ساڵەی لە قوتابخانەی ڕوشدییە بووم.

دوای ئەوەی لە قوتابخانەی ڕوشدییە وازم هێنا، ئیتر لەدوای ئەو ڕۆژەوە باوکم تەواو ڕەوشتی لەگەڵمدا گۆڕا و بە زمانێکی تر قسەی لەگەڵدا دەکردم، دایکم لەخۆشییاندا چەندین شانامەی بۆ هۆنیبوومەوە و لەبەرخۆیەوە بەردەوام دەیوتنەوە، بە جۆرێک

قسەکانی باوکم و دایکم کاریگەرییان لەسەر خەیاڵم هەبوو، بەبێ ئەوەی هیچی لێ تێبگەم شەو و ڕۆژ خەریکی خوێندنەوەی تەلمود بووم، شەوانە خەوم لێ نەدەکەوت و بە ڕۆژیشدا وەکو حاخامێکی بچکۆلە ڕەفتارم دەکرد.

پاشان دایکم بەو هاوینە گەرمە زۆری لە باوکم کرد، فەخریی عارەبانەچیی بۆ بەکرێ گرتین و بەرەو ئەلقوش بۆ سەر گۆڕی پێغەمبەر ناحوم کەوتینە ڕێ، بە هەردووکیان چەند دێڕێک نزایان پێ لەبەر کردم، بۆ ئەوەی لەسەر گۆڕەکەی ناحوم چەند جارێک لەبەرخۆمەوە بیڵێمەوە، تاکو ئەو پیاوچاکە ڕێگای بەرەو حاخامبوونم بۆ ئاسان بکات.

لە کۆیە چووینە ماڵی شومر ناوێک، دایکم دەیوت، 'جووەکانی کۆیە هەموویان خزمی خۆمانن!'

بە درێژاییی ئەو شەوە خاوەنماڵ نەیهێشت پشوو بدەین و تاوێک بخەوین، بەدیارمانەوە دانیشتبوو باسی ئازایەتیی خۆیی بۆ دەکردین، کە چۆن لە سەردەمی لاوێتیدا بە پێ لە کۆیەوە تاکو فەلەستین چووبوو، ڕۆژی دوای ئەو شەوە بەیانیی زوو بەماندوێتی بەرەو هەولێر بەڕێ کەوتین، بە درێژاییی ڕێگای نێوان کۆیە و هەولێر من نوستبووم و ئاگام لە هیچ نەبوو، کاتێک دایکم لە خەو بە ئاگای هێنام، لە ناوشاری هەولێر نزیک بووبووینەوە و قەڵامان لێوە دیار بوو، بەرەو قەڵا بەڕێوە بووین، لەناکاو چەند کەسێکی خەنجەر و کوتەک بەدەستمان لێ پەیدا بوو، کاتێک بە سەر و پرچی مندا لایان ئاشکرا بوو ئێمە جوولەکەین، پێش خۆیان داین و بەرەو ناو قەڵا بردینیان، بەدەم ڕێگاوە چەند جارێک پیاوەکان کەوتنە هەڕەشەکردن و زوو زوو دارەکانی دەستیان تێوە دەژەندین، چەند جارێک ویستم قسەیان لەگەڵدا بکەم، ڕێیان پێ نەدام و هەڕەشەی

ئەوەیان لێ دەکردم، ئەگەر یەک جاری تر وشەیەک لە دەمم بێتە دەرەوە دەمکوژن، یەکێکیان وتی، 'ئەنگۆ جوولەکەن و لەو ڕۆژە موبارەکەی مەولودی پێغەمبەری لۆتان نییە سەرتان لە ماریّ بیننە دەریّ!'

من و دایکم و فەخریی عارەبانەچی لە مەبەستی پیاوەکان تێنەگەیشتین و ئەوانیش نەیان هێشت پرسیاریان لێ بکەین، دایکم بەردەوام لەبەرخۆیەوە نزای دەکرد و دۆعای ئەوەی لە پیاوەکان دەکرد، کە خوا تاعوون بۆ چاک و خراپیان بنێرێت.

گەیشتینە ناو قەلا و لە دوورەوە بینیم بەردەمی مزگەوتەکە خەڵکێکی زۆری لێ ڕاوەستابوو، لەسەر شۆستەی سەر حەوزی مزگەوتەکە دوو پیاو کەسێکیان باڵبەست کردبوو، مەلایەک و چەند فەقێیەک بەدیاریانەوە وەستابوون و زیاتر لە پەنجا کەسێکیش دەورەیان لێ دابوون و لێیان دەڕوانین، ئەو پیاوانەی ئێمەیان بۆ ناو قەلا هێنابوو، بە پاڵنان بردینیان بۆ بەردەمی ئەو شۆستەیەی خەڵکەکە بە چواردەوریدا وەستابوون، پاشان بۆ سەر شۆستەکە و بەردەمی مەلاکە چووین، یەکێک لەو پیاوانەی لەگەڵ ئێمە بوو وتی، 'قوربان ئەمانەیش جوولەکەن.'

لەگەڵ کابرا ئەمەی وت، مەلاکە، کە کابرایەکی لاوازی گەنمڕەنگی بالاکورت بوو، چاوێکی کوێر و لووتی زل بوو، لێمان هاتە پێشەوە، 'چما ئەنگۆ ڕۆژەکتان نەدیتیتەوە بێنە کنمان لەوڕۆ زیاتر کە ڕۆژی مەولودی موبارەکی پێغەمبەری ئاخیری زەمانە، ئەدی پێمان نەگۆتن ئەوڕۆ لە ماری خۆتان نەیەنە دەریّ، ئەدی نازانن لەو ڕۆژە پیرۆزەیدا ئەمە حەز ناکەین چرۆچاو و ڕەزاقورسی وەکی ئەنگۆ ببینین؟'

لەو کاتەدا لە من هاتبووە پێشەوە و زوو زوو تف لە بەینی لێوە

وشكهەڵاتووەكانیەوە دەر دەپەڕی و دەیدا بە ڕوومدا، منیش خێرا وەڵامم دایەوە، 'قوربان ئێمە خەڵكی سلێمانین و ئەوەی جەنابت دەفەرموویت لێی بێئاگاین.'

لەگەڵ من ئەمەم وت، هاتە سەر نووكی پێكانی و خۆی هەڵبڕی و دەستی لێ داهێنامەوە، بەتووڕەییەوە وتی، 'ئەنگۆ خودا سەری لێ شێواندینە و لە ڕاستییەكان بێئاگان، ئەگەر لە ڕاستییەكان بەئاگا بوونایە... ئەبوونە موسرمان!'

لەو كاتەدا لەولای ئێمەوە كابرای باڵبەستراویان خستە حەوزەكە و سێ جار لە ئاویان هەڵكێشا، دوو پیاو بەسەریەوە ڕاوەستابوون و زوو زوو بە دارەكانی دەستیان لێیان دەدا، پاشان دایكمیان لە ئێمە جیا كردەوە، دووان لە فەقێكان من و فەخریی عارەبانەچییان برد بۆ لای حەوزەكە، لەسەر لێواری حەوزەكە وەستابووین و لە كابرای باڵبەستراومان دەڕوانی، یەكێك لە داربەدەستەكان ڕووی كردە مەلای كوێرە و وتی، 'قوربان ئەو جوولەكە كافرە شایەدمان نایینیتن؟'

'بیبەن، بیبەن فڕێی بدەنە ئەو تەویلەیە.'

دوای ئەوەی مەلاكە ئەمەی وت، كابرای باڵبەستراویان لە حەوزەكە هێنایە دەرەوە و قۆڵیان گرت و بەڕاكێشان بەرەو دەرگایەكی دارینی ماڵێكی تەنیشتی مزگەوتەكە بردیان، دیار بوو كابرای باڵبەستراو نەیدەتوانی بە پێی خۆی بڕوات، بەسەرنجەوە لێم دەڕوانی و نازانم لەو كاتەدا بیرم لە چی دەكردەوە، لەناكاودا یەكێك لە فەقێكان پاڵێكی پێوە نام، نووكی پێڵاوەكانم لە قەراغی حەوزەكە هەڵكەوت و بەدەما كەتمە ناو ئاوەكە، كاتێك بەپەلەقاژێ خۆم ڕاست كردەوە و هەڵسامە سەر پێ، ڕوانیم بە دوو فەقێ پاڵیان بە فەخریی عارەبانەچییەوە دەنا، تاكو ئەویش وەكو من

بخەنە ناو حەوزەکەوە، نەمدەزانی هۆکار چییە و بۆچی دەمانخەنە ئەو حەوزە، فەخری بەرەنگاریی فەقێکان بوویەوە و لەبەر خۆیەوە دەیوت، 'کوڕە من موسوڵمانم ماڵتان بە قوڕ گیرێت!'

فەقێکان کۆڵیان لێ نەدا و خۆیان بە شان و ملی فەخریدا هەڵواسیبوو، ئەوەندەم زانی فەخری لەگەڵ دوو فەقێکەدا بازیان دایە ناو حەوزەکە، فەخری هەردوو فەقێکەی وەکو پارچە پەڕۆیەکی تەڕ زوو زوو لە حەوزەکە هەڵکێشا و لەبەرخۆیەوە پێی وتن، 'گوڕە سەگبابینە ئێوە بێدینن، ئادەی باوەحیزینە شایەتومانم بۆ بێنن!'

لەو کاتەدا دوو کابرا داربەدەستەکە و چوار پیاوی تر پەیدا بوون و پەلاماری فەخرییان دا و لە حەوزەکە دەریان هێنا و باڵبەستیان کرد و لەگەڵ خۆیان بردیان، منیش بەتەنیا لەناو حەوزەکەدا بە پێوە وەستابووم و لە مەلاکەم دەڕوانی. پاشان یەکێک لە پیاوە داربەدەستەکان گەڕایەوە و لە دوورەوە هاواری لە مەلاکە کرد، 'دەی قوربان ئەوەیان چ لێ بکەین؟ بەخودای بە سەر و فەساری ڕا دیارە کوڕە جوولەکە بێتن.'

دایکم چووبووە بەردەمی مەلاکە و لێی دەپاڕایەوە، پاشان چەند پیاوێکی داربەدەست هاتن و چواردەوری حەوزەکەیان گرت، یەکێک لە داربەستەکان زوو زوو دارەکەی دەستی لێ ڕادەوەشاندم، منیش لە ترساندا زوو زوو دەستم بە دەموچاومەوە دەگرت، پاشان پیاوە داربەدەستەکان قاقا پێدەکەنین، خەڵکەکەش هاواریان لێ دەکردم و بەکۆرس دەیانوت، 'جەبان، جەبان.'

مەلاکە هاتە پێشەوە و پێی وتن، 'گوناحتان دەگاتێ، مندارە و عەزییەتی مەدەن، لەبەر خاتری ڕەحمی خودای و ئەو پیرێژنەی داکی وازی لێ بینن و با شایەدمان بینیتن و ئیدی مەرەخەسی بکەن و با کەس توخنی نەکەوی.'

کاتێک مەلای کوێر ئەمەی وت، گوێم لە هاوار و نزای دایکم بوو، یەکێک لە فەقێکان هاتە سەر چیچکان و بەتوورەییەوە لەناو چاومی ڕوانی و پێی وتم، 'ئادەی شایەدمان بینە!'

لەژێر لێوەوە پێم وت، 'چۆنچۆنییە؟'

کاتێک ئەمەم وت، مەلاکە دوو جار لە شوێنی خۆی هەڵبەزییەوە، وەکو بڵێی زەردەواڵـە پێوەی دابێت، چەند جارێک لەبەرخۆیەوە بە دەنگی بەرز وتی، 'هەی کافری بەدناو، کوو شەرمێ لە خۆت ناکەیت شایەدمانی حەق نازانیت؟'

دارێکـی لـە دەسـتی یەکێک لـە پیـاوەکـان وەرگـرت و کاتێک لێی داهێنامەوە خێرا هەنگاوێک چوومە دواوە، ئەو پیاوانەی لە پشتمەوە وەستابوون، بە نووکی پێڵاوەکانیان پاڵیان بە پشتمەوە نا و خستمیانەوە بەردەمی مەلاکە، ئەویش توند بە دارەکەی دەستی لە ناوچەوانمی سرەواند، ئازارم زۆر پێ گەیشت و لە تاواندا هاوارم لە مەلاکە کرد، 'باشە، باشە، چی بڵێم؟'

مەلا دانەوییەوە و لێی ڕوانیم و بەهێمنییەکەوە وتی، 'عافەریم، لۆ خۆم دەمزانی ڕەحمی ئیسلامەتی چوویتە دریەوە.'

چاوێکی بەناو پیاوەکاندا گێڕا و پێی وتن، 'ئیدی ئەنگۆ لۆ خۆتان شایەدی هەنووکە و قیامەتم بن، بزانن کە چەند کەسی بێئیمان لەسەر دەستی من بوون بە موسرمان.'

لەپڕ ناڵەیەک هـات و یەکێک لـە پیـاوەکـان بـەسـەردا کەوتە نـاو حـەوزەکـە، مـەلا خێرا لە شوێنی خۆی هەڵسایە سـەر پێ و پیاوەکان هەر یەکە و بەلایەکدا ڕایان کرد، سەیرم کرد چوار پۆلیس تفەنگەکانیان بەدەستەوەیە و دایکم لە دوایانەوە دەڕوات، خوێنی کابرای پێکراو تەواوی ئاوی حەوزەکەی سوور کرد و بێگیان لەسەر دەم لە لامەوە کەوتبوو، منیش بەترسەوە لێم دەڕوانی، کاتێک دایکم

گەیشتە لای حەوزەکە، دەستی بۆ درێژ کردم و ڕایکێشامە دەرەوە، یەکێک لە پۆلیسەکان پیاوەکانی پێش خۆی دا و بردنی، دوانیان چوونە ناو مزگەوتەکە و بەدوای مەلای کوێرەدا دەگەڕان، پۆلیسی چوارەم بەکوردی پێی وتین، 'ئەو مەلا خدرە کوێرە، تا خوا حەزکات بەدناوە، دەی مەوێستن و بچن بە ڕێگای خۆتانەوە.'

دایکم لەبەرخۆیەوە بەردەوام نزای دەکرد، منیش لە پۆلیسەکەم ڕوانی و پێم وت، 'هاوەڵێکمان لەگەڵە، تاوێک پێش ئێستا بردیان بۆ ئەو خانووەی تەنیشتی مزگەوتەکە، وا بزانم لەوێ بەندیان کردووە و ئێمە بەبێ ئەو ناڕۆین.'

دوای ئەوەی پۆلیسەکە ئەوەی پێ وتین، گوایا ئەو کوردە و خەڵکی کەرکوکە، بەڵام ئەوان کە دەیان خێزانی کوردن و بڕیاریان دواوە لەنێوان خۆیاندا تەنها بە زمانی تورکی قسە بکەن، لە بەرامبەردا مانگانەیان پێ دەدرێت، پاشان پێشمان کەوت و بۆ ناو حەوشەی خانووی تەنیشتی مزگەوتەکە چووین، پێش ئەوەی دەرگای ماڵەکە بکاتەوە، لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەوە مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی مانگێکە بۆ ئەستەمبوڵ چویتە، ئیتر ئەو مەلا خدرە کوێرەی چاوی وی لێ دیار نینە، بزانە چ بەو خەڵکە فەقیرە دەکاتن!'

کاتێک چووینە ناو حەوشەی ماڵەکە، بینیمان فەخری بە قەدی دارتوویەکەوە بەسترابوویەوە، ئەوەندەیان گوریس بە دەوریدا ئاڵاندبوو بەئەستەم دەیتوانی هەناسە بدات. دوای ئەوەی گوریسەکەمان لێ کردەوە، هەستایە سەر پێ و خێرا وەکو شێت بەو ناوەدا دەستی کرد بە ڕاکردن، پەلاماری چڵێک داری دا و لە دەرگای ماڵەکەوە ڕای کردە دەرەوە، فەخریی عارەبانچی ئەوەندە تووڕە بوو، لەو کاتەدا لەناو قەلاتێدا ڕێکەوتی هەرچ کەسێکی دەکرد دارکاریی دەکرد، پاشان پۆلیسەکان ناچار بوون فەخرییان باڵبەست

کرد و لەگەڵ چەند پیاوێک و مەلا خدرە کوێردا بەرەو مەخفەری پۆلیس بردنیان. من و دایکیشم ڕەشۆی ئەسپەکەی فەخریمان گرت و دوایان کەوتین، ئەو شەوە فەخریی عارەبانچی لە بەندینخانە مایەوە و من و دایکیشم لەناو عارەبانەکەی فەخریدا و لەبەر مەخفەری قەڵاتێدا خەوتین.

ڕۆژی دوایی پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت، چەند پۆلیسێک من و دایکمیان بەخەبەر هێنا، دایکم بەدەم کۆکەکۆک و هێڵنجدانەوە بەخەبەر هات، پاشان چەند جارێک لەسەر یەک ڕشایەوە، کاتێک فەخری هات بۆ لامان، بەردەوام لەبەرخۆیەوە جنێوی دەدا و هێشتا بێزاری بە ڕوویەوە دیار بوو، کاتێک دایکمی بینی پێی وتم، 'دایکت تووشی سکچوون و ڕشانەوە بووە.'

لەگەڵ فەخری بڕیاری گەڕانەوەمان دا، دایکم ئاگای لە خۆی نەمابوو تاوەکو بەرپەرچی بڕیارەکەی من و فەخری بداتەوە، ئەو ڕۆژە گەڕاینەوە بۆ کۆیە و لەوێوە بەرەو سلێمانی بەڕێ کەوتین.

کاتێک گەیشتینەماڵەوە دایکم لە جێگادا کەوت و لە ماوەی تەنها دوو ڕۆژدا ئەوەندە لاواز بووبوو پێستی بە ئێسقانەکانی جەستەیەوە نووسابوو، ئیتر دایکم لە توانایدا نەبوو باسی سەفەرەکە بۆ باوکم بگێڕێتەوە و منیش هیچم لەبارەوە نەوت، لە شەوی سێهەمدا باوکم لە خەو بەخەبەری هێنام و بە دەنگێکی تێکشکاوەوە پێی وتم، 'خایم، ڕۆڵە دایکت مرد.'

ئەو بەیانییە دەرودراوسێ و خزمان ڕژان بەسەرماندا و لەبەر هەیوانەکە سێ کورسییان بۆ من و باوکم و کەتانی خوشم دانابوو، باوکم لە ناوەڕاستماندا دانیشتبوو، بە درێژایی ئەو بەیانییە بە لچکی مشکییەکەی فرمێسکەکانی وشک دەکردەوە، ئەوە بۆ یەکەم جارم بوو باوکم ببینم بگری، دوای ئەوەی لاشەی بێگیانی دایکمیان بۆ میکفەی

کنێسەتەکە برد، چەند ژنێک دەستیان کرد بە گسکدان و پاککردنەوەی ماڵەکە، زۆری پێ نەچوو چەند پیاوێک هاتن بەدواماندا و بۆ سەر قەبران دوای جەنازەکەی دایکم کەوتین، دوای کادیش، هەموو پێکەوە لەگەڵ حاخامدا نزامان بۆ دایکم کرد و داوامان لە خوا کرد، 'یادی ئەو بەزیندوویی لە خەیاڵی ئێمەدا بهێڵێتەوە.'

مامە سلێمان یەکەم خاکەناز گڵی هەڵدایە ناو گۆڕەکە و سەر تەرمەکەی دایکم، پاشان چوار پیاو بە پەلەپەل گڵیان کرد بەسەردا و تاشەبەردێکیان لای سەریەوە چەقاند.

بێدەنگ بووم و زوو زوو لە باوکمم دەڕوانی، مامە سلێمان چەند جارێک هاتە لامەوە و دەستی بە سەرمدا هێنا، کاتێک بەرە و ماڵەوە دەڕۆیشتین، کەتانی خوشکم دەستی لە دەستم هەڵپێکا و تاکو گەیشتینە ماڵەوە زوو زوو دەستیٔ دەگوشیم، پاشان لەبەرخۆیەوە چەند جارێک لێی پرسیم، 'کاکە، یانی ئێتر من و تۆ هەتیو کەوتوین؟'

لەو کاتەدا نەمزانی چ وەڵامێکی کەتان بدەمەوە، کاتێک گەیشتینە ماڵەوە، دیسان کەسوکار لەسەر کورسییەکان دایان نایەنەوە، بێدەنگ بە شانی یەکەوە دانیشتبووین، وا هەستم دەکرد بە زۆر لەوێدا دانراوین و بۆمان نییە لە جێگای خۆمان بجووڵێین، زوو زوو جامێک ئاو یان دۆیان بۆ دەهێنایین، ئەو ئێوارەیە ئەوان خواردنیان بۆ دروست کردین، تاکو نیوەی شەو لامان بوون و وەکو منداڵ بردینیانە ناو جێگاوە و پاشان بەجێیان هێشتین، ئەو شەوە چەند جارێک لە دەنگی گریانی باوکم بەخەبەر هاتم.

ڕۆژی دوای ئەو ڕۆژە، بەیانیی زوو لە خەو هەڵیان ساندین و دیسان چووین و بێدەنگ لەسەر کورسییەکانمان دانیشتینەوە.

ئەوەم باش لەبیرە، کە دایکم وەسیەتی بۆ باوکم کردبوو لە گۆڕستانی شارۆچکەی قەرەداخ لای گۆڕی کەسوکاریەوە بینێژێت،

بەڵام مامە سلێمان ڕێگای بەوە نەدا و ئەو بەیانییە بە باوکمی وت، 'جا ئێستا کێ دەوێرێت بەرەو قەرەداغ بکەوێتە ڕێ، بەخوا دەڵێن پەلەوەر لەدەست ئەو هەمەوەندییانە دەر ناچێت و نەک هەر ڕووتی دەکەنەوە، بەڵکو سەریشی لە لاشەی دەکەنەوە، ئیتر قابیلە ئەو چەتە زاڵمانە ڕەحم بە تۆ بکەن، لەبەر خاتری ئەوەی جەنازەی ژنەکەتت پێیە؟'

سێ ڕۆژ دوای مردنی دایکم، باوکم کلیلی دوکانەکەی ڕادەستی موشێی عەتار کرد و ڕۆژانە من بەڕێوەم دەبرد و ئەویش چاودێریی دەکردم، ڕۆژێک حەمەجان سەلیم هات بۆ لام و پێی وتم، 'دەتەوێت زمانی کوردی فێر بیت؟'

من بەبێ ئەوەی هیچ وەڵامێکی بدەمەوە، ئەو بەردەوام بوو لە قسەکردن و باسی ئەوەی بۆ دەکردم، کە هەموو شەوێک دەچێت بۆ ماڵی مامۆستایەک و لەوێ لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا وانەی زمانی کوردی دەخوێنێت، ئیتر زیاتری پێ نەوتم، کە ئەو مامۆستایە و هاوڕێکانی کێن.

ئەو چەند ڕۆژەی باوکم لە دوکان نەبوو، ئەو وشە و ڕستە کوردیانەی حەمەجان شەوانە فێریان دەبوو، پێکەوە بەسەریاندا دەچووینەوە و لە دەفتەرێکدا دووبارە دەمان نووسینەوە، لەو ڕۆژانەدا حەمەجان پێی وتم، 'ئەگەر ناوی خۆت بگۆڕیت و پاشان لای خەڵکی بڵێیت موسوڵمانم، ئەوا من ئامادەم تەکلیف لە مامۆستاکەم بکەم، تاکو تۆیش بێیت بۆ ماڵیان و لەوێ وانەی زمانی کوردی بخوێنیت.'

کاتێک حەمەجان سەلیم ئەمەی پێ وتم، بروسکەیەک بەر تەوقی سەرم کەوت و بەناو تەواوی دەمارەکانمدا کشا و لەبەر پێمەوە دەر چوو، لەو کاتەدا ئەو قسەیەی باوکم بیر کەوتەوە، کە زۆر

جار دەیوت، 'ئێمەی جوو، ئەبەد وەکو دۆست یان هاوڕێ قبووڵ ناکرێین، ئەگەر زۆر پیاوخراپیش بین، ئەوا بە موسوڵمانبوونمان هەموو بێڕەوشتی و ناشیرینییەکانمان چاوپۆشی دەکرێن!'

تاوێک بوو بێدەنگ بووم و لە بەرپێی خۆمم دەڕوانی، وا بزانم لەو کاتەدا هیچ وەڵامێکی حەمەجانم نەدایەوە، ڕۆژێک دوای ئەو ڕۆژە، حەمەجان دیسان ئەوەی پێ وتم، گوایا پرسی بە مامۆستاکەی کردبوو، مامۆستاکە لە وەڵامدا بە حەمەجانی وتبوو، 'ناتوانم وانە بە منداڵی جوولەکە بڵێمەوە!'

ڕۆژێک پێش ئەو ڕۆژەی باوکم بڕیار بدات و لەگەڵمدا بۆ سەر دوکان بێت، بە حەمەجان سەلیمم وت، 'پێویستیم بە فێربوونی زمانی کوردی نییە و دەمەوێت ببم بە حاخام!'

نازانم ئەو ڕۆژە بۆچی ئەمەم بە حەمەجان سەلیم وت؟

دوو حەفتە بەسەر مردنی دایکمدا تێپەڕی، سەرەتای وەرزی پایز بوو، دوای مردنی دایکم کەتانی خوشکم ئیشوکاری ماڵەوەی دەکرد، بە ڕۆژدا ئەوەندە ماندوو دەبوو، ئێواران بەدانیشتنانەوە خەوی لێ دەکەوت، هەروەها دوای مردنی دایکم باوکم تەواو گۆڕا، سەروریشی لێ هێشتەوە و نانی لە خۆی حەرام کردبوو، مانگێک بەو جۆرە تێپەڕی و پێکەوە ڕۆژانە بێدەنگ بۆ سەر دوکان دەچووین، ئەو لەسەر ئەو سندوقە دارە بێدەنگ دادەنیشت، کە پێشتر لە قوژبنی دوکانەکەیدا بۆ منی دانابوو، قوڕوقەپی لێ کرد و نە لە دوکان و نە لە ماڵەوە قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد.

ڕۆژێک لە گەڕانەوەماندا بۆ ماڵەوە، باوکم ئەو بێدەنگییەی نێوانمانی شکاند و لەبەرخۆیەوە پێی وتم، 'لەمڕۆ بەدواوە پێت بنێیتە دەرەوەی سنووری گەڕەکی جوولەکان ئەژنۆکانت دەشکێنم!'

لە دەنگی ڕاچڵەکیم و بەسەرسامییەوە لێم ڕوانی. وەکو باوکم

ئاگاداری هەموو لێدوانەکانی نێوان من و حەمەجان سەلیم بوو‌بێت، لەو ڕۆژە بەدواوە خۆی بەتەنها بۆ سەر دوکانەکەمان دەچوو، منیش دوو مانگ لە ئاشەکەی مامە سلێمانم لە گەڕەکی جوولەکان ئیشم کرد، چونکە لە پایزاندا باراشەکان دووقات دەبوون و مامە سلێمان بەتەنیا ئیش و کارەکانی بۆ بەڕێوە نەدەچوو.

## ٤

سەرەتای وەرزی زستانی ئەو ساڵە باوکم لەگەڵ مامە سلێمانمدا بۆ شاری کەرکووکی ناردم، ئەو بەیانییەی ئێمە لە گەڕەکی جوولەکانەوە بەڕێ کەوتین، سەدان سەربازی تورک ڕژابوونە ناو جادە و کۆڵانەکانی شار و لە زۆر گەڕەکدا ماڵەکانیان دەپشکنی، مامە سلێمانم وتی، کە تورکەکان بەدوای ئەو گەنجانەدا دەگەڕێن، کە کاتی سەربازییان هاتووە و نەچوون پەیوەندی بە ڕیزەکانی سوپاوە بکەن، یان ئەو جوولەکە و مەسیحییانەی لەبری چوونیان بۆ ڕیزی سوپای عوسمانی، بەدەلیان نەداوە.

کاتێک کەوتینە ڕێ، دوو هاوڕێی مامە سلێمانمان لەگەڵدا بوو، تاوەکو گەیشتینە ناوچەی قەرەداخ، زوو زوو خۆمان دەشاردەوە و لە ترساندا کوورەکوور دەڕۆیشتین، خۆمان شاردبۆوە و لەلای مامە سلێمانمەوە پاڵ کەوتبووم و لە دوورەوە پێکەوە لە توولە ڕێگایەکی باریکمان دەڕوانی، لەو کاتەدا چەند سوارێک بەتفەنگەوە پێیدا تێدەپەڕین، لە مامە سلێمانم پرسیی، 'ئەرێ مامە ئێمە لە چی دەترسین؟'

'ئا ئەو چەتانە، دەی نایبینیت ئەوە هەمەوەندییەکانن؟'

دوای ئەوەی سوارە تفەنگچییەکان تێپەڕین و ئێمەیش کەوتینە ڕێ، مامە سلێمانم لەبەرخۆیەوە پێی وتم، 'ئەوەتەی من لەبیرم بێت و تەنانەت بە بیرەوەریی باوکیشم، ئەم ناوچەی قەرەداغە ژیان تێیدا ناهەموار بووە، گەلێک لە هەمەوەندییەکان مانای پێکەوەژیان

نازانن و ئەوەتەی هەن لەسەر ماڵی ئەوانی تر خۆیان دەژیێنن و لە چەتەیی زیاتر هیچ کار و پیشەیەکی تر نازانن، تاوانبارن، هەتاوەکو خوا حەزکات تاوانبارن و دەستیان سوورە بە خوێنی هەزران بێگوناح!'

دوای ئەوەی مامە سلێمان ئەمەی وت، زیاتر لە دوو کاتژمێر بێدەنگ بەدوای یەکتریندا بە توولەڕێگاکانی شاخەکانی قەرەداغدا بەڕێوە بووین، پاشان لە ڕێگا مامە سلێمان لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەگەر توانیمان لە شارۆچکەی قەرەداغ لا دەیەین و سەردانی ماڵی خزمان دەکەین.'

زیاتر بەردەوام بوو و وتی، کە دەیەوێت شەوێک لەوێ بمێنێتەوە، بەڵام کاتێک گەیشتینە نزیکی شارۆچکەی قەرەداغ، ڕێگامان گۆڕی و لەوێ لامان نەدا، لە ڕێگا یەکێک لە هاوڕێکانی مامە سلێمان وتی، 'لەم زرووفەدا باشترە کەس بەڕێبواری ڕێگای نەکەوێتە ئەم ناوچەیە.'

دوانیوەڕۆی ڕۆژی دوایی گەیشتینە ناو شاری کەرکووک و بە گەڕەکی ڕەحیماوادا تێپەڕین، لەو گەڕەکە من بە چاوی خۆم کەسم لەسەر جادە و ناو کۆڵانەکاندا نەبینی، کاتێک چووین بۆ گەڕەکی جوولەکان و لەسەر سەکۆی بەردەمی کنێسەتەکە لامان دا، مامە سلێمان دەرگای کردەوە و بەتەنیا چووە ژوورەوە، زیاتر لە کاتژمێرێک لەگەڵ دوو هاوڕێکەی مامە سلێماندا بێدەنگ لە شانی یەکترینەوە ڕاوەستابووین، دیار بوو ئەوانیش وەکو من ماندووی ڕێگا بوون، کاتێک مامم لەگەڵ کابرایەکی باڵابەرزی سەروریشهاتوودا گەڕایەوە، دەستی خستە سەر شانم و لێی ڕوانیم و پێی وتم، 'ئەمە شارۆنی حاخامە و لەمڕۆ بەدواوە هەموو بەیانییەک لەلای ئەم پیاوە دەرس دەخوێنی!'

دوای ئەوەی ئەمەی پێ وتم، دەستی تەوقەی بەرەو ڕووی حاخام درێژ کرد و ماڵئاوایی لێ کرد، دیار بوو ئەو ڕۆژە مامە سلێمان زۆری پەلە بوو، چونکە بواری بە کەس نەدا قسە بکات، یان تەنانەت خۆی و هاوڕێکانی پشوو بدەن، هێشتا لەسەر ڕاستەجادەی بەردەمی کنێسەتەکە بووین، دوای سەد مەترێک گەیشتینە ماڵی ماتانی دارتاش، بەپەلە پێی ناساندم و پاشان بە ماتانی وت، 'ئەوە خایمی برازامە و تەسلیمی تۆی دەکەم، گۆشتی بۆ تۆ و ئێسقانی بۆ من و باوکی، ئەوەی گرنگە دەبێت هەموو ڕۆژێک بچێت بۆ کنێسەت و لە دەرس و دەور دوا نەکەوێت.'

دوای ئەوەی ئەمەی بە ماتان وت، ماڵئاواییان لێ کردین و لەگەڵ دوو هاوڕێکەیدا بەرەو بەغداد بەڕێ کەوتن.

ڕۆژی دوایی چووم بۆ کنێسەت و دەستم کرد بە خوێندنی تەورات، کاتێک دوانیوەڕۆ بۆ ماڵەوە گەڕامەوە، ماتان داوای لێ کردم لە دارتاشیدا بەردەستیی بکەم، چەند ڕۆژێکی بەسەردا تێپەڕی و من و ماتان بەبێدەنگی لە دوورەوە لە یەکترمان دەڕوانی، شارۆنی حاخامی کنێسەتەکەی شاری کەرکووکیش هاوڕێی نزیکی مامە سلێمانم بوو، چونکە چەند جارێک باسی یادگاریی خۆی و مامە سلێمانی بۆ کردم، مەبەست لە چوونم بۆ کەرکووک تاوەکو شارۆنی حاخام وانەم پێ بڵێتەوە و بۆ خوێندنی تەلمود ئامادەم بکات، هەروەها ماتانی دارتاشیش زڕئامۆزای باوکم بوو، هەرچەندە بۆ جاری یەکەمم بوو بیبینم، بەڵام بە مامە ماتان بانگم دەکرد، ماتان ژوورێکی ماڵەکەی خۆی کردبوو بە جێگای دارتاشی و ژوورێکی تری بۆ پەیکەرتاشی تەرخان کردبوو، شەوان تاکو دەمەو بەیانی شەرابی دەخواردەوە و لە دار پەیکەری دەتاشی، کە دوو ولاخدار لە شاخەکانی قەرەداغەوە کۆتەرە و ڕەگی داربەڕوویان بۆ ئەهێنا،

ئەو ڕۆژەی بۆ یەکەم جار ژووری پەیکەرتاشییەکەی ماتانم بینی، سەرم لەو هەموو پەیکەرە ناوازەیە سووڕ ما، چونکە بۆ هەستی بینینی من نوێ بوون و هیچیان پەیکەری مرۆڤی ئاسایی نەبوون، پەیکەرەکان هەموو ڕووت بوون و جەستە و ڕوخساریان لەگەڵ شێواز یان ئەندامی لەشی گیانداریکدا تێکەڵ کرابوو، ئەو شەوە تاکو بەیانی نەموێرا بخەوم و ئەو جانەوەرانەی کە ماتان لە دار تاشیبوونی، هەموویان لە پێشچاومدا بە ماڵەکەدا دەگەڕان.

بە جۆرێک کاریگەرییان لەسەرم هەبوو، کە تاکو ئەمڕۆیش ئەو فیگورانە لە خەیاڵمدا بەردەوام دووبارە دەبنەوە، ماتان بەتەنیا ئەژیا و ژن و منداڵی نەبوو، من لە ژووری دارتاشییەکەی دەخەوتم و خۆیشی لەناو پەیکەرەکانیدا زۆرینەی کاتی بەسەر دەبرد، ئەوەندە ئیشی دارتاشیی دەکرد، تاکو بەشی دابینکردنی بژێویی ژیانی خۆی بکات.

ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام پەیکەری ئەو پیاوە ناودارانە بوو، کە لە نێوانیاندا پەیکەری شێخ سەعید و چەند پاشایەکی بابانم بینی، هەروەها پەیکەری حاکم و کاربەدەستە تورکە یەک بەدوای یەکەکانی شاری کەرکووکی تاشیبوو، لە ڕەگی کۆتەرەدارێک پەیکەری شێخ سەعیدی تاشیبوو، تاکو خۆی پێی نەوتم ئەوە شێخ سەعیدە، من نەمزانی.

لەبیرم دێت، ئەو ڕۆژەی هەواڵی کوشتنی شێخ سەعید لە موسڵەوە گەیشتەوە سلێمانی، من لە قوتابخانەی ڕوشدییە بووم، زیاتر لە حەفتەیەک نەچووینەوە بۆ قوتابخانە و دوکان و بازاڕ داخرابوون، ڕوخساری پەیکەرەکە دەموچاوێکی ڕێک و سمێڵێکی ئەستووری پێوە بوو، بەڕووتی بە پێوە وەستابوو و سەری داخستبوو، هەردوو هێلکەگونی لەناو دەستی گرتبوو لێی دەڕوانی، بەرامبەری شێخ سەعید

بە هەمان شێوە پەیکەری سوڵتان عەبدولمەجید دانرابوو، کاتێک ئەوەم بینی دەستم کرد بە پێکەنین، ماتان وتی، 'چییە سەیرە بەلاتەوە، بۆ نازانیت شێخولاکان زۆر لە ئێمە و مرۆڤی ئاسایی جیاوازترن، خوا ئەوانی بەتایبەتی خوڵقاندووە و تەنها گون و هەوەسی پێ داون، کێرەکەی بۆ هەڵگرتوون بۆ ئەودونیا!'

خۆی پێکەنینی بە قسەکەی خۆی ئەهات و لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئیتر من وای دەبینم.'

زۆربەی پەیکەرەکان ڕەنگ و شێوازی لاشەیان پێستی ڕێوی و گورگ و کەمتیار و گیانداری تر بوون، بۆ یەکەم جار لای ماتان جەستەی ئافرەتم بەڕووتی بینی، زۆربەی ئافرەتەکان پێستیان پەڵەپەڵەی ڕەنگێکی سەوزی قەوزەیی و هاوشێوەی پێستی کەمتیار بوو، زوو زوو لێی دەڕوانیم و پێی دەوتم، 'تەماح نەکەیتە ژنەکانم و دەستیان بۆ نەبەیت، ئەگینا کێرت دەبڕم!'

دوای ئەوەی دوو حەفتە لە ماڵی ماتان بووم، ئێوارەیەک لەگەڵ نانخواردنی ئێوارەدا جامێک شەرابی بۆ تێکردم و پاشان فەرمووی لێ کردم، بەبیرم دێت تاوێک بوو بەسەرنجەوە لە ماتانم دەڕوانی، پاشان بێدەنگ جامەکەم لەناو دەستم گرتبوو، ئەو لەبەرخۆیەوە پێی وتم، 'بیخۆرەوە با تۆزێک ترست بشکێت!'

کاتێک قومێکم لە شەرابەکە دا، بێجگە لە بۆنی ترێکە، هەستم دەکرد وردەداری تێ کرابوو، لێی پرسیم، 'ئێ، چۆن شەرابێکە؟'

لە وەلامدا پێم وت، 'نایابە، بەلام وا بزانم وردەداری تێ کەوتووە!'

دەستی کرد بە پێکەنین و لە وەلامدا وتی، کە دەستکردی خۆیەتی و کاتێک گەیشتۆتە ئەوەی شەرابەکە تەواو پێ بگات تەلاشی ماسوولکەی دارقەزوانی تێ کردووە.

لەدوای ئەو ئێوارەیەوە، کردبووم بە پیشەی دایمیم و هەموو

شەوێک لەگەڵ ماتان شەرابم دەخواردەوە. لە یەکێک لەو شەوانەدا داوام لێ کرد فێری پەیکەرتاشیم بکات، لە وەڵامدا پێی وتم، 'پێویستە جارێ تۆ ڕەگەز و سروشتی دارەکان باش بناسیت، هەروەها فێر بە وەکو مرۆڤ توانای هەستەکانت بەکار بێنە!'

هەروەها ماتان زوو زوو لێی دەپرسیم، 'لە ترسی باوکت دەچیت بۆ کنێسەت، یان خۆت پێت خۆشە و باوەڕت پێیەتی؟'

ئەوسا نەمدەزانی چیی وەڵام بدەمەوە و ئایا مەبەستی ئەو لەو پرسیارە چییە، ناچار تەنها سەرم بۆ ڕاوەشاند و لەژێر لێوەوە زوو زوو دەموت، 'نازانم!'

کاتێک باسی خەونەکەی دایکمم بۆ ماتان گێڕایەوە، ئەویش وەکو مامە سلێمانم وتی، 'ئەوە تەئسیری ئەو خەونەی دایکتە بەسەر ڕۆحتەوە، چونکە تۆ و حاخامییان نەوتووە!'

دوانیوەڕۆیەک، کاتێک لە کنێسەت گەڕامەوە، ماتان لەناو دەرگای حەوشەی ماڵەکەیدا ڕاوەستابوو چاوەڕوانی دەکردم، پاشان دەستی گرتم و بێدەنگ لەگەڵ خۆی بردمی بۆ ژێرزەمینی خانووەکەی، ژێرزەمینەکە بە ئەندازەی گەورەیی ماڵ و حەوشەی ماڵەکەی بەرین بوو، دەتوانم بڵێم پانییەکەی سەد مەترێک چوارگۆشە بوو، پڕ بوو لە گۆزەی گەورە و هەموو جیا کرابوونەوە و بەسەر چەندیین بەشدا دابەش کرابوون، هەر بەشە و ڕەنگ و ژمارەی تایبەت بە خۆی هەبوو، پاشان ماتان بەسەر گۆزەیەکەوە وەستا و سەری گۆزەکەی لا دا و بە جامێک شەرابی لێ هەڵهێنجا و دایە دەستم، دوای ئەوەی قومێکم لێ دا و تامی شەرابەکەم کرد، سەرم بۆ ڕاوەشاند و دیسان چەند قومێکی ترم لێ دا، لێی ڕوانیم و جامەکەی لە دەست وەرگرتم و بەپێکەنینەوە وتی، 'ئەوەی خواردت هەوێنەکەی میزی خۆمە!'

بەسەرنجەوە لێم ڕوانی، پاشان ئەو بەردەوام بوو و وتی، 'ئەوە باوکم دروستی کردووە، ئەو چل ساڵ دەبێت مردووە، ئیتر بزانە ئەم شەرابە چەند کۆنە!'

دیسان جامێکی پڕ لە شەرابی لە گۆزەکە دەر هێنا و لێی پرسیم، 'تەنها بوونی کتێبی پیرۆز بەبێ شەراب ئارامی بە ڕۆحمان نابەخشێت؟'

# ٥

'هەر کەسێک بۆ سەفەربەلیک بڕوات، ئیتر بەتەمای گەڕانەوەی مەبن!'

ئەو ڕۆژەی شارۆنی حاخام لە ژێرزەمینی کنێسەتەکە ئەمەی پێ وتین، ڕۆژێک دوای ئەو ڕۆژە بوو، کە سەربازە تورکەکان لە ڕۆژی شەممەدا بە ڕێبەریی چەند تورکمانێکی شاری کەرکووک، هەڵیان کوتایە سەر کنێسەتەکە، ئیتر ئەوەی توانای ڕۆیشتن یان کارکردنی هەبوو دەستگیریان کرد و لەگەڵ خۆیان بردنیان، یەکێک لە تورکمانەکان وتبووی، دەیاننێرین بۆ سەفەربەلیک، ئەوانەی ئەو ڕۆژە لە ژێرزەمینی کنێسەتەکە ئامادە بوون، من و ماتان و شارۆنی حاخام و دوو پیری پەککەوتە بوون، ماتان لەبەرخۆیەوە وتی، 'جاران سەروخواری ئەم کنێسەتە کەسێکی تری نەدەگرت، ئەوەتا ئێستا دانیشتووانی گەڕەکی جوولەکان سێ کەس و لەتێکین!'

یەکێک لە ئامادەبووان کابرایەکی پیری بەساڵاچووی پشتچەماوە بوو، کە بە سوبحی بانگیان دەکرد، سوبحی لەبەرخۆیەوە وتی، 'دوو ساڵ پێش ئێستا من و ژنەکەم و هەردوو کوڕەکەمیان لەناو بازاڕی کەرکووکدا گرت، دوای ئەوەی لە مەخفەری خاسە داوایان لێ کردم، گفتیان پێ بدەم و ئیمزایان بۆ بکەم، کە لەگەڵ ماڵ و منداڵمدا زمانی تورکی لەجیاتیی ئارامی بەکار بێنم، دوای ئەوەی من ئەوەم ڕەفز کردەوە، کوڕەکانیان لە من و ژنەکەم جیا کردەوە و ئیتر نەمان بینینەوە، خۆم و ژنەکەمیان برد بۆ عەمارێکی سەربازی

له موسڵ و لەوێ کاریان پێ کردین، ژنەکەم لەوێ لەتاو برسێتی و بارگرانی گیانی سپارد، خۆیشم ئەوەتا پەکم کەوتووە، پاشان بیستم، کە کوڕەکانم بۆ سەفەربەلیک نێردراون، وتیان بەرەو سنووری ڕووسیایان ناردوون، ئەوەتا هەموو ئەڵێن هەرچ کەسێک لەگەڵ تورکەکان بڕوات بۆ ئەو دۆزەخەی ناویان لێ ناوە سەفەربەلیک، ئیتر جارێکی تر ناگەڕێتەوە!'

ماتان ڕووی لە سوبحی کرد، 'لالۆ گیان، ئیتر خۆیان و قیسمەتیان، کێ دەڵێت کوڕەکانت ناگەڕێنەوە، تۆ قەت هیوابڕاو مەبە!'

سوبحی، لە ماتان هاتە پێشەوە و خۆی ڕاست کردەوە و دەستی خستە سەر شانی، پێڵووی چاوەکانی تەڕ دیار بوون، بە دەنگێکی تێکشکاوەوە وتی، 'ئەمڕۆ من بۆ ئەوە نەهاتووم بۆ ئێرە، تاوەکو جێگای بەزەییی ئێوە بم و قسەی زەرد و سوورتان لێ ببیستم، بەڵام هاتووم لە کنیسەت و لەگەڵ ئێوەدا نزایان بۆ بکەین، کاتێک گرتینیان کوڕەکانم تەمەنیان شانزدە و حەڤدەساڵ بوو، ئیتر برام من تەواو هیوابڕاوم، بەڵام لە ژیانمدا لە هیچ پەشیمان نیم و باوەڕم بە خوای نەوەی ئیسرائیل بەهێزە، ئینجا باوەڕ ناکەم خوا کوڕەکانی منی بۆ مەرامی ئەو تورکانە خوڵقاندبێت!'

دوای ئەوەی سوبحی ئەمەی وت، سەری داخست و تاوێک بوو بەکوڵ دەگریا، لەو کاتەدا ماتان دەستی خستە سەر شانی من و پێی وتم، 'دەڵێم بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە باشترە!'

ئەو پێنج ساڵەی لە ماڵی ماتان و لە شاری کەرکووک ژیام، ساڵانی جەنگ و گرانییە گەورەکە بوو، وشەی سەفەربەلیک وێردی سەر زوبانی هەموو کەسێک بوو، بە درێژاییی ئەو ساڵانە قاتوقڕی و برسێتی بەردەرگای بە هەموو کەسێک گرتبوو، لە سلێمانییەوە تەنها هەواڵی تاعوون و ڕشانەوە و مردنم پێ دەگەیشت، بێجگە

لەوەی چەند جارێک بە شەودا چەتە دابوویان بەسەر ئاشەکەی مامە سلێمانمدا و باراشی جووتیارەکانیان بردبوو، باوکم لە نامەیەکیدا نووسیبووی، دوکانەکەی چۆڵ کردووە و هەموو شڕەوشیتاڵی هێناوەتەوە ماڵەوە و کەس ناوێرێت لە ترسی تاعوون و دز و چەتە لە ماڵ سەر بێنێتە دەر، شەوانە پیاوان پاسەوانی گەڕەک و کنێسەتەکە دەکەن، باوکم هەموو جارێک لە کۆتاییی نامەکانیدا ناوی ئەو دۆست و ناسراوانەی دەنووسی، کە بە نەخۆشی دەمردن.

لە گەڕەکی جوولەکانی شاری کەرکووک، زیاتر لە بیست پیاوی جوو بەزۆر کرابوون بە سەرباز، هەرچەندە هەموویان چەند جارێک پارەی بەدەلیان بە تورکەکان دابوو، بەڵام سالانی جەنگ تورکەکان گوێیان بەو یاسایەی خۆیان نەدەدا، کە ساڵی ١٨٥٠ دەریان کردبوو، بەگوێرەی ئەو یاسایە جوولەکە و مەسیحییەکان بە سەرباز نەدەگیران و لە بەرامبەر ئەوەدا بڕێک پارەیان لێ دەساندن، کە تورکەکان ناوی بەدەلیان لێ نابوو، لەو ساڵانەدا چەند جوویەک بە ماڵ و منداڵەوە لە کەرکووک هەڵهاتن و ڕوویان لە شاخەکانی ناوچەی قەرەداغ کرد.

لە دواساڵەکانی جەنگدا، ئەو جووانەی لە کەرکووکدا مابوونەوە تەنها پیر و پەککەوتەکان بوون، ئەوانیش هەموو پێکەوە پاسەوانی گەڕەکەکەیان دەکرد، سەربانی کنێسەتەکە بەسەر هەموو ماڵەکانی گەڕەکدا دەیڕوانی و بەردەوام یەکێک لەوێ ئێشکی دەگرت و کاتێک سەربازەکان لە دوورەوە دەر دەکەوتن خێرا هەمووانی لێ ئاگادار دەکرایەوە، دواساڵی جەنگ و گرانی، سەربازە تورکەکان زوو زوو بۆ گەڕەکی جوولەکان دەهاتن، کە بۆ سەربازەکانیان لە بەرەکانی شەڕ لە گەنم و جۆ و خواردەمەنی دەگەڕان، گەلێک جار دار و

قاپوقاچاغی ناوماڵەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد.

بە بیرم دێت کاتێک سەربازەکان لە دەرگای ماڵی ماتانیان دەدا، منی دەکردە ژێرزەمینەکە و خۆی دارێکی دەگرت بە دەستیەوە و دەمی گێڕ دەکرد و بە شەلەشەل دەچوو بەرەو پیریان، نازانم چۆن هەموو جارێک بەو شێوەیە ڕازیی دەکردن، ئەو ساڵانە لە شاری کەرکووک بێجگە لە نەخۆشی و گرانی، چەتەکان شەوانە حاکمی شار بوون، لە ساڵانی جەنگدا چوار جار کنێسەتەکەیان تاڵان کرد، ماتان بەردەوام بەدەم پەیکەرتاشییەوە تفەنگێکی لە شاندا بوو، دوو جار چەند چەتەیەک هاتنە حەوشەکە و بانگیان کردین، کە ڕووت ببینەوە و خۆمان بدەین بە دەستەوە، هەڕەشەی ئەوەیان لێ دەکردین، ئاگر لە ماڵەکە بەر دەدەن، کاتێک ماتان لە پەنجەرەوە ڕووی تفەنگی تێ کردن و تەقەی لێ کردن، چەتەکان هەڵهاتن و ئیتر نەمان بینینەوە.

ئەو چەند ساڵەی لە کەرکووک نەخۆشیی سکچوون و ڕشانەوە لە ئارادا بوو، بەڵا و دەرد تاکو ناو حەوشەی ماڵی ماتان هاتبوو، داوای لێ کردم ئاوی بیرەکە نەخۆمەوە و لەجیاتی ئاو تەنها شەراب بخۆمەوە، ئیتر منیش هەموو ئەو ڕۆژە سەختانەی ساڵانی جەنگ و گرانیم بەمەستی گوزەراند.

شەوێک لە نیوەشەوا لە دەنگی هاوار و بانگی ماتان بەخەبەر هاتم، بینیم لەبەردەم دەرگای ڕاڕەوەکەدا وەستابوو، تفەنگەکەی بەدەستەوە و لەپەسا لەبەرخۆیەوە هاواری دەکرد، 'کوڕە کێی زەلام؟'

گوێم لێ بوو کەسێک لەودیو دەرگاکەوە بەنووزەنووز بانگی کرد، 'لێقەومیاوم، خاتر خوا قاپیم لێ وەکە!'

لەو کاتەدا ماتان بەهێواشی بە منی وت، تاکو بچم لە پەنجەرەی ژووری دارتاشییەکەوە لێی بڕوانم و بزانم کێیە و ئاخۆ بەتەنها خۆیەتی.

کاتێک چووم و لەوێوە لێم ڕوانی، لەبەر ڕوناکیی مانگەشەوەکەدا کابرایەکی ڕوتەڵەی کورتەباڵام بینی، زیاتر لە ناو حەوشەکەم ڕوانی، نەوەک بە پلان بێت و بیانەوێت بەو جۆرە پەلامارمان بدەن، کاتێک گەڕامەوە بۆ لای ماتان و دەرگاکەمان لێ کردەوە، کابرای غەریب بەسەر دەست و پێی ماتاندا کەوت و دەستی کرد بە پاڕانەوە، کابرا وتی، ئەو خەڵکی شاری مەریوانە و عوسمانییەکان چەند مانگێک پێش ئەو ڕۆژە لە شاری مەریوانەوە بە پێ بۆ شاری کەرکووک هێنابوویان، دوای ئەوەی لە سەربازگەیەک ڕاهێنانیان پێ کردوون، ئامادەیان کردوون بۆ ئەوەی بۆ سەفەربەلیک بیاننێرن، ئەویش ئەو شەوە فرسەتی هێنابوو و هەڵهاتبوو، کابرا وتی ناوم ستار حەسەنە، کاتێک هێنامانە ژوورەوە و ماتان دوو پارچە نانی بۆ هێنا، ستار حەسەن داوای جامێک ئاوی لێ کردین، ماتان دەستی خستە سەر شانی و پێی وت، 'ئاوی خاوێن شک نابەین، بەڵام شەرابمان هەیە!'

'شـەڕاب، ئـەم دنیام لەکیس چـووە، تۆخوا بۆ ئەودونیایشم لەدەست دەرناکەیت، وەڵا حەرامە و نایخۆم.'

'ئەرێ ڕێبوار، ئەوە نییە بۆ ئەوەی ئەم دنیات لەکیس نەچێت لە ترسی مـردن لەدەست تورکەکان هەڵاتووی، ئەگەر تۆ وەکو هاودینەکانت باوەڕت بەودونیات هەبوایە ئەوا لەگەڵ تورکەکان بۆ جیهاد دەچوویت، دیارە باوەڕت لەقە بۆیە هەڵاتوویت!'

'نا بەخوای منداڵم وردە و بۆیە هەڵاتووم!'

'ئینجا من ئەوانەی نازانم، شەرابمان لەگەڵ دەخۆیتەوە باشە، نایخۆیتەوە هەر ئێستا دەتبەمەوە بۆ بەردەستی تورکەکان، ئیتر

کەیفی خۆتە، لای من ئەوەی ناخوات، ئیتر یەکێکیان هەڵبژێرە، خوا یان شەراب.'

'برا دەخیلتم وای نەڵێیت، کورە بەخوای نەک شەڕاب ئامادەم گوی بخۆم، بە مەرجێک لەدەستی ئەو تورکە زاڵمانە ڕزگارم بێت و وەگەڕێم بۆ ولات و مەسکەنی خۆم.'

ماتان جامێک شەرابی بۆ تێ کرد و لەبەرخۆیەوە بە ستار حەسەنی وت، 'خۆم زانیم یەکجار ئەوەندە دەربایسی ئەودنیات نیت و بۆت دەر کەوتووە ئیدعای قیامەت هەمووی تەئسیری هەوەسە و درۆ و دەلەسەیە!'

ستار حەسەن قومێکی لە شەرابەکە دا و لەبەرخۆیەوە وتی، 'بە خودای شەڕابی چاکە.'

ماتان دەستی خستە سەر شانی و لێی پرسی، 'بۆ پێشتر شەرابت خواردۆتەوە؟'

'ئای بێقەزا بیت، حەیفت نەکرد، دەی چۆن!'

'دەی بۆچی جەنابت لە سەرەتاوە خۆت لێ کردبووم بە ئەسحابە؟'

'ئێ ئاغا گیان چیی بکەم، گۆتم نەوەکی خوا نەکات بێڕێزی بێت بە جەنابتان.'

ستار حەسەن بێ ئەوەی ئێمە پرسیارمان لێ کردبێت لەبەرخۆیەوە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و باسی ئەوەی بۆ کردین، کە تورکەکان پیاویان لە ناوچەی مەریواندا نەهێشتووە، هەموویان وەکو مێگەل پێش خۆیان داوە و بۆ کەرکووک و مووسڵیان هێناون، دوای ئەوەی مانگێک و دووان فێریان دەکەن چۆن بتوانن تفەنگ بتەقێنن، پاشان بەکۆمەڵ ڕەوانەی سەفەربەلیکیان دەکەن، ستار حەسەن باسی لەوە دەکرد، کە برا و برازا و هەموو ئامۆزاکانی

ڕەوانـەی سەفەربەلیک کـراون، بە قسـەی ستار حەسەن بێت لە تەواوی ناوچەی مەریواندا تەنها ئافرەتەکانیان لە ماڵەوە ماون.

ڕۆژی دوای ئەو شەوە، کاتێک لەگەڵ ماتان لە خەون بەخەبەر هاتین، سەیرمان کرد ستار حەسەن ڕۆیشتبوو، لە ماتانم پرسی، 'ئەبێت ئەو پیاوە بۆ کوێ چووبێت؟'

ماتان لەژێر لێوەوە وتی، 'بەخوا کەریت، قابیلە بۆ کوێ چوبێت، دڵنیام لە ترسی خوا بۆ لای تورکەکان گەڕاوەتەوە!'

لەو ڕۆژانەدا شەوان لەگەڵ ماتاندا ئەوەندە شەرابم دەخواردەوە، بەیانیان بە لارولەنجە و گۆرانیوتنەوە بۆ کنێسەت دەچووم، جارێکیان شارۆنی حاخام پێی وتم، 'تۆیش خوڵقەتی ماتانی دارتاشت گرتووە و گاڵتەت بە دنیا و دین دێت.'

ڕۆژی یەکی مانگی ئازاری ئەو ساڵە شارۆنی حاخام هەموو قوتابییەکانی یەشیڤای نـاردەوە ماڵەوە، لەبیرم دێت پێی وتین، 'باشترە هەموو لە ماڵی خۆتان بن، چونکە بە برسێتی و نەخۆشی دەرستان پێ ناخوێنرێت!'

لـەدوای ئەو ڕۆژەوە یەشیڤاکە تەنها من و ئەلیاسی برازای حاخامی لێ ماینەوە، کاتێک ئەو ڕۆژە لە یەشیڤا گەڕامەوە، ماتان پێی وتم، 'بۆ بەرچاییی ئێوارە موشووری خۆت بخۆ و من لەو دەشتە قارچکم بۆ خۆم هێناوە.'

لە وەڵامدا پێم وت، 'قارچک، منیش حەزم لێیەتی!'

بەتووڕەییەوە پێی وتم، 'نا، نا، ئەوە خواردنی تۆ نییە!'

وەکـو پیشـەی دایمیمان دوانـیـوەڕوان کاتێک لـە کنێسەت ئەگەڕامەوە، لەگەڵ ماتان لەسەر پارچە دارێک کاری پەیکەرتاشیمان دەکـرد، دەستم بە گرتنی شفرە و چەقۆکان ڕاهاتبوو، تاشینی فۆرم و فیگورەکان فێر بووبووم، هەرچەندە هاوشێوەی ئەو لای

ڕاستیانم جیاواز لە لای چەپیان دەتاشی، بەڵام ماتان دەیوت، ئەوە کێشەی ئەوەیە، کە من لە سەرەتاوە تاکو کۆتایی بەوردی سەرنجم لەسەر فیگور و فۆرمەکان ڕاناگرم و بۆ کاری پەیکەرتاشی جارێکا خەیاڵم پەرتە، بەتایبەتی، کاتێک دەمەوێت ئەو فۆرم یان فیگورەیەی لە خەیاڵمدا ئامادەم کردووە ئیشی لەسەر بکەم و وەکو خۆی بیگەیەنم، هەروەها ماتان بەردەوام دەیوت، 'ڕووناکیی هەموو فۆرم و ڕەنگەکان دەخولقێنن!'

ماتان ئەو ڕۆژە زۆر بێدەنگ بوو، تەنها ئەوەندە نەبێت زوو زوو لەبەرخۆیەوە دەیوت، 'تاقەتم نەماوە و کۆتاییی بەم ژیانە بێمانایە بێنم باشترە!'

بەسەرنجەوە لێم ڕوانی، 'چۆن، چۆن؟ مەبەستت خۆکوشتنە؟'

'بێگومان؟'

'کورە شتی ئاوا مەڵێ، خۆکوشتنی چی و شتی چی!'

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بێ ئەوەی لێم بڕوانێت پێی وتم، 'حەیاتم ئیتر خۆم ئاوام گەرەکە!'

دوای ئەوەی ئەمەی پێ وتم، گەڕا و ئەو پەیکەرەی کە بە پۆرتریتی خۆی ناوی دەبرد، هەڵی گرت و بۆ ژێرزەمینەکە چوو، کاتێک چووم بۆ لای و بینیم، دانیشتبوو پەیکەرەکەی بەرامبەر خۆی دانابوو، زوو زوو بە جامێک شەرابی دەخواردەوە، کاتێک چووم لە لای پەیکەرەکەوە دانیشتم، کە لە شێوازدا لە کەمتیارێکی دووگیان دەچوو، ماتان بەئەستەم دەیتوانی لێم بڕوانێت و بەردەوام بە لای ڕاست و چەپیدا دەکەوت، لەپەسا قومی دەدا لە شەرابەکە و لەگەڵیدا پارچەیەک لە قارچکەکەی دەخستە دەمی، چەند جارێک ئەوەی دووبارە کردەوە و پێی وتم، 'ئەڵێم خایم، ئەو پەیکەرە پۆرتریتی خۆمە!'

پاشان زۆر بەسستی لەبەرخۆیەوە پێکەنی و بەردەوام بوو و پێی وتم، 'کورە گوێم لێ بگرە. ئەو قارچکە خواردنی تۆ نییە و لێی نەخۆیت!'

ئەوەی ڕاستی بێت لەو کاتەدا ئەوەندی تر قارچکەکەم لەلا شیرین بووبوو، چاوەڕوانی ئەوە بووم، ماتان چاو دابخات و منیش تامی قارچکەکە بکەم، پاشان پێی وتم، 'ئەمە قارچکی دۆمبەلانی حەمرینە و لە هەزار دانە دانەیەک یان دوانی لە سروشتەوە پڕە لە زەهر، باوەڕم پێ بکە سەگیش بۆنی پێوە ناکات و خۆی لێ دەپارێزێت، بەلام بۆ ئێستای من دەوایە!'

تاوێک بوو بێدەنگ لێی دەڕوانیم، لەژێر لێوەوە بە دەنگێکی کز پێی وتم، 'باوکم لێرەدا نێژراوە، دوایی منیش لێرە بنێژە و با یەکێک لەو گۆزەی شەرابانە کێلی قەبرەکەم بێت.'

دوای ئەوەی ئەمەی وت، چاوی داخست و دەمی کەفێکی سپدی لێوە هاتە دەر، دەستی بەسەر دڵیەوە گرت و لەسەر پشت ڕاکشا.

لەو کاتەدا لە جامۆلکەی قارچکەکەم ڕوانی، لە بەینی ڕانەکانیدا بەبەتاڵی کەوتبوو، ئەوەی ڕاستی بێت، لەو کاتەدا چاوەڕوانی بووم تاکو هەڵسێتەوە، لە خەیاڵی خۆمدا بیرم لەوە دەکردەوە، ئاخۆ ئەو ڕۆژە چ جیاوازییەکی لەگەڵ ڕۆژەکانی تردا هەبوو، قاچی تاکو بەردەمی من ڕاکێشابوو، لە سەرەتاوە بە خۆمم وت، 'لەوانەیە خەوتبێت، یان وەکو پیشەی دایمی، دوای کاتژمێرێک خەوتن هەڵسێتەوە و دیسان دەست بە شەرابخواردنەوە و پەیکەرتاشین بکاتەوە!'

نووکی پێلاوەکەیم گرت و توند ڕاموەشاند و چەند جارێک بانگم لێ کرد، لەبەر ورگە هەڵئاوساوەکەی دەموچاوی ماتانم لێوە دیار نەبوو، کاتێک ڕاست بوومەوە و بینیم، بەر چاوەکانی شین

هەڵگەڕابوون و هەموو سەرسنگ و ملی کەفێکی لینجاوی سپیی پیا ڕژابوو. دیسان چەند جارێک ڕاموەشاند و بانگم لێ کرد، سەرم لەسەر سنگی دانا و بۆ چەند هەناسەیەک گوێم لە ترپەی دڵی گرت، دوای ئەوە بەڕاکردن چووم بۆ کنێسەتەکە و شارۆنی حاخامم لێ ئاگادار کردەوە، کاتێک لە ڕێگا باسی ڕووداوەکەم بۆ حاخام گێڕایەوە، لێی پرسیم، 'چیی خواردووە؟'

ئەو قارچکەی ماتان ناوەکەی پێ وتبووم، هەرچەند هەوڵم دا نەکەوتەوە یادم، کاتێک من هێشتا لە بیرکردنەوەدا بووم، حاخام وتی، 'قارچکی دۆمبەلانی حەمرین؟ ئەگەر ئەوەی خواردبێت، ئەوە ماتان بەئاگاییەوە ئەوەی کردووە و مەبەستی خۆکوشتن بووە!'

کاتێک پێکەوە گەیشتینە ژێرزەمینەکە و لە ماتانمان ڕوانی، وەکو مانگێک بێت لەوێدا گیانی دەر چووبێت، پێستی ڕەش هەڵگەڕابوو، لووت و گوێکانی خوێنیان پێوە بوو، شارۆنی حاخام بێ ئەوەی هیچ هەوڵێکی لەگەڵدا بدات، بەسەریەوە وەستا و دەستی کرد بە نزاخوێندن.

پاشان زۆر لە شارۆنی حاخام پاڕامەوە، تاکو هاوکاریم بکات و وەسیەتەکەی ماتان بهێنینە دی و لەتەنیشت باوکیەوە و لە ماڵەکەی خۆیدا بینێژین، ئەوەم دەزانی، کە شارۆنی حاخام نەک هەر بەوە ڕازی نەبوو، بەڵکو چارەی ماتانی نەدەویست و خۆی و باوکی بە لادەر لە دیانەتی جوو دەبینی، پاشان لەگەڵ حاخام چووین پاچ و خاکەنازمان هێنا و لە ژێرزەمینەکە و لەنێوان گۆزەی شەرابەکاندا چاڵمان بۆ هەڵکەند و ناشتمان، شارۆنی حاخام بەردەوام لەبەرخۆیەوە نزای دەخوێند، منیش هەوڵم دەدا تاکو بتوانم دیمەنی ماتان بەمردووی لە خەیاڵی خۆمدا بسڕمەوە.

چەند ڕۆژێک بەتەنیا بەدیار گۆڕەکەی ماتانەوە دانیشتم و

بەدەم شەرابخواردنەوەوە بیرم لەو جۆری خۆکوشتنە دەکردەوە، زیاتر بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ بۆچی کەسێکی وەکو ماتان، خۆی ڕەوانەی دۆزەخ دەکات، وەکو چۆن حاخام ئاوای پێ وتم.

کاتێک باوکم لەگەڵ مامە سلێمان و دوو خزمی ترماندا گەیشتن، حەفتەیەک بەسەر مردنی ماتاندا تێپەڕیبوو، دیار بوو بێئاگا بووم لە کات و بە درێژاییی ئەو حەفتەیە بەمەستی بەدیار گۆڕەکەی ماتانەوە دانیشتبووم، ڕۆژی مردنەکەی ماتان شارۆنی حاخام جوابی بۆ مامە سلێمان ناردبوو.

باوکم و مامە سلێمانم لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا ماڵ و کەرەستەکانیان هەراجفرۆش کرد و لە حەوشەی ماڵەکەیدا ئاگریان لە پەیکەری پاشا و شێخ و مەلا و واعیز و ژنە ناودارە ڕووتەکان بەر دا.

بەدیار ئاگرەکەوە دانیشتم تا پەیکەرەکان سووتان و بوون بە خۆڵ، لە پرچ و مەمک و ڕانی ڕووتیانم دەڕوانی، نازانم عەشقی کام لە ژنە ڕووتەکانی ماتان بووم، وا بزانم مەستوورە بوو کە بەردەوام هەوەسم لێی هەڵئەستا و خۆمم پێ ڕەحەت دەکرد.

پاشان باوکم و مامە سلێمانم و ئەو دوو پیاوەی لە سلێمانییەوە هاتبوون، ئەو چەند ڕۆژە بەردەوام لە ژێرزەمینەکە خەریکی شەرابخواردنەوە بوون، پاشان گۆزە و دیزەکانیان بە بازرگانێکی مەسیحی فرۆشت، پیاوەکان شەرابیان لە مەشکە کرد و نایان لە کۆڵیان، منیش کەرەستەی پەیکەرتاشییەکەی و ئەو پەیکەرەی بە پۆرتریتی خۆی ناوی دەبرد کردمنە توورەکەیەکەوە و ڕاست و چەپ کردمە کۆڵم، پەیکەرەکە لە پێشچاوی مندا زیاتر لە کەرێک دەچوو، کە بە پێوە وەستابێت و سکی پڕ بێت، ئەوەی ڕاستی بێت

هیچ ئەندامێکی لەشی نەدەچووەوە سەر ماتان، ماتان خۆی دەیوت، 'ئەوە پەیکەری خۆمە، وەکو چۆن لە خەیاڵ و خەونەکانمدا خۆم ئەبینم!'

لە ڕێگەی قەرەداغەوە لە ترسی چەتە و ڕێگر دێ بە دێ دەڕۆیشتین، سێ ڕۆژمان پێ چوو تاکو گەیشتینەوە سلێمانی.

## ٦

مەینەتیی سالآنی جەنگ و گرانی، دانیشتووانی گەڕەکی جوولەکەی کردبوو بە خزم و دۆستی نزیکی یەکتری، ژن و منداڵەکان بووبوون بە لێپرسراو و گەورەی ماڵ، ئەو پیاوانەی تاعوون و ڕشانەوە نەیکوشتبوون یان لەلایەن تورکەکانەوە دەستگیر نەکرابوون، لە ژێرزەمینەکاندا وەکو جرج و مشکی ناو زێرابەکانی شار ئەژیان، خەڵکی گەڕەکەکانی تری شار تەواو لێک دابڕابوون و کۆلآنی گەلێک لە گەڕەکەکان چۆڵ بوون و دەرگای زۆربەی ماڵەکانی شاری سلێمانی داخرابوون. گەڕەکی جوولەکان بێجگە لە بۆگەنی شیوەکە بەردەوام بۆنی لاشەی مردووی لێ دەهات، چەند جارێک پیاوان کۆ بوونەوە و یەک بە یەکی ماڵەکان گەڕان، لە بیرم دێت مامە سلێمان دەیوت، 'مەگەر بارانێکی زۆر و لافاوێکی بەهێز ئەو بۆگەنەمان لەکۆڵ بکاتەوە.'

مامە سلێمانم لە کاتێکدا ئەمەی وت، کە شیوەکە چەندین لاشەی مردووی تێدا بوو.

لەگەڵ خامێ و سیمانە تەنها گەنج بووین لە گەڕەک مابووینەوە، ئەوانی تر مردبوون یان لەلایەن تورکەکانەوە دەستگیر کرابوون و بۆ سەفەربەلیک نێردرابوون، لەبیرم دێت ئێمەش چەند مانگێک لە ژێرزەمین نەهاتینە دەرەوە و ڕووناکیمان نەبینی، چونکە سەربازە تورکەکان بەردەوام بە گەڕەک و ناو بازاڕدا دەگەڕان و ئەو کەسەی دەستی تفەنگی بگرتایە دەستگیریان دەکرد، مەلاکان چاوساغ

و داردەستی سەربازە تورکەکان بوون و ماڵ بە ماڵ لەگەڵیاندا دەگەڕان، ئەو کەسانەی دەستگیر دەکران ڕەوانەی سەربازگەکانی کەرکووک و مووسڵیان دەکردن، بێجگە لەوەیش ئەو ماڵەی لە دوو ژەم زیاتر خواردنی تێدا بووایە لێیان دەسەند و بۆ بەرەکانی جەنگیان دەنارد، لەو چوار ساڵەی سەردەمی گرانی و جەنگدا، گەلێک لە شێخ و مەلاکانی شاری سلێمانی لەلایەن سوڵتانەوە خەڵات کران، هەندێکیان بە مەدالیای زێڕ و ئەوانی تر دوای جەنگ خەرجیی چوونی حەجیان بۆ کرا.

گەلێک جار مامە سلێمانم بە من و یاقووبی کوڕی دەوت، 'ڕۆڵە خۆتان لە چاوی مەلا و شێخەکان بپارێزن، بۆ دەستەبەرکردنی بەهەشت یان بۆ ئافەرینێک لای خەلیفە تورکەکانیان بەگرتتان دەیەن.'

•

زۆربەی خەڵکی شار و دێهاتەکانی کوردستان خۆیان لە ڕیزی لەشکری شێخ مەحموودا ناونووس کردبوو، ئەو ڕۆژەی لەشکر لە سلێمانییەوە بەرەو پێنجوێن کەوتە ڕێ، ئیتر هەموو ئەو کەسانە بوون کە ڕشانەوە و تاعوون زەفەری پێ نەبردبوون، چەند ڕۆژێک پێش ئەو ڕۆژە مەلاکان لەناو خەڵک و لە بڵندگۆی مزگەوتەکانیانەوە خەڵکیان بۆ غەزا بانگهێشت دەکرد، دەیان وت، هەرچ کەسێک بە خوێن بەشداری ناکات، ئەرکی سەرشانیەتی بە ماڵ بەشدار بێت، چەند جارێک بە جارڕدان بەناو بازاڕ و کووچە و کۆڵانەکاندا گەڕان، کاتێک هاتن بۆ گەڕەکی جوولەکان، موشێی عەتار بەناوی جووەکانەوە قسەی لەگەڵ کردن، پاشان لە کنێسەتەکە بە دانیشتووانی گەڕەکی جوولەکانی وت، 'وەکو پشتگیرییەک بۆ لەشکرەکەی شێخ و چوونیان بۆ غەزا لە دژی ڕووسەکان، داوای

پێنج لیرەی زێڕیان لێ کردووین، بۆ پەیداکردنی ئەو بڕە لیرەیە دوو ڕۆژیان مۆڵەت پێ داوین.'

کاتێک موشێی عەتار لە کنێسەت ئەمەی وت، من خۆم لەوێ بووم، پاشان حاخام بە خەڵکەکەی وت، 'ئێمەی جوو، لە تەرەفی شێخ مەحموودا بین لە لایەنگریی تورکەکان باشترە!'

ئێوارەی ڕۆژی نەورۆزی ئەو ساڵە، جادە و کۆڵانەکانی شار چۆڵ بوون و دەرگای زۆربەی ماڵەکان داخرابوون و لە هیچ جێگایەک دووکەڵی ئاگرم نەبینی، ڕۆژی دوای ئێوارەی نەورۆز لەگەڵ سیمانە و خامێدا بە پێ و گرداوگرد چووین بۆ سەر کانییەکانی سەرچنار، خەڵکی شار ئەوەی گرانی و تاعوون نەیکوشتبوو یان لە غەزا گەڕابوویەوە لەوێ بوو، گرانی و تاعوون هێشتا بەرۆکی خەڵکی شاری سلێمانیی بەر نەدابوو، بەدەگمەن دەتبینی کەسێک پۆشاکی نوێی پۆشیبێت، دەتوت ئەو خەڵکە هەموو لە مردن گەڕاونەتەوە، زۆرینە ڕەنگزەرد و لاواز بووبوون و پێستیان بە ئێسقانیانەوە نووسابوو.

لە دامێنی کانییەکانەوە و لەسەر سەوزایی و بەرزاییەک، چەند کەسێک خەریکی ڕاخستنی فەرش و بەڕەی ڕەنگاوڕەنگ بوون، لە تەنیشتی ئەوانەوە دوو پیاو چەند مەنجەڵێکیان لەسەر سێپا دانا و ئاگریان لەژێردا کردنەوە، زۆری پێ نەچوو بۆنی قرچاندنی پیاز و ڕۆن و کولانی گۆشت ئەو خەڵکەی هەموو سەرسام و بێدەنگ کرد، هەموومان بیست کەسێک ئەبووین و پێکەوە بۆنی خواردنێکمان ئەکرد، کە ساڵانێک بوو کەسمان بۆن و تاممان نەکردبوو، وەکو کەمتیار لووتمان لە حەوادا هەڵخست، هەموومان بەڕاکردن چووین و چواردەورمان لە مەنجەڵەکان دا، زۆری پێ نەچوو چەند پیاوێکی

تفەنگلەشان پەیدا بوون و ڕووی لوولەی تفەنگەلانیان تێ کردین، من و سیمانە و خامێ پێش هەموویان دوور کەوتینەوە و چووین لە کەنارەوە وەستاین و لە دوورەوە لێمان دەڕوانین، پیاوە چەکدارەکان لەگەڵ چەند گەنجێک بەشەڕ هاتن و پەلاماری یەکتریان دا، پاشان دەیان سواری تفەنگلەشان گەیشتن و خەڵکەکەیان لەو ناوە دەر کرد، من و هاوڕێکانم لە شێخ مەحموود دەگەڕاین، زۆربەیان جامانە و مشکیی تێکەڵیان بەستبوو، ڕانکوچۆغە لەبەردا و ڕاست و چەپ فیشەکدانیان لەخۆیان دابوو، هەموو سمێڵشۆڕ و ڕیشتاشراو بوون، سیمانە دەیوت، گوایا ئەو پێشتر شێخ مەحموودی بینیوە و دەیناسێتەوە و شێخیان لەگەڵ نییە.

من و خامێ پێمان وا بوو یەکێک لەو چەندین پیاوەی خەنجەریان بە بەر ورگەوە بوو لەوانەیە شێخ مەحموود خۆی بێت، تفەنگلەشانەکان و پیاوانی شێخ مەحموود زیاتر لە سەد کەسێک دەبوون، سفرەیان بۆ داخرا و چوارمشقی لێی دانیشتن و ئێمەیش لە دوورەوە لێمان دەڕوانین.

لەو کاتەدا حەمەجان سەلیم و کوڕێکی زەردەڵەی لاواز لە بەردەمماندا قوت بوونەوە، کوڕەکە بە تەمەن زۆر لە ئێمە گەورەتر دیار بوو، دوای ئەوەی چۆنی و چاکیمان کرد، هاوڕێکەیان بە ناوی خەلیل ئیسحاق خۆی پێ ناساندین، حەمەجان سەلیم لە پێشچاوی هەمواندا لێی ڕوانیم و بەپێکەنینەوە لێی پرسیم، 'بووی بە حاخام؟'

نازانم لەوێدا چ وەڵامێکی حەمەجانم دایەوە، دوای ئەوەی چەند جارێک خەلیل ئیسحاق بەملاولای خۆیدا ڕوانیی، لەژێر لێوەوە پێی وتین، 'ئەمانەوێت جەمعییەک دابمەزرێنین!'

حەمەجان لە ئێمەی ڕوانی و وتی، 'بۆ دەستگیرۆیی کردنی لێقەوماوانی شار.'

خامێی موشێی عەتار دەستی خستە سەر شانی حەمەجان سەلیم و پێی وت، 'کام فەقیر؟ بۆ فەقیر لەم شارەدا ماوە تاکو دەستگیرۆییان بکرێت، یان ئێوەیش خەریکی کۆکردنەوەی ترپوتفاقن بۆ شێخ و خەلیفە تورکەکانتان!'

'نەخێر، برا رۆحی میللیی ئێمە ئەوەندە لاواز نییە تاکو تەنها بیرمان لای ورگ و باخەڵی خۆمان بێت.'

سیمانە لەژێر لێوەوە وتی، 'ئەگەر مەبەستتان حاسڵکردنی بەهەشتە، ئەوا بە بەرتیل بەدەست نایەت!'

حەمەجان دەستی خستە سەر شانی من و لێی ڕوانیم، پاشان بەردەوام بوو و وتی، 'خایم من باش دەناسێت!'

لە دەنگی شریخەی تفەنگەکان ڕاچڵەکین و هەموو بێدەنگ لە مەجلیسی شێخانمان دەڕوانی، چەند تفەنگچییەک ڕووی لوولەی تفەنگەکانیان کردبووە حەوا و چەند فیشەکێکیان تەقاند. کاتێک ئەوان لەسەر سفرەکان هەڵسان و دەستیان لە خواردن گرتەوە، بە لای ئێمەدا و بە کەناری جۆگەی ئاوەکاندا دەستیان کرد بە پیاسەکردن، خەلیل ئیسحاق، لەبەرخۆیەوە وتی، 'جەنابی شێخ مەحموودیان لەگەڵ نییە.'

کاتێک ئەوان لێمان دوور کەوتنەوە، بێجگە لە ئێمە و حەمەجان و هاوڕێکەی، ئیتر تەواوی ئەو خەڵکەی لەوێدا ئامادە بوون، بەڕاکردن چوون و پەلاماری بەرماوەی خۆراکی سەر سفرەکانیان دا، بینیم چۆن ئەو گەنجانە بە چنگ برنجیان ئەکردە گیرفانی شەرواڵەکانیان، پاسەوانی سفرەکان بەسەرسوورمانەوە لێیانیان دەڕوانین، کاتێک لەسەر پاشماوەی خواردنەکان بوو بە شەڕ، چەند پیاوێکی تفەنگەشان خەڵکەکەیان لەسەر سفرەکان دوور خستەوە، خەلیل ئیسحاق لەبەرخۆیەوە وتی، 'بۆ ئەوەی ئێوە لە جەمعییەکەدا

ببنە ئەندام، پێویستە لە پێشا زمانی کوردی بخوێنن.'
سیمانە هەڵی دایە و وتی، 'ئەوە نییە ئێمە بەکوردی قسان دەکەین!'
حەمەجان سەلیم باسی ئەوەی بۆ کردین، کە مەبەستی هاوڕێکەی لە خوێندنی زمانی کوردی تەنها ئاخاوتن نییە، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە ئێمەی گەنج فێری نووسین و خوێندنەوەی زمانەکەی خۆمان ببین.
خامێ وتی، 'نا برا، ئێمە دەمێکە نووسین و خوێندنەوە بە زمانەکەی خۆمان دەزانین!'
'کوڕە ئێوە تاوەکو تورکی و عەرەبی وێستابێت چیتان لە کوردی داوە؟'
سیمانە کاتێک ئەمەی وت، خەمەجان سەلیم و خەلیل ئیسحاق بەسەرنجەوە لێیان دەڕوانی، پاشان حەمەجان دەستی خستە سەر شانی و پێی وت، 'تورکی و عەرەبی زمانی عیلم و مەعریفەتە و بیان زانیت زەرەر ناکەیت!'
'مەگەر بۆ ئێوە، ئەگین ئەو عیلم و مەعریفەتەی تۆ باسی لێوە دەکەیت، عەرەب و تورک لە کتێبەکانی ئێمەوە وەریان گرتووە!'
دوای ئەوەی من ئەمەم بە حەمەجان وت، هەمووومان تاوێک بێدەنگ بووین و لە چواردەوری خۆمانمان دەڕوانی، پاشان خەلیل ئیسحاق باسەکەی گۆڕی و هاتە سەر باسی سوپای عوسمانی و ئەو جەنگەی ئەوسا لە ئارادا بوو.
خامێ پێی وت، 'ماڵتان بە قوڕ بگیرێت، ئێستا کەی کاتی تورکچێتی و دامەزراندنی جەمعییەیە، ئێمە هاتین تاوەکو تۆزێک بۆنوبەرامی گووی شێوەکەی گەڕەکمان لە لووت دەرچێت!'
من و سیمانە دامانە قاقای پێکەنین و حەمەجان و خەلیل ئیسحاق

بەسەرنجەوە لە خامێیان ڕوانی، پاشان بووین بە دوو دەستەو قۆڵمان کرد بە قۆڵی یەکتریندا و بەناو خەڵکەکەدا پیاسەمان دەکرد، حەمەجان سەلیم چپاندی بە گوێمدا و پێی وتم، 'کەی ویستت لەگەڵمان بێیت بۆ وانەخوێندن پێویست بە ناوگۆڕین و دیانەتگۆڕین ناکات!'

لەو کاتەدا سەرم بۆ حەمەجان لەقاند و هیچم نەوت، کاتێک گەڕاینەوە بۆ گەڕەکی جوولەکان، بە ئەستەم بەرپێی خۆمان دەبینی، شەو داهاتبوو، لە ڕێگا لە هاوڕێکانم پرسی، 'پێتان چۆنە لە داهاتوودا نووسین و خوێندنەوە بە زمانی کوردی فێر ببین؟'

سیمانە بە قسەکەم پێکەنی و خامێ لە وەڵامدا پێی وتم، 'خۆ بۆ کار و کاسپی پێویستمان پێی دەبێت.'

حەفتەیەک دوای ڕۆژی نەورۆز بەتەنیا لەسەر دوکانەکەی باوکم بووم، ئەگەر باش لەبیرم بێت، بە درێژایی ئەو حەفتەیە دەرگای دوکانەکەی حاجی سەلیمی باوکی حەمەجان داخرابوو، دوانیوەڕۆی ڕۆژی هەینی بوو، داودی چایچی پێی وتم، گوایا چەند ڕۆژێک پێش ئەو ڕۆژە دوو پیاوی تفەنگبەشان لەگەڵ چەند حەماڵێکدا هاتوون و شتومەکی ناو دوکانەکەی حاجی سەلیم پێنجوێنییان بردووە، دەمەو ئێوارەی ئەو ڕۆژە حەمەجان هات بۆ لام و پێی وتم، 'باوکم مرد.'

پێڵوی چاوەکانی سوور هەڵگەڕابوو، بەردەوام بوو بە دەنگێکی تێکشکاوەوە وتی، 'دوکانەکەیان لێ ساندینەوە.'

حەمەجان باسی ئەوەی بۆ کردم، کە شێخ حسێنی خاوەنی قەیسەری نەقیب کەسێکی لێ ڕاسپاردوون و بە حەمەجانی وتبوو، 'ئێمە دوکانمان بە حاجی سەلیم پێنجوێنی بە کرێ دابوو، ئێستا ئەو مردووە و ئیتر ئێمە مەجبوور نین بە عەولادەکانی بە کرێی بدەینەوە.'

حەمەجان بەبێزارییەکەوە پێی وتم، 'ئەوا باوکم مرد و دوکانەکەمان لێ سەندرایەوە، ئیتر مەجبوورم لە کار و کاسبی بگەڕێم، تاکو بژێویی دایک و خوشکەکانم دابین بکەم.'

پێش ئەوەی بییەوێت بڕوات، پێم وت، 'حەمەجان، ئەڵێی چی لای مامە سلێمانم بۆ بژێوی بڕێک پارەت بۆ وەربگرم؟'

لێی ڕوانیم و بە پشتی دەستی چاوی هەڵگڵۆفی و بە دەنگێکی تێکشکاوەوە وتی، 'خۆزگە ئەو چاکەیەت لەگەڵ دەکردم، دوای ئەوەی دوکانەکەت گرت، بۆ ماڵی ئێمە لەگەڵم وەرە و گوزەرانمان ببینە، پاشان دوای نانخواردن پێکەوە بۆ ماڵی عەبدوللا ئەفەندی دەچین.'

'عەبدوللا ئەفەندی کێیە... خۆ!'

'عەبدوللا زێوەر ئەفەندیی موعەلیم.'

لێم ڕوانی و سەرم بۆ ڕاوەشاند، هەرچەندە هەوڵم لەگەڵ خۆم دا، نەموێرا گفتی ئەوە بە حەمەجان بدەم، تاکو لەگەڵیدا بچم بۆ ماڵی ئەوان و نانی ئێوارە لەوێ بخۆم، ئازای گیانم کەوتبووە سەر ئارەقەیەکی سارد و لەپەسا دەلەرزیم، تەنانەت نەمتوانی هیچ وەلامێکی بدەمەوە، داواکارییەکەی تەواوی خەیاڵمی داگیر کردبوو، بەردەوام ئەمەم لە خەیاڵی خۆمدا دەوتەوە، 'یانی منێکی جوو ئەو سنوورە دەشکێنم و بۆ یەکەم جار دەچم بۆ ماڵی موسوڵمانێک و نانی دەستی ئەوان دەخۆم؟'

کاتێک حەمەجان ویستی بڕوات، دەستم خستە سەر شانی، 'پێم بڵێ ماڵی عەبدوللا ئەفەندیی موعەلیم لە کوێیە؟ لەوانەیە خۆم شەوێ بێم بۆ ئەوێ.'

'دەرگایەکی تەختەی دووتایە و ڕێک بەرامبەری مزگەوتی حاجی حانە، لەو ماڵە کۆ ئەبینەوە و ئیتر با بەنهێنی بێت!'

ئەو ئێوارەیە کاتێک گەیشتمەوە ماڵەوە، هەواڵی مردنی سەلیم پێنجوێنیم بە باوکم ڕاگەیاند، بەبێ ئەوەی لێم بڕوانێت لەبەرخۆیەوە وتی، 'سەد شوکور ئەو ڕێوییەمان لەکۆڵ بووەوە.'

ئەو شەوە دوای نانخواردن کاتێک لە ماڵ دەرچووم، پێش ئەوەی بەرەو گەڕەکی حاجی حان بەڕێ بکەوم، چووم بۆ لای خامێ موشێی عەتار، کاتێک بۆم باس کرد بەنیازی چی بووم، خێرا خۆی کۆ کردەوە و پێشم کەوت و پێی وتم، 'دێم لەگەڵت و نایەڵم بەتەنیا بڕۆیت.'

خامێ لە ڕێگا پێی وتم، 'خەمت نەبێت، خەنجەرم پێیە و هەر بزانم نیازیان خراپە، گەورە و بچووکیان خەڵتانی خوێن دەکەم!'

باسی حەمەجان سەلیمم بۆ خامێ کرد، پێم وت، 'داوەتی کردووم بۆ ماڵی خۆیان!'

هەروەها باسی ئەوەم بۆ گێڕایەوە، کە بەتەمام لای مامە سلێمانم داوای هاوکاری بۆ حەمەجان بکەم، خامێ لە وەڵامدا وتی، 'منیش دوو ماجیدیی لە باوکم بۆ وەردەگرم!'

پاشان دەستی کرد بە پێکەنین و لەبەرخۆیەوە وتی، 'بەڵکو خوا بە خێر بۆ مامت و باوکمی بنووسێت و حەجێکیان بەقیسمەت بکات.'

پاش چەند هەناسەیەک لە مەقسەدی قسەکەی خامێ تێگەیشتم، پاشان دەستم کرد بە پێکەنین.

کاتێک بەرەو ماڵی مامۆستا عەبدوللا ئەفەندی بەڕێوە بووین، خامێ بە جۆرێک قسەی دەکرد دەتوت بۆ گۆڕەپانی جەنگ دەچێت، داوام لێ کرد تاکو بەردەرگاکە بێت لەگەڵمدا و پاشان بگەڕێتەوە، بەڵام کاتێک گەیشتینە بەردەمی ماڵەکە خۆی لێ تووڕە کردم و دەنگی لێ هەڵبڕی، منیش ناچار بووم لەگەڵ خۆمدا بردمە ژوورەوە.

حەمەجان سەلیم دەرگای ماڵەکەی کردەوە، کاتێک چووینە ژووری دانیشتنەکە، زیاتر لە بیست گەنجی هاوتەمەنی ئێمە و گەورەتری لێ بوو، چەند کەسێکم لەنێویاندا ناسییەوە، ئەوانیش فوئاد مەعرووف و خەلیل ئیسحاقی هاوڕێی حەمەجان و مامۆستا عەبدوڵڵا ئەفەندییش لەوێ بوو، هەموو بەسەرنجەوە لە ئێمەیان دەڕوانی، لەگەڵ خامێدا بەسەریاندا گەڕاین و تەوقەمان لەگەڵ هەمووواندا کرد، پاشان لای حەمەجانەوە و لە خوارووی ژوورەکەوە پێکەوە دانیشتین.

لە پڕێکدا مەلایەک و دوو فەقێ خۆیان کرد بە ژووردا و هەموو بەپەلەپەل لەبەریان هەڵسان، ویستم لە شوێنی خۆم ببزوێم و وەکو ئەو خەڵکە لەبەر مەلا و فەقێکانی هەڵسمە سەر پێ، خامێ توند دەستی گرتم و لە جێگای خۆم دانامەوە، هەرچەندە بەتووڕەییەوە لێم ڕوانی و خۆمم لێ ڕاپسکاند، نەمتوانی خۆمی لەدەست ڕزگار بکەم، هەموو دانیشتنەوە و چەند گەنجێک چوون لە بەردەمی مەلاکەدا نووشتانەوە و دەستیان ماچ کرد و دیسان بۆ جێگای خۆیان گەڕانەوە، پاشان هەموو بێدەنگ بووین و لە مەلاکەمان دەڕوانی، دوای ئەوەی تاوێک لەژێر لێوەوە و زۆر بەهێواشی چەند نزایەکی خوێند، هەردوو دەستی بەرز کردنەوە و هێنانی بە دەموچاویدا و وتی، 'ئامین.'

پاشان دەستی کرد بە ئایەتخوێندن، هەموو بێدەنگ بووین و بەسەرنجەوە لە مەلاکەمان دەڕوانی، لەو کاتەدا خامێ توند لاڕانی گوشیم و بەتووڕەییەکەوە بە زمانی تەرجوم پێی وتم، 'هەتیو تۆ منت بۆ کوێ هێناوە؟'

دەستم خستە سەر ڕانی و داوام لێ کرد تاکو بێدەنگ بێت، پاشان خامێ زیاتر دەنگی هەڵبڕی، 'ئەمە حوجرەیە یان چی؟'

کاتێک ڕووم لە خامێ وەر گێڕا، بینیم هەموو لە ئێمەیان دەڕوانی، گەنجێک بەرامبەرمان لێمان ڕاست بوویەوە و بە دەنگی بەرز هاواری لێ کردین، 'دەی خوا گەڕ و گولتان بکات.'

یەکێکی تر هەڵیدایە، گوایا چۆن وێراومانە قسە بە مەلاکە ببڕین، لە کاتێکدا حاجی مەلا عەلی خەریکی ئایەتخوێندن بووە؟

گەنجێک لە تەنیشتی حەمەجانەوە و لە ڕیزەکەی ئێمەدا دانیشتبوو، لە خەڵکەکەی ڕوانی و دەستێکی بۆ لای من و خامێ درێژ کرد و بە دەنگی بەرز وتی، 'مەگەر ئێوە جوولەکەی بێدین نەبن؟'

'کوڕە خۆو بێدینیت، نانەجیب!'

دوای ئەوەی خامێ ئەمەی بە دەنگی بەرز بە گەنجەکە وت، خامێ لە جێگای خۆی ڕاپەڕی و هەڵسایە سەر پێ، ئەوەندەم نەزانی لە چەند لایەکەوە چەند گەنجێک ڕاست بوونەوە و بەرامبەرمان وەستان، دوو فەقێکەی لەگەڵ مەلاکەدا هاتنە ژوورەوە، لە پێش هەموویانەوە پەلاماری خامێی موشێی عەتاریان دا و کەوتنە لێدانی، من و حەمەجان سەلیم و چەند کەسێکی تر کەوتینە بەینەوە و خامێمان لەژێر دەستیاندا دەر هێنا و لە دەرگای ژوورەکەوە خێرا بۆ حەوشەکە بردمان، فەقێکان و دوو گەنجی تر بۆ ناو حەوشەی ماڵەکە بەدواماندا هاتبوون، خامێ خەنجەرێکی بەدەستەوە بوو، زوو زوو بەلای ڕاست و چەپیدا دەستی ڕائەوەشاند، بواری ئەوەمان نەبوو پێڵاوەکانمان لە پێ بکەین، کاتێک حەمەجان و فوئاد مەعرووف بەریان لە فەقێ هێرشبەرەکان گرتبوو، لەگەڵ خامێدا خێرا پێڵاوەکانمان بە دەستمانەوە گرت و بەو کۆڵانانەدا بەرەوخوار ڕامان کرد، شەوێکی تاریک بوو، باران بەلیزمە دەباری و بەرپێی خۆمان نەدەبینی و چەند جارێک هەڵخزاین و کەوتین و هەڵساینەوە

و له ترساندا بەردەوام بووین له ڕاکردن، تاکو گەیشتینه ناو گەڕەکی جوولەکان چەند کەسێک بەدوامانەوه بوون و بەردەوام هاواریان لیَ دەکردین، 'ئەرەوەلا قووچانی، جوولەکەی پیس قووچانی.'

کاتێک پێکەوه له تەنیشت دیواری ماڵی ماتاندا پرزەلێبڕاو و ماندوو دەستمان خستبووه کەلەکەمان و هەناسەبڕکێمان بوو، خامیَ پێی وتم، 'ئا ئەوانه هاوڕیَ دڵسۆزەکانت بوون؟ هەی له قوونی یەکبەکیان بەم!'

'ماڵت بەقوڕ گیرێت، هەمووی خەتای تۆ بوو.'

تاوێک بێدەنگ و بەتووڕەییەوه له یەکترینمان ڕوانی، کاتێک ویستمان بەرەو ماڵەوه بڕۆینەوه، به خامێم وت، 'با به گەڵوگێپاڵی قوڕاویمانەوه نەڕۆینەوه.'

پێکەوه چووین و بەسەر دیواری ئاشەکەی مامه سلێمانمدا چووینه حەوشەی پشتەوەی ئاشەکه و له حەوزەکه خۆمان له قوڕ و لیتەی ڕێگا پاک کردەوه.

## ٧

حاخام و مامە سلێمانم بەیانیان زوو، پاشان دووبـارە شەو درەنگ ئەهاتنەوە و سەردانی باوکمیان دەکرد، ئەوان چاوەڕوانی مردنی باوکمیان دەکرد، مردنێک کە بێدەنگ بەبێ پرسی ئێمە و لەناکاو بەسەر دیواری ماڵەکەماندا بێت و دواساتەکانی تەمەنی باوکممان لێ بدزێت، یان مردن باوکم لە دەست ئازاری جەستەی ماندووی ڕزگار بکات، هەموو جارێک بە حاخام و مامە سلێمانی دەوت، 'قوربانتان بم، ئاگاتان لە خایم بێت!'

تەنها ئەوەندی پێ دەوتن، جارێک گوێم لێ نەبوو ناوی کەتانی خوشم بێنێت، یان خەمی بخوات، نەخۆشی تەواو پەکی خستبوو، بۆ دوو مانگ دەچوو لەناو جێگادا کەوتبوو، ئیشوکاری دوکانەکەمان لە ئەستۆی من بوو، گوزەرانی خەڵکی شار لە سالانی پێشوو باشتر نەبوو، بە چوار پێنج ڕۆژ بایی دوو ماجیدیم نەدەفرۆشت، ڕۆژانە ژمارەی ئەو سواڵکەر و هەژارانەی دەهاتنە بەر دوکانەکەمان لە قەیسەری نەقیب، دە قاتی موشتەرییەکان دەبـوون، بێجگە لەو چەکدارانەی بە ڕۆژی نیوەڕۆ بە ناوی شتکڕینەوە ئەهاتنە دوکان و داوای سابوون یان شەکر و چایان دەکرد، کاتێک دەهاتە سەر ئەوەی حەق و حسابیان لەگەڵدا بکەیت، تفەنگەکانیان لە شانیان دادەگرت و ڕووی لوولەکەیان تێدەکردیت.

جوولەکە دوکاندارەکانی قەیسەریی نەقیب و ئەوانەی ڕۆژانە بۆ کار و کاسبی دەچوونە دەرەوەی گەڕەکی جوولەکان، بڕیارمان دا

ڕۆژانە پێکەوە بڕۆین و کەس بەتەنیا بۆ سەر دووکان یان کارەکەی نەچێت، داودی چایچی بەردەوام هەواڵ و گوزەرانی بازاڕی بۆ دەهێنایەنەوە، من ڕۆژانە لە ماڵەوە چاوەڕوانی ئەوم دەکرد.

بەڵام باوکم بە هیچ جۆرێک بەوە ڕازی نەبوو، هەرچەندە موشێی عەتار و داودی چایچی هاتن بۆ لای و لەو بارەیەوە قسەیان لەگەڵدا کرد، گوێی لەوان نەگرت و موشێی عەتار لەگەڵ باوکمدا بوو بە شەڕیان، باوکم وتی، 'ئاگریش ببارێت تۆ دەبێت دوکانەکە بکەیتەوە، چونکە هەموو ڕۆژێک، کە دەرگای دوکانەکەت داخرابێت موشتەرییەکت لە کیس دەچێت.'

زوو زوو لەگەڵ باوکمدا دەنگمان تێک دەگیرا و دەبوو بە شەڕمان، ئیتر بچوومایە و نەچوومایە بۆ سەر دوکان، ئەو هەر ناڕازی بوو، ئێوارەیەکیان پێی وتم، گوایا من بەکەڵکی دوکانداری نایەم و یەعقووبی کوڕی مامە سلێمانم دەخاتە سەر دوکانەکەی، هەرچەندە هەوڵم دا نەمتوانی دڵی ڕازی بکەم و لەو بڕیارەی پەشیمانی بکەمەوە، ئەو ساتانەی باوکم لەناو جێگادا کەوتبوو، کەتانی خوشکم ئەوەندە ماندوو دەبوو بەدەستیەوە، لەڕ و لاواز بووبوو، ژنانی خزم و دەرودراوسێ ڕۆژانە سەردانیان دەکردین و زۆربەی ئێوارەکان خواردنمان لە ماڵی مامە سلێمان و خزمانی ترەوە بۆ دەهات.

لەناو شاری سلێمانیدا گرانی و فەقیری یەخەی خەڵکی بەر نەدابوو، نەخۆشیی ڕشانەوە و سکچوون لە ئارادا بوو، هەموو ڕۆژێک سەر قەبرانەکان بۆ شاردنەوەی مردووەکان پڕ بوو لە خەڵک، گەڕەکی جوولەکان لە هەموو گەڕەکەکانی تری شار زیاتر نەخۆشیی تێیدا بڵاو بوو، مامە سلێمان دەیوت، 'ئەو دەرد و بەڵایە

هەمووی لەو شێوەوە پێمان دەگات، ئەو شێوەی گوو و میزی هەموو خەڵکی شارە و بەناو دەمارەکانی ئێمەی جوودا تێدەپەڕێت!'

ڕۆژ نەبوو لەسەر جادە و ناو کۆڵانەکاندا لاشەی مردوو نەبینیت، شێوەکەی بەر ماڵی ئێمە لاشەی ژن و منداڵ و پیری لەگەڵ خۆیدا ئەهێنا، ماڵێک لەسەر شێوی قازی، کە یەکێک بوو لەو ڕیزە ماڵەی ئێمە ڕۆژانە لە بەردەمیەوە بۆ ناو بازاڕ پێیدا تێپەڕ دەبووین، کاتێک دەگەیشتینە بەردەمی ماڵەکە، بە لچکی مشکییەکانمان دەمولووتمان توند هەڵدەبەست، ڕۆژێک داودی چایچی وتی، گوایا خێزانێکی پازدە کەسی لەو ماڵەدا بوون و ئەوە بۆ زیاتر لە شەش مانگ دەچێت هەموویان مردوون و کەس پێی نەزانیون.

بە درێژایی ئەو ساڵە بێجگە لە ساوەر و پیاز هیچی ترمان نەخوارد، ئەویش ماڵی ئاشەکەی مامە سلێمان ئاوا بێت، خۆم چەند جارێک بەدیاریەوە بووم، کاتێک خەڵک بۆ هاڕین باراشیان دەهێنا، لەبری ئەوەی پارەیان لێ وەر بگرێت، کیلۆیەک یان دووان یان زیاتر گەنم و جۆی لە جیاتیی حەقدەست لێ وەر دەگرتن، بەو جۆرە ڕۆژانە بە زیادەوە بەشی خواردنی ماڵی ئێمە و خۆیانی دابین دەکرد، بێجگە لەوەی ژێرزەمینەکەی ئێمە زیاتر لە دە فەردەی گەورە گەنم و نیسک و نۆکی لێ بوو، باوکم هەموو ڕۆژێک چاوی لێ سوور دەکردمەوە و هەڕەشەی ئەوەی لێ دەکردم، کە لای کەس باسی نەکەم و بەشی کەسی لێ نەدەم، هەروەها دەیوت، 'بۆ ڕۆژی ڕەش بەکەڵکمان دێت.'

حەمەجان سەلیم بەیانیان دەهات بۆ خانی وڵاخەکانی قەیسەریی نەقیب و ئیشی حەماڵیی دەکرد، بەدزییەوە زوو زوو سەردانم دەکرد و پێکەوە دەچووین لای داودی چایچی دادەنیشتین، داود

ڕۆژێکیان پێی وتین، 'ئەرێ پێم نالێن ئێوە چ خوایەک کردوونی بە ڕەفیقی یەکتری؟'

حەمەجان سەلیم بەبێ وەستان لە وەلامدا وتی، 'خوای ئینسان!'

لەو کاتەدا داودی چایچی بە پەڕۆیەک تەپلەکەکەی بەردەممانی پاک کردەوە و لەبەرخۆیەوە وتی، 'خوای چیی؟'

دەستم خستە سەر دەستی داود و بەپێکەنینەوە پێم وت، 'ئەرێ پێم نالێیت داود، تۆ چاییچیت یان خواچی؟'

داود دایە قاقای پێکەنین و پاشان بۆ بەردەم وەجاخ و سەماوەرەکەی گەڕایەوە.

لەناو شاری سلیمانیدا نەک تەنها قەیسەریی نەقیب، بەڵکو زۆربەی دوکان و بازاڕەکان داخرابوون یان بەتاڵ و بێشتوومەک بوون، حەمەجان سەلیم هەموو ڕۆژێک لە بەیانی تاکو ئێوارە نە بارێکی دادەگرت و نە کەسێک ڕای دەسپارد کۆڵێکی بۆ بەرێت، لەو ڕۆژانەدا خوشکێکی حەمەجان بە ڕشانەوە مرد، من و خامێ و داودی چایچی لەگەڵ حەمەجان چووین و مەیتەکەیمان شاردەوە، تەمەنی ئەو خوشکەی چواردە ساڵ بوو، حەمەجان پارەی کفنودفنی نەبوو بۆ خوشکەی بیکڕێت، ئەو ڕۆژە مەلایەکی دەست نەکەوت تاوەکو بۆ سەر قەبران لەگەڵمان بێت و تەڵقین لەسەر قەبرەکەی بخوێنێت، ئێمەش بەلامانەوە ئاسایی بوو مردوو بە جلوبەرگی خۆیەوە بنێژرێت، داودی چایچی بە حەمەجانی وت، 'ئەگەر ڕازیت ئەوا دەچم بەدوای حاخامدا، تاکو نزا بۆ خوشکە مردووەکەت بکات!'

حەمەجان سەری هەڵبڕی و چاوە تەڕەکانی چەند جارێک هەڵگلۆفی و بەسەرنجەوە لە داودی چایچیی ڕوانی و هیچی نەوت.

لەو ساڵانەدا گرانی و نەخۆشی خەڵکێکی زۆری لە شاردا کوشت، خەڵک بەناچاری مردووەکانیان لە دەوروبەری شار بەبێ کفنودفن و

تەڵقین لە هەرچ جێگایەک بووایە دەکرد بەژێر گڵەوە.

دوو جار پارەم لە مامە سلێمانم بۆ حەمەجان سەلیم وەرگرت، شەوانیش کاتێک باوکم خەوی لێ دەکەوت، دەچوومە ژێرزەمینەکە و توورەکەیەکم لە گەنم یان نیسک و نۆک پڕ دەکرد، کەتان دەسکی دەرگای ژێرزەمینەکەی بۆ دەگرتم و منیش بەئەسپایی بە پلیکانەکاندا دەچوومە خوارەوە، باوکم هەمووی دوو مەترێک لەولای دەرگای سەرقاپی ژێرزەمینەکەوە ڕاکشابوو، چەند فەردەیەکم لە ژێرەوە کون تێ کردبوون و بەو جۆرە هەموو جارێک چەند کیلۆیەکم لێ دەر دەهێنان، بەیانیان زوو پێش ئەوەی باوکم بەخەبەر بێت، لە ماڵ دەر دەچووم و بۆ حەمەجانم دەبرد.

باوکم هەموو دوکاندارەکانی لێ ڕاسپاردبووم، بە ڕۆژدا هەرچیم دەکرد و چۆن دەهاتم و بۆ کوێ دەچووم، لەپێش خۆمەوە هەواڵەکان دەگەیشتنەوە، چەند جارێک پرسیاری ئەوەی لێ کردم، 'ئەرێ کوڕە گوێڕووتەکەی حاجی سەلیم پێنجوێنی دێتە ئەو ناوە؟'

کاتێک باسی گوزەرانی حەمەجان و دایک و خوشکەکانیم بۆ باوکم گێڕایەوە و پاشان لێم پرسی، 'ئەرێ باوکە بۆچی شێخ حەسەن دوکانەکەی لە حەمەجانی حاجی سەلیم سەندەوە و دای بە ڕەفائێل یایر؟'

لە وەڵامدا چاوی لێ سوور کردمەوە و لە بێزاریدا چەند جارێک کۆکی و بەتووڕەییەوە پێی وتم، 'ئاخر تۆ ئاوا بیر دەکەیتەوە بۆیە من هیچ هیوایەکم پێت نییە، بەخوا تاکو تۆ لەسەر ئەو ئەقڵە بیت هیچت بە هیچ نابێت، هەی قوڕ بەسەر من بۆ بەشم!'

ئەو ڕۆژە باوکم دیسان هاتەوە سەر باسی خەونەکەی دایکم و خێرا کەتانی بەدوای مامە سلێماندا نارد، تاکو مامە سلێمان گەیشت، باوکم لەبەرخۆیەوە گلەیی لە بەختی خۆی دەکرد و منیش بێدەنگ

سەرم داخستبوو لە ڕەنگی گوڵی سەر قالییەکەم دەڕوانی، کاتێک مامە سلێمان لە دەرگاکەوە دەر کەوت، باوکم لەناو جێگاکەوە وتی، 'سلێمان، لە شەو و ڕۆژێکدا ئەم هەتیوەم لەم شارە بۆ دوور بخەرەوە و بینێرە بۆ بەغداد با لەوێ بۆ حاخامی بخوێنێت.'

مامم لای جێگاکەیەوە دانیشت و دەستی خستە سەر دەستی، 'جا برا بەم ئاگرباران و شەڕوشۆڕە کێ دەچێت بۆ بەغداد، ئیتر لەگەڵ کێدا بینێرم؟'

'دەستم بە دامانت سلێمان، یان لەو ژێرزەمینە بۆم حەپس کە، یان تاکو زووە لەم شارە بۆم دوور بخەرەوە، تاکو ماڵی وێران نەکردووم!'

باوکم ئەمەی بەتووڕەییەوە وت، ئەوەندە زۆری لە خۆی دەکرد، بەردەوام دەکۆکی و تەواو هەناسەی لەبەر بڕابوو، من و مامە سلێمانم لە یەکترینمان دەڕوانی، پاشان کەنەفت و پرزەلێبڕاو چاوی داخست، لەگەڵ مامم و کەتانی خوشکمدا بەسەریدا نوشتابووینەوە، مامە سلێمان بەردەوام بانگی دەکرد و زوو زوو ڕای دەوەشاند، من و کەتانیش بەدیاریەوە کەوتبووینە سەر ئەژنۆ و دەگریاین، زوو زوو مامە سلێمانم بە تیلەی چاو لە منی دەڕوانی و دانەکانی لێ جیڕ دەکردمەوە، لەپڕ باوکم دەنگێکی لێوە هات و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، چاوی لە بنمیچی ژوورەکە بڕیبوو، لەبەرخۆیەوە دەستی کرد بە نزاکردن، مامە سلێمان خێرا هەڵسایە سەر پێ و دەستی منی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردمی، بەدەم ڕێگاوە پێی وتم، 'هاروونی باوکم بە زۆر منی کرد بە ئاشەوان، کە ئەوسا من دەمویست پیشەیەکی تر فێر ببم یان دوای عیلم بکەوم، باوکم تەنها بۆ جارێکیش چییە گوێی لە قسەکانی من نەگرت و ڕێگای پێ نەدام تەنانەت بیریشی لێ بکەمەوە، ئیتر بە زەبری دار کردمی

بە ئاشەوان، وتم ئەگەر خۆم منداڵم بوو زۆریان لێ ناکەم، تاوەکو جێگای من بگرنەوە و ئەوانیش ببنە ئاشەوان. ئەوەتا چەندین ساڵە لەگەڵ یەعقووبی کوڕم خەریکم تا بخوێنێت و پاشان پیشەیەکی باشتر فێر ببێت، بەڵام ئەو لە ئاشەوانی زیاتر هیچ پیشەیەکی تری ناوێت، هاروونی ئاشەوانی باوکم بەڕەحمەت بێت تەبیعەتی باوکی تۆی هەبوو.'

'دایکیشم هەر بە خەمی منەوە سەری نایەوە، مامە سلێمان ئێستا من چی بکەم تاکو بتوانم دڵی باوکم لەخۆم ڕازی بکەم؟'

کاتێک ئەمەم بە مامە سلێمانم وت، دەستی لە دەستم بەر دابوو، لە شانی یەکەوە بە قەراغی شیوەکەدا بەرەو ئاشەکە دەڕۆیشتین، 'تۆ قەت ناتوانیت دڵی باوکت لە خۆت ڕازی بکەیت، ئیتر خوای دەکرد ئەستێرەت بۆ دادەگرتە ناو ماڵەکەی، مردنی دالیای دایکیشت بە ئەمری خودا بووە و ئەو خۆی دوای خەونەکانی کەوت و ئەو ڕێگا دوورەی بەرەو ئەلقوش گرتە بەر. ئیتر خوا تۆی لەبەر خاتری ئەوان خوڵق نەکردووە!'

کاتێک گەیشتینە بەردەمی ئاشەکە، زیاتر لە پەنجا کەس لەبەردەم ئاشەکەدا وەستابوون، لەبن دیوارەکەیدا چەندین کەر و هێستر بە بارەوە ڕاگیرابوون، خەڵکەکە کاتێک ئێمەیان بینی زۆربەیان بەرەو ڕوومان هاتن و ڕێگای چوونەژوورەوەی ئاشەکەیان لێ گرتین، چەند پیاوێکیش لەسەر فەردەکانیان بەڕیز دانیشتبوون و لە دوورەوە لێیان دەڕوانین، یەک یەک لە جێگای خۆیانەوە سڵاویان لە مامە سلێمان کرد، خەڵکەکە چواردەوریان لێ دا و هەریەکە و بە جۆرێک لێی دەپاڕایایە و سکاڵای خۆی بۆ دەکرد، ڕەنگیان ڕەش هەڵگەڕابوو دەتوت لە توونی حەمام هاتوونەتە دەر و لەڕ و لاواز و پێستی سەر ڕوومەتەکانیان بە ئێسقانەکانیانەوە نووسابوو، چاویان زەق و پێستی چنگ و پەلیان بۆر

و قڵیشاو دیار بوو، بۆگەنیان لەگەڵ بۆنی گوواوی شیوەکەدا تێکەڵ بووبوو.

گوێم لە ژنێک بوو بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە و بەدەم گریانەوە دەیوت، 'توخوا مامۆ گیان، تەنها بەشی ژەمێکم پێ بدە، مێردم مردووە و خاوەنی چوار منداڵم و بەخوا دوو ڕۆژە ئەو قوڕبەسەرانە دەمیان لە زایی ئیلاهی نەیاوە.'

پیاوێک وەکو چڵەدارێکی وشک و درێژ، ئەوەندە باڵای بەرز بوو لەناو هەموویاندا دیار بوو، بەسەر هەموویاندا هاواری کرد، 'لالۆ سلێمان، من حەمەفەریقی مەلا ئەحمەی بازیانم، قوربانو بم، بەخوا باوک و باپیرەیشم هەر لەو ئاشەی جەنابتان باراشیان هاڕیوە.'

مامە سلێمان هەرچەند هەوڵی دەدا، نەی دەتوانی خۆی لەدەستیان ڕزگار بکات، هەروەها ڕێگایان پێ نەدەدا قسەیان بۆ بکات، هەموویان لە یەک کاتدا قسەیان دەکرد و یان بەدەم گریانەوە دەپاڕانەوە، هەریەکە و لە لایەکەوە شان و چەمکی چۆغەکەیان ڕادەکێشا، 'ئەرێ ماڵتان وێران بێت، وەکو چۆن وێران بووە و بگرە هەر نیشتانە، بیەڵن با منیش قسەیەک بکەم!'

مامم کاتێک ئەوەی بە دەنگی بەرز و تووڕەییەوە پێ وتن، هەموو بێدەنگ بوون و بە چاوە زەقەکانیان لێیان دەڕوانی، پاشان بە دەنگی بەرز وتی، 'منێکی ئاشەوان چیتان لێ بکەم و چۆن دەتوانم هەموو ڕۆژێک ورگی ئەو هەموو برسییە تێر بکەم، بۆ ناچن بۆ جێگایەکی تر، خۆ من ئێوەم خوڵق نەکردووە تاکو لە ژیان و گوزەرانتان بەرپرس بم!'

لەگەڵ تەواوبوونی قسەکانی مامە سلێماندا، هەموو دیسان دەستیان کردەوە بە پاڕانەوە، مامم هەرچۆنێک بوو خۆی لە دەستیان ڕزگار کرد و چووە بەردەمی ئاشەکە و ئاوڕی لە من

دایەوە و پێی وتم، 'ئادەی ڕۆڵە بۆ وا دەستەوسان وەستاویت، دووریان بخەرەوە لێم.'

بە هەمان شێوە لەو پیاوانەی ڕوانی، کە تاکو ئەو ساتە بێباک لەسەر فەردەی باراشەکانیان دانیشتبوون و لە ئێمەیان دەڕوانی، بانگی لەوانیش کرد، 'ئادەی براگەل، یارمەتیمان بدەن با هاڕینی باراشەکەی ئێوەیش نەکەوێتە شەو!'

کاتێک ئەو خەریکی کردنەوەی دەرگای ئاشەکەی بوو، لەگەڵ پیاوەکان بەرمان لە خەڵکەکە گرت و بە پاڵ دوو هەنگاو لە دەرگای ئاشەکەمان دوور خستنەوە، من هێشتا لە بەردەمی خەڵکەکەدا وەستابووم و قۆڵەکانم بڵاو کردبووەوە و ڕێی چوونەژوورەوەم لێ گرتبوون، مامم فەردەیەکی ڕاکێشایە بەردەمی دەرگای ئاشەکە و جامێکی گڵینی بەدەستەوە بوو، سەری هەڵبڕی و داوای لە خەڵکەکە کرد تاکو ڕیز بگرن، لەو کاتەدا ئەو خەڵکە لەڕ و لاوازە هەموو باڵیان لێ پەیدا بوو، بوو بە ڕاکەڕاکە و پاڵنان و ئیتر لە توانای مندا نەما ڕێیان لێ بگرم، هەموو وەکو گورگی برسی دانەکانیان لە یەکتری جیڕ دەکردەوە و پەلاماری یەکیان دەدا، چەند ژن و منداڵێک کەوتبوونە ژێر پێ و پیاوەکان بەسەریاندا خۆیان گەیاندە لای مامە سلێمان، دوای ئەوەی چەند پیاوێک بەشی خۆیان وەر گرت، هێشتا لەدەوری مامم وەستابوون و ڕێگایان بەوانی تر نەدەدا بچنە پێشەوە، هەر کەسە و جامێکی پڕی بۆ دەکردنە کۆش یان ناو توورەکەکانیانەوە، بینیم مامە سلێمان بە جامە گڵینەکەی دەستی چەند جارێک لە سەر و گوێلاکی پیاوەکانی سرەواند، لەو کاتەدا من لە دوایانەوە بووم و بێدەنگ لێم دەڕوانین، ناچار بووم چووم و یەک یەک ئەوانەی بەشی خۆیان وەر دەگرت، وەکو چۆن پۆلیسێک پشتی ملی دزی گرتبێت، یەک یەک پێش خۆم دەدان و لە ئاشەکەم دوور دەخستنەوە، لە ئەنجامدا بە جۆرێک

ناچاریان کردم، کە بچم دارێک لە حەوشەی ئاشەکە بێنم و ئەوەی گوێڕایەڵم نەبووایە چەند دارێکم پیادا دەکێشا.

چەند کەسێک دوای ئەوەی بەشی خۆیان وەر گرت، ڕۆیشتن و لە دوورەوە جنێویان پێ دەداین، هەندێکیش تاکو لە چاو ون دەبوون نزایان بۆ دەکردین، مامە سلێمانم کاتێک لە گەنمەکە بەشی هەموویانی دا، پاشان بانگی لێ کردن و پێی وتن،

'جارێکی تر لێرە نەتانبینمەوە، سبەی بچن بۆ بەردەمی ماڵی شێخ و بەگزادەکان، نان لەوێیە لەوێ!'

هەژاران بڵاوەیان لێ کرد و ئێمە لە ژوورەوە هەموو بێدەنگ بەدیار بەرداشی ئاشەکەوە وەستابووین و گوێمان لە هاڕەهاڕی بەردەکە و خوڕەی ئاوەکە دەگرت، یەکێک لە پیاوەکان فەردەیەکی نابووە بەر ئەو تەختەیەی گەنمە هاڕاوەکەی لێوە دەهاتە خوار و بێدەنگ لە بنمیچی ئاشەکەی دەڕوانی، مامە سلێمان لە نێوان ئەو دوو پیاودا وشک وەستابوو، دەستێکی لەسەر شانی یەکێکیان دانابوو، پیاوەکان لەویان دەڕوانی و مامم بە دەستەکەی تری زوو زوو پشتی سەری دەخوراند، وەک ئەوەی بیەوێت شتێکمان بۆ باس بکات، هەموومان بەسەرنجەوە لەومان دەڕوانی، لە ناکاو یەکێک لە پیاوەکان ئەو بێدەنگییەی شکاند و لەبەرخۆیەوە هاواری کرد، 'کوڕە ئەو گوێنییە پڕ بوو، هەی ماڵخراو!' کاتێک ڕوانیم، گوێنیی بەردەمی تەختەی ئاشەکە پڕ بووبوو لێی دەڕژا.

دوای ئەوەی باراشەکانمان هاڕی و پیاوەکان یەک یەک ڕۆیشتن، مامە سلێمان دەرگای ئاشەکەی داخست و چوو لە عەمارەکە گۆزەیەک و دوو پەرداخی گڵینی هێنا و شەرابی بۆ هەردووکمان تێکرد و فەرمووی لێ کردم، هێشتا دەستم بۆ پەرداخەکەم نەبردبوو، بەسەرنجەوە لە مامم ڕوانی، ئەو پەرداخەکەی خۆی هەڵگرت و پێش

ئەوەی قومی لێ بدات پێی وتم، 'بیخۆرەوە تاکو بتوانیت نیازی دڵی خۆتم پێ بڵێیت!'

هەردووکمان لە پەرداخی سێهەمدا بووین و بێدەنگ لە یەکترینمان دەڕوانی، مامم لەبەر خۆیەوە وتی، 'دوو جۆر منداڵ هەن، یەکەمیان بۆ خۆیان بەرچاو ڕوونن و عەقڵیان بە ڕاستی و ناڕاستییەکان دەشکێت، جا ئەو جۆرە منداڵانە زۆر ئەستەمە دەستەمۆ بکرێن و ڕەشۆیان لە مل بکرێت، دووەمیان هەر لە منداڵییەوە ئەبێت دەستت بە قوونیانەوە بێت تاکو ئەبنە جاحێڵ و بگرە پیریش ئەبن هەر پێویستیان بە ئامۆژگارییە!'

'تۆ بڵێیت من لە کامیان بم؟'

'بە مەزەندەی باوکت، تۆ لە تەرەفی دووەمیانیت.'

'بەخوا مامە گیان، خۆیشم گەلێک جار لە خۆم ناڕازیم و دڵم هەردەم پڕە لە دوودڵی و گومان.'

'من پێم وایە تۆ لە تەرەفی یەکەمیانیت، چونکە تۆ بێ ئەوەی کەس دەرسی دادابێت، ناڕازیت لە ڕەفتاری خۆت و گومان لە ڕەوشتی ئینسانەکانی چواردەورت دەکەیت!'

'جا ئەوە چ سوودێکی هەیە و دەمگەیەنێت بە کوێ؟'

'ئەوەندی من بزانم پەروەردە لە دیانەتەکانی تردا بەو جۆرە نییە، تۆ خۆت لە کنێسەت خوێندووتە و ئەوە دەزانیت، بەتایبەتی ئەو منداڵانەی دوای خوێندنی سەرەتایی دەگەنە یەشیڤا، ئیتر بۆیان هەیە پرسیار بکەن و ڕاستگۆیانە گومانیان لە دین لەلای حاخام ئاشکرا بکەن، کوڕی خۆم، ئەو پەروەردەیە کاریگەریی لەسەر تۆ هەبووە و ئەوەتا تۆ ئێستا وەکو جاهیلێک سەر بۆ هەموو ڕاستی و ناڕاستییەک ڕاناوەشێنیت و پرسیار یان گومانت لێیان هەیە، بزانە ئەوانەی پەروەردەی حوجرەکانن چۆن بیر دەکەنەوە، بە جۆرێک هەستی مرۆڤانەی خۆیان لەدەست داوە، چاویان بەرپێی ئێستایان نابینێت و کوێرانە بەس لە حەوا دەڕوانن و

خەیاڵیان تەنها لای ئەودونیایە.'

'کام دونیا؟'

'کورە ئەو دونیایەی بە قەولی دیانەتەکان دوای مردن دەست پێ دەکات و لەوێ پیاو لە هەوەسەکانی تێر دەبێت!'

کاتێک مامم ئەمەی وت، دوا دڵۆپی شەرابی ناو گۆزەکەی کردە ناو پەرداخەکان و لەبەرخۆیەوە وتی، 'بەداخەوە، ئەو نیعمەتەش تەواو بوو.'

.

## ٨

'دایکت ڕاستی دەکرد تۆ و کەسابەتیان نەوتووە، تۆ خوا بۆ حاخامی خوڵقی کردوویت!' باوکم بەو نەخۆشی و بارگرانییەی خۆیەوە هەموو ڕۆژێک ئاوای پێ دەوتم.

پاشان دەیناردم بەدوای مامە سلێمان و حاخامدا و تەگبیری پێ دەکردن. ئاخۆ چۆن بتوانێت پێش مردنی ئەو دایکم بێنێتە دی و من بۆ بەغداد بنێرێت، لەو ڕۆژانەدا چەند جارێک مامە سلێمان بە باوکمی وت، 'ئێستا هەموو ڕێگاکان بەرەو بەغداد گیراون، باشترە چوونی خایم بۆ بەغداد دوا بخەین.'

باوکم قسەکەی خۆی بردە سەر و یەعقووبی کوڕی مامە سلێمانم هاتبووە سەر دوکانەکەی ئێمە و ئیتر من وەکو بەردەستێکی ئەو بە ڕۆژدا لەوێ بووم، لەو ڕۆژانەدا دوانیوەڕۆیەک لەگەڵ مامم پێکەوە چووین بۆ کەنیسەی مریەم، بە مەبەستی ئەوەی لەگەڵ هاوڕێیەکی مەسیحیی خۆیدا بۆ بەغدادم بنێرێت، بەڕێکەوت بە بەردەرکی سەرادا تێپەڕین، کۆمەڵێک خەڵک بەرامبەری ئاپارتمانی سەرا وەستابوون و ژمارەیان لە سەد کەسێک زیاتر دەبوو، بەردەوام هاواریان دەکرد، 'خەلیل پاشا حاکمی کول، خەلیل پاشا حاکمی کول.'

هەموو وشک لە جێگای خۆیان وەستابوون و ڕەنگزەرد و جلدڕاو و پێخاوس بوون، لە مامە سلێمانم پرسی، 'ئەوانە داوای چی دەکەن؟ ئەرێ مامە: خەلیل پاشا کێیە؟'

'کوڕە ئێمە کارمان بەسەریانەوە چییە، ئیتر خەڵکی ئەم شارە

هەرچ سولتان و پاشایەک حوکوم دەگریتە دەست، ئەمان لێرە دەڕژێنە سەر جادە و شانامەی بۆ دەخوێنن!'

کاتێک گەیشتینە کۆلانی کەنیسەی مریەم، دەیان ژن و پیاو و منداڵ وەستابوون و چاوەڕوانی وەرگرتنی فەقیرانە بوون، مامم منی پێش خۆی دا و بەناو ئەو خەڵکەدا بەرەو دەرگای کەنیسەکە چووین، خەڵکەکە دەستیان لێ پان دەکردینەوە و لێمان دەپاڕانەوە و داوای خێریان لێ دەکردین. دوو پیاو لەناو دەرگاکەدا وەستابوون و بەریان لەو خەڵکە گرتبوو، یەکێک لەوانەی ناو دەرگاکە مامە سلێمانمی ناسییەوە و بۆ ژوورەوە فەرمووی لێ کرد، کاتێک چووینە ژوورەوە بینیم لەناو حەوشەکەدا چوار مەنجەڵی فافۆنی گەورە لەسەر سێپا دانرابوون و ئاگریان لە ژێردا کرابۆوە، کابرایەکی ڕیشنی بالابەرزی جلڕەش هات بەپیرمانەوە و دوای ئەوەی سلاوی لێ کردین، مامم پێی وتم، 'خایم ڕۆڵە، ئەم پیاوە قەشە مەتییە.'

قەشە مەتی، توند دەستی گوشیم و بە زمانی عەرەبی هەواڵی تەندروستیی پرسیم، پاشان دەستی بەر نەدام تاکو وەلامم دایەوە، لە حەوشەی کەنیسەکەدا کابرایەکی تەمەن پەنجاساڵە قۆڵی لێ هەڵکردبوو، لەگەڵ چێشتلێنەرەکاندا خەریک بوو، هات بەرەو پیری مامە سلێمانم و باوەشیان کرد بە یەکتردا، مامم دەستی کابرای گرت و وتی، 'عەبدولکەریم ئەوە خایمی برازامە و کوڕی شولومۆی بازرگانە.'

عەبدولکەریم خەڵکی شار بە کەریمی عەلەکە ناویان دەبرد، تەڕپووشێکی ڕەنگی سووری لەسەردا بوو، کەوا و سەڵتەلەبەر و قۆڵی سەڵتەکەی هەڵکربوو، فەقیانە سپییەکانی لە بازوویدا توند بەستبوو، دوای ئەوەی مامە سلێمانم باسی نیازی باوکمی بۆ عەبدولکەریم باس کرد، عەبدولکەریم ڕووی لە من کرد و پێی وتم،

'دوو ڕۆژی تر خۆت ئامادە بکە و لەگەڵ کاروان بەرەو بەغداد دەڕۆین.'

پاشان لەگەڵ ماممدا باسی گرانی و شەڕ و داکەوتنی دەرد و بەلایان دەست پێ کرد، منیش بەدیاریانەوە وەستابووم و گوێم لێ گرتبوون، لەو کاتەدا قەشە مەتی جامێک گەنمەکولاوی دایە دەستم، شلەی تەماتە و پەڵپینەی بەسەردا کرابوو، سوپاسی قەشە مەتیم کرد و خێرا بە سەرپەنجەکانم پارووپەکم لێ گرت، لەو کاتەدا مامە سلێمانم دەستی خستە سەر شانم و پێی وتم، 'دەڕۆین.'

هێشتا لە حەوشەی کەنیسەکە دەر نەچووبووین، مامە سلێمانم جامی گەنمەکولاوەکەی لێ وەر گرتم و دایە دەستی پیرێژنێک، کە لەو کاتەدا لە ڕیزەکەدا بۆ خواردن وەرگرتن وەستابوو، پاشان لێی ڕوانیم و پێی وتم، 'ئەری ڕۆڵە خۆ تۆ برسی نیت؟'

ئێوارەی ئەو ڕۆژە لەگەڵ یەعقووبی ئامۆزام خەریکی ڕێکخستنەوەی دوکانەکە بووین، کە تاوەکو ئەو ڕۆژەیش زۆربەی کەرەستەکان، وەکو، چا و شەکر و قسڵ و قلی و خوێ لە ماڵەوە بوون، باوکم پێش گرانییەکە لە ترسی برسی و جەردە بردبوونییەوە بۆ ماڵەوە، حەمەجان سەلیم و فوئاد مەعرووف هاتن بۆ لام و پێیان وتم، گوایا مامۆستا عەبدوللا ئەفەندی ئەوانی بەدوای مندا ناردووە و دەیەوێت ئەمشەو چاوی پێم بکەوێت. لەو کاتەدا یەعقووبی ئامۆزام گوێی لێ گرتبووین، منیش هیچ چارم نەما و داوام لە یەعقووب کرد لەلای کەس باسی نەکات، دوای ئەوەی دەرگای دوکانەکەمان داخست، لەگەڵیان چووم بۆ هەمان ئەو ماڵەی جاری پێشوو لەگەڵ خامێ بۆی چووبووین، مەبەستم لەو شەوە بوو لەگەڵ فەقێکاندا تووشی شەڕ بووین، بەدەم ڕێگاوە لە حەمەجانم پرسی، 'کێی تری لێیە؟'

حەمەجان لەوە دڵنیای کردمەوە، کە تەنها مامۆستاکەیان و فوئاد مەعرووف و لەوانەیە جەمال عەبدوڵلا و ئەمین زەکییش لەوێ میوان بن.

کاتێک ئێمە گەیشتین، کاتی نانخواردنی ئێوارە بوو، سفرەکەیان داخستبوو، بەڵام هێشتا قاپەکان بەتاڵ بوون، دوو بەستە نانی تیری و چەپکێک پیازی تەڕ لەسەر سفرەکە دانرابوو، عەبدوڵلا ئەفەندی، کە پێشتر لە قوتابخانەی ڕوشدییە ناسیبووم و عەبدوڵا زێوەریشیان پێ دەوت، بەخێرهاتنی کردم و پێی وتم، 'من قەت دەست لە قوتابی خۆم بەر نایەم!'

کابرایەکی لاوازی باڵابەرزی گەنمڕەنگ لە شانیەوە وەستابوو، دەستی تەوقەی بۆ درێژ کردم و وتی، 'عەبدوڵلا ئەم کوڕە کێیە؟'

عەبدوڵلا ئەفەندی لە منی ڕوانی، 'خایم، کوڕێکی جوولەکەی خوێنەوارە.'

منیش دەستی تەوقەم بۆ درێژ کرد، کاتێک دەستمی بە هەردوو دەستی گرتبوو، لێی ڕوانیم و پێی وتم، 'جا جووەکانی ئەم شارە کامیان نەخوێنەوارن؟'

عەبدوڵلا ئەفەندیی موعەلیم کاتێک جەمال عەبدوڵلای پێ ناساندم، بە جەمال عیرفان ناوی برد، هەردووکمان دەستی تەوقەمان بۆ یەکترین درێژ کرد، جەمال عەبدوڵلا جلوبەرگی ئەفسەری عوسمانیی لەبەردا بوو، کوڕێکی گەنجی باڵابەرزی سمێڵڕەش لە تەنیشتیەوە ڕاوەستابوو، کاتێک دەستی تەوقەم بۆ درێژ کرد، توند دەستی گوشیم و بە زاراوەی کرمانجی پێی وتم، 'ئەز زەکی ئەفەندیمە.'

جەمال عەبدوڵلا دەستی خستە سەر شانی زەکی ئەفەندی و لە منی ڕوانی و وتی، 'کاک زەکی دامەزرێنەری جەمعیەی تەلەبەی کوردی موتەقەدیمە و جەمعیەکەیان ناوی هیوایان لێ ناوە، جا

بەنیازە خەڵکی لای خۆمان بەوە ڕازی بکات بەو کارەی هەڵسن، تاوەکو جەمعیەی هیوا سەرتاسەری بێت.'

دوای ئەوەی ئەمەم لە جەمال عەبدوللا بیست، دەستی زەکیم جارێکی تر ڕاوەشاند و لەبەرخۆمەوە پێم وت، 'ئەگەر بەدوور بێت لە سیاسەتی تورکەکان کارێکی زۆر پێویستە.'

کاتێک لەسەر سفرەی نانخواردن دانیشتبووین، لە سەرەتاوە هەموو بێدەنگ بووین، دیار بوو لەزەتی یاپراخەکە هەموومانی سەرسام و بێدەنگ کردبوو، من لە نێوان فوئاد مەعرووف و حەمەجان سەلیمدا دانیشتبووم، فوئاد مەعرووف بەهێواشی و لەژێر لێوەوە پێی وتم، 'ئەو پیاوە، حەمەئەمین زەکی بەگە.'

چەند جارێک ئەو ناوەم لەبەرخۆمەوە وتەوە، لەو کاتەدا لە مەبەستی فوئاد مەعرووف تێنەگەیشتم و نەمزانی بۆچی ئەو بەسەرنجەوە ئاماژەی بە ناوی، 'حەمەئەمین زەکی بەگ' کرد.

دوای نانخواردن ئێمە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک گوێبیستی قسەکانی عەبدوللا ئەفەندی و حەمەئەمین زەکی بووین، بێجگە لە جەمال عەبدوللا، چەند جارێک پرسیاری کرد و بەشداریی لێدوانەکانی ئەوانی کرد، زەکی ئەفەندی کاتێک ویستی باس و بەسەرهاتی خۆی و خەڵکی دیاربەکر بگێڕێتەوە، خێرا جەمال عەبدوللا داوای لێ کرد بەتورکی قسە بکات، تاوەکو بەباشی لێی تێبگەن، بێجگە لە من، هەموو زمانی تورکییان باش دەزانی و لە لێدوانەکاندا بەشدار بوون، زوو زوو لەژێر لێوەوە پرسیارم لە حەمەجان سەلیم دەکرد ئاخۆ باسی چی دەکەن، لە وەڵامدا وتی، 'کوڕە باسی دیمەنی شاری ئەستەمبوڵ و گوزەران و تەقەدومی خەڵکی ئەوێ دەکەن.'

لە کۆتاییی دانیشتەکەماندا زەکی ئەفەندی لە گیرفانیدا چەند

کاغەزێکی بۆری دەر هێنا و لە بەردەمیدا کردیەوە، دوای ئەوەی چاوی پێدا گێراین وتی، 'ئەڤە گۆڤارا *ڕۆژێ کوردە* و جەمعیەی هیوا دەرێ دەخاتن.'

گۆڤاری *ڕۆژی کورد*، وەکو هەموو ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە، هێلکاریی لەتەمانگێکی ڕەمزی موسوڵمانانی لەسەر بوو، هەموو هاتبووینە سەر چۆک و لە دەست و پەنجەی زەکی ئەفەندیمان دەڕوانــی، کاتێک دەستی بەسەر ڕووی کاغەزەکەدا دەگێڕا، لەبەرخۆیەوە وتی، 'درەنگ بێت یان زوو ڕۆژی کورد هەر دێت!'

درەنگانێک لەگەڵ حەمەجان سەلیم و فوئاد مەعرووفدا لە ماڵەکە هاتینە دەرەوە، لەسەری کۆڵانەکە و پێش ئەوەی بەجێیان بهێڵم، پێم وتن، 'من لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی داهاتوودا بەشداری ناکەم، چونکە بۆ خوێندن دەچم بۆ.بەغداد.'

پاشان لەبەر ماڵی عەزمیی ئامە شەلدا لە یەکتر جیا بووینەوە، من بەرەو خوار بەڕێ کەوتم و بە تاریکیی بن دیوارەکاندا خێرا دەڕۆیشتم، تاکو بمتوانیایە خۆم لە ڕووناکیی چرای ماڵەکان دەپاراست، لە دوورەوە بینیم فتیلەیەک لەپاڵ دیوارێکدا دەگڕا، سێبەری ئەوانەی لە چواردەووری بوون لە دیوارە گڵەکەدا دیار بوو، ویستم پاشەوپاش بگەڕێمەوە دواوە و خۆمیان لێ دوور بگرم، نەوەکو کەسێک بمناسێتەوە و بەتەنها تووشی گێچەڵێکم بکات، کاتێک بە تاریکییەکەدا ویستم بێدەنگ بە لایاندا تێپەڕم، بینیم چوار منداڵ تەمسیلیان دەکرد و زیاتر لە دە منداڵێکیش لەسەر ئەرزەکە و بەرامبەریان چوارمشقی دانیشتبوون و بینەریان بوون، گەیشتمە نزیکیان و ئەوان ئاگاداری من نەبوون، بێدەنگ چەند مەترێک لەدوای منداڵانی بینەرەوە و لە بندیوارەکەدا ڕاوەستام و لێم ڕوانین، بینیم، یەکێکیان بە تۆپەڵێک خوریی ڕەش سمێڵی بۆ

خۆی دروست کردبوو، چڵەدارێکی کردبوو بە بەر ورگیدا و دەستی نابووە هەردوو لاقەبرغەی و ڕاست وەستابوو، منداڵێکی تریان کڵاوێکی درێژکۆلەی ڕەنگسووری لەسەر نابوو، دارێکی بەدەستەوە بوو، دوو منالەکەی تریان کرنۆشیان لە بەرپێیاندا بردبوو.

منداڵی یەکەم، 'بە ئەمری خوا فەلاقەیان بکە.'

داربەدەست، 'بەڵێ ئەمر دەکەیت گەورەم.'

دارەکەی دەستی دادەهێنایەوە و یەک یەک بەهێواشی دەیدا بە پشتی کرنۆشبەرەکاندا.

کرنۆشبەرەکان، 'ئەی هاوار، ئەی هاوار.'

منداڵی یەکەم، 'باش لێیان دە، جاسووسن، بەدناون.'

داربەدەست، 'بەڵێ ئەمر دەکەیت گەورەم.'

دیسان خێراتر دارەکەی دەستی لە کرنۆشبەرەکان هەڵ دەهێنایەوە و لەبەرخۆیەوە دەیوت، 'ئەوەتا، دە بیخۆن دەی، جاسووسی دەکەن.'

کرنۆشبەرەکان، 'بۆ خاتری خوا، بۆ خاتری خوا.'

منداڵانی بینەر، هەموو دابوویانە قاقای پێکەنین و زوو زوو یەکێکیان هاواری دەکرد، 'لێیان دەن، بیانکوژن.'

چەند منداڵێکی بینەر چوونە شوێنی نمایشەکە و چەند نووکە شەقێکیان لە کرنۆشبەرەکان هەڵدا، لەو کاتەدا ئەوانیش لێیان ڕاست بوونەوە و پەلاماریان دان، لە چەند هەناسەیەکدا منداڵەکان بەر بووبوونە یەکتری و لەناو خۆڵ و تەپوتۆز و تاریکیی ئەو شەوەدا لە چاوم ون بوون، ناچار بەجێم هێشتن و بەرەو سەرشەقام و لەوێوە بۆ گەڕەکی جولەکان بەڕێ کەوتم.

کاتێک گەیشتمە سەر شیوەکە، یەکێک لە دواوە بە ناوی خۆمەوە بانگی کردم، لەو کۆڵانە تاریکەدا بەئەستەم بەرچاوی خۆمم دەبینی.

لە ترساندا دەستم بە ڕاکردن کرد، هەرچەندە گورِم دەدایە بەر خۆم دەنگەکە زیاتر لێم نێزیک دەبوویەوە، لەناکاو کابرای ناو خەونەکانی دایکمم لێ پەیدا بوو، بەبێ ئەوەی لە چاوم بڕوانێت لەبەر خۆیەوە پێی وتم، 'هەموو شتێک لەوێ ڕوو دەدات، ئیتر تۆ دەبێت لەوێ بیت.'

ئەوەندە لێم نزیک بووبووەوە خەریک بوو لووتمان بە لووتی یەکەوە دەنووسا، هەناسەی بۆنی ڕازیانەی لێ دەهات، کاتێک پشتی تێکردم و ویستی بڕوات، بە دەنگی بەرز لە دواوە بانگم کرد، 'مامە گیان، تۆ کێیت؟ ئەو شوێنە کوێیە، کە هەموو شتێک لێی ڕوو دەدات؟'

ئاوڕی لێ نەدامەوە و لەناو تاریکیی ئەو شەوەدا لێم ون بوو.

# ٩

٢٠ی مانگی دووی ساڵی ١٩١٧ لەگەڵ کاروانەکەی عەبدولکەریم ئەلیاس بەرەو بەغداد کەوتمە ڕێ، باوکمم بەنەخۆشی لەناو جێگادا بەجێ هێشت و ماڵئاواییم لە خزم و دۆست کرد، مامە سلێمان ئەو بەیانییە پێی وتم، 'دەڕۆیت، بەڵام گەڕانەوەت لەبیر نەچێت، ئەوەت لەبیر نەچێت کەسانێک هەن دڵیان لەڕێی تۆیە.'

ئەو بەیانییە خامێ و سیمانەی هاوڕێم تاکو سەر چەمی تانجەرۆ لەگەڵم هاتن، کاتێک کاروانەکە گەیشتنە لای ئێمە، عەبدولکەریم ئەلیاس ڕەشۆی بارگیرێکی دایە دەستم و پێی وتم، کە ئیتر منیش لەو ساتەوە ولاخدارم و لەو بارگیرە و بارەکەی بەرپرسیارم.

هەروەها ئەوەشی پێ وتم، کە کاروانەکەمان بەرەو قەرەداغ و لەوێوە بۆ کەرکووک دەڕوات.

بە من و عەبدولکەریم ئەلیاسەوە پەنجا پیاوێک دەبووین و زۆربەی پیاوەکان تفەنگیان پێ بوو، عەبدولکەریم ئەلیاس پرسیاری باوکمی لێ کردم، لە وەلامدا پێم وت، 'نەخۆشە و لە جێگادا کەوتووە.'

بەسەرنجەوە لێی ڕوانیم، 'وەکو من بزانم تۆ تەنها عەولادی نێرینەی شولومۆی بازرگانیت، جا ئەو پەکی کەوتبێت کێ دوکانەکەی بۆ بەڕێوە دەبات؟'

'قوربان، یەعقووبی ئامۆزام، کوڕی مامە سلێمانم.'

'سلێمان پێی وتم، گوایا بۆ خوێندن دەچێت!'

'بەڵێ وا بەنیازم.'

'جا لەم قاتوقڕی و گرانییەدا باشتر نەبوو لە نزیکی کەسوکارت بیت؟'

'قوربان تۆ ڕاست دەفەرموویت، بەڵام ئەمە بە فەرمانی باوکم بووە.'

'ماڵی باوکت ئاوا بێت، چۆن بۆ ناو ئەو ئاگرەت دەنێرێت؟'

'مامە سلێمانم دەڵێت، گوزەرانی بەغداد زۆر لە سلێمانی باشترە!'

'بەخوا برا، ئەو دەرد و گرانییەی لە سلێمانی هەیە، لە هیچ جێگایەک وێنەی نییە، لەو چەند ساڵەی ڕابردوودا ئەوەی من بە چاوی خۆم بینیم، سەد دەفتەر بەشی نووسینەوەیان ناکات، با ناحەقی و زوڵموزۆری تورکەکان لەولاوە بوەستێت.'

'بەڵێ ڕاست دەفەرموویت، سێ بەشی خەڵکی ئەو شارە نانی نییە بیخوات!'

'ئیتر مەگەر تەنها خەڵکی ئەم شارە بەرگەی ئەو هەموو برسێتی و نەهامەتییە بگرێ!'

لەو کاتەدا عەبدولکەریم ئەلیاس دەرۆشت و سەری بە بەرپێی خۆیدا شۆڕ کردبووەوە، منیش پاش ئەوەی لێم ڕوانی، لەبەرخۆمەوە وتم، 'بەخوا ڕۆژی وا هەبووە بایی ماجیدییەک چییە نەمفرۆشتووە، هەڵیان کوتاوەتە سەرم و باجی خۆیان لێ گرتووم و باوەڕیان پێ نەکردووم، کە ئەو ڕۆژە سوفتاحم نەکردووە.'

'بە مەزەندەی ئەوان، ئێمە هەموو کەسانی مونافق و درۆزنین، ئیتر بەو جۆرە پێکەوەژیان پاشەڕۆژی باش نابێت، ئەوەی ئێستا بەسەر خەڵکی ئەو شارە دێت کێ لێی بەرپرسیارە؟ خۆ ئەگەر باوەڕمان بە قەزا و قەدەر هەبێت و هەمووی بنێینە ملی خوا، ئیتر لە کۆتاییدا کێ لێی زەرەرمەندە؟'

شەو درەنگ گەیشتینە قەرەداغ، بە درێژایی ئەو ڕۆژە بە پێ

ڕۆیشتم و سواری وڵاخەکەم نەبووم، عەبدولکەریم ئەلیاسیش بە هەمان شێوەی من و پێکەوە لە شانی یەکەوە بووین و بەردەوام قسەمان دەکرد و دوای کاروانەکە کەوتبووین، ئەو شەوە لە کەناری شار لامان دا و یەکێک لە وڵاخدارەکان بە عەبدولکەریم ئەلیاسی وت، 'ئێمە نایەینە ناو دێ، تەڕوتووشی نییە و لە جێگایەکی نەدیو بارەکان دادەگرین و ئالیک بە وڵاخەکان دەیەین.'

داوام لە عەبدولکەریم ئەلیاس کرد بۆ ماڵی یەکێک لە خاڵ یان پوورەکانم لەگەڵم بێت، پێم وت، کە هەموویان لە گەڕەکی جوولەکان دەژین، عەبدولکەریم ئەلیاس پێی وتم، 'تۆ بڕۆ بۆ ماڵی قەومەکانی خۆت و خەمی منت نەبێت، من لە هەموو شار و گوندێکی عێراق و ئێراندا بنکەیەکم داناوە.'

گەیشتمە گەڕەکی جوولەکان و لە کۆلانی کارێزەکە وەستابووم و نەمدەزانی لە دەرگای ماڵی خاڵە موسام بدەم یان بچم بۆ ماڵی یەکێک لە پوورەکانم، بێجگە لەوەی ئەو کۆلانە ئەمبەر و ئەوبەر هەموو ماڵەکان کەسوکاری دایکم بوون، تاوێک بوو لە بەردەمی ماڵی خاڵە موسا وەستابووم، چەند جارێک ویستم لە دەرگاکە بدەم، لەسەر دیوارەکەوە سێبەرەکانیانم دەبینی کاتێک بەبەر ڕووناکیی چراکەدا تێدەپەڕین، لە خەیاڵی خۆمدا لە خۆئامادەکردندا بووم، دە ساڵێک پێش ئەو شەوە سەردانی ئەو گەڕەکەم کردبوو، لەو شەوە تاریکەدا دەرگا ڕەنگشینەکەی ماڵی پوورە فەریدەم دەناسییەوە، هەستم دەکرد گەرمییەک لەناو دڵمەوە شەپۆلی بە خوێنم دەدا، تاوێک بە لای ڕاست و چەپی کۆلانەکەدا ڕوانیم، لەوسەری کۆلانەکە بەئەستەم چەند کێلەبەردێکی سپیی گۆڕستانەکەم لەبەر شەوقی مانگەکەدا لێوە دیار بوو، نازانم نایەتەوە خەیاڵم بۆچی لەو کاتەدا و بەو شەوە بە ماندوویێتی بەرەو ڕووی گۆڕستانەکە چووم،

زۆربەی کێلی گۆڕەکان لەبەر ڕووناکیی مانگەشەوەکەدا دیار بوون، زۆربەی گۆڕەکانی ئەو گۆڕستانە لە گڵی هەڵدراوە و گۆڕی تازە پێک هاتبوو، لەو کاتەدا دایکمم هاتەوە یاد، کە وەسیێتی بۆ باوکم کردبوو لەو گۆڕستانە بینێژێت، کاتێک لە تاشەبەردە تاشراوەکانم دەڕوانی، لە دڵی خۆمدا وتم، 'خۆزگە ئێمەی جوو ناومان لەسەر کێلی گۆڕی مردووەکانمان دەنووسی.'

گەڕامەوە بەردەمیماڵەکان و چوومە بەردەم ماڵی پوورە فەریدە و بێ دوودڵی لە دەرگاکەم دا، قاتی سەرەوە و خوارەوەی بالاخانەکە چرای تێدا دەگڕا، لە دڵی خۆمدا وتم لەوانەیە میوانیان هەبێت، کاتێک لە خەیاڵمدا ناوی مێردەکەی پوورمم چەند جارێک لەبەرخۆمەوە وتەوە، هەرچیم کرد ناوی یەکێک لە دوو کچەکەیم بیر نەکەوتەوە، بەڵام ناوی کچە گەورەکەی 'کانیشا'م دەزانی، چونکە ئەو هاوتەمەنی خۆم بوو، پێنج ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە هاتن بۆ سلێمانی و چەند شەوێک لە ماڵی ئێمە بوون، کچەکەی تریان ئەوسا تەمەنی شەش ساڵێک دەبوو، لەم خەیالانەدا بووم، دەنگێکی گڕ لەودیو درگاکەوە، 'کێیت؟'

لەژێر دەرگاکەوە ڕووناکیی فتیلەکەی دەستیم بینی، 'خایمم، کوڕی دالیا.'

کاتێک دەرگاکە کرایەوە، خێرا پۆلاکی مێردی پوورە فەریدەم ناسییەوە، تفەنگێکی لە شاندا بوو، هاتە بەردەرگاکە و لە ڕاست و چەپی کۆڵانەکەی ڕوانی، خێرا دەستی گرتم و بردمیە ناو حەوشەکە و بەپەلە دەرگاکەی داخست، لەناو حەوشەکەدا پیاوێکی ترم بینی تفەنگێکی لە بالای خۆی درێژتری بەدەستەوە بوو، یەکێک لە بەرهەیوانی قاتی خوارەوە بانگی کرد، 'پۆلاک، کێ بوو؟'

تاکو ئەو ساتە پۆلاک هیچی لەگەڵ من نەوتبوو، دوای ئەوەی

لەبەرخۆیەوە وتی، 'لە خۆمانە!'

دەستێکی خستە سەر شانم و ئەملاولامی ماچ کرد، 'ئەوە بەم ئاگربارانە لەکوێوە هاتوویت، بەتەنیایت؟'

'لەگەڵ کاروان هاتووم، هاوەڵەکانم لە دەری شار باریان خستووە.'

'خوا ماڵتان ئاوا کات، کاروانی چی و دەرەوەی شاری چی، بەخوا حەمەڕەش جوامێر هەمەوەندیی چەتە، خۆی و تفەنگچییەکانی چەند حەفتەیەکە چواردەوری شاریان گرتووە و هەموو شەوێک هەڵدەکوتنە سەرمان.'

پێکەوە چووینە بەرهەیوانەکە، خۆی هەڵبڕییە سەر نووکی پێکانی و فتیلەکەی دەستی لەناو دەلاقەیەک دانا، لەو کاتەدا کردنەوەی یەکێک لەو چوار دەرگایەی دەکەوتنە سەر ئەو هەیوانە سەرنجی ڕاکێشام، کچێکی بالابەرزم بینی، کە ڕووناکیی فتیلەکە لە چاوە گەورەکانیدا شەوقی دەدایەوە، قژی لە ڕەنگی تاریکیی ئەو شەوە دەچوو، لە دەنگی ڕاچڵەکیم کاتێک پرسیی، 'باوکە کێ بوو؟'

'خایمی کوڕی پوورە دالیاتە.'

لەگەڵ پۆلاک ئەمەی وت، پوورە فەریدە لە دەرگاکەوە دەر پەڕی و باوەشی پیا کردم و دەستی کرد بە گریان، بەدەم گریانەوە دەستی کرد بە لاواندنەوەی دایکم و مەتحکردنی. منیش لەسەر شانی پوورمەوە ڕوانیم، بینیم کچەکان بووبوون بە دووان و هەردووکیان لە منیان دەڕوانی، بێئاگا بووم لەوەی پوورم زیاتر چی پێ وتم، چونکە کاتێک ئەو قسەی بۆ دەکردم من لە چاوی ڕەش و گەشی پوورزاکانم دەڕوانی، کە لەو کاتەدا هەردووکیان هاتبوون و لە دەم دەرگاکەدا لە شانی یەکەوە ڕاوەستابوون.

بالایان وەکو یەک بەرز بوو، لە خەیاڵی خۆمدا بیرم لەوە

دەکردەوە، 'ئاخۆ ئەبێت کامەیان کانیشا بێت؟'

کاتێک پوورم لێم جیا بوویەوە و بەرامبەرم وەستا، لەبەر ڕوناکیی فتیلەکەدا بینیم ڕوومەتە تەڕەکانی شەوقیان دایەوە، لەو کاتەدا پۆلاک هاتە شانمەوە و دەستی بۆ لای دوو کچەکەی ڕاکێشا، 'ئادەی بزانم ئەم دوو خاتوونە دەناسیتەوە؟'

بێدەنگ بەرامبەریان وەستابووم و لێم دەڕوانین، هیچ جیاوازییەکت لە نێوانیاندا نەدەبینی، بالا و ڕەنگی قژ و شێوازی دەموچاویان، هەردووکیان هەمان کراس و سەڵتەیان لەبەردا بوو، لەو کاتەدا یەکێکیان لێم هاتە پێشەوە و شانی ماچ کردم، بۆنی مێخەکم کرد، بەهێواشی بە گوێمدا چپاندی، 'من ساشام.'

کاتێک ئەوەم بیست، خێرا لەوی تریانم ڕوانی و چوومە بەردەمی، ئەو دەستی تەوقەی بۆ درێژ کردم، دەستیم توند گرت و بۆ لای خۆم ڕامکێشا و لەبەرخۆمەوە وتم، 'کانیشا'

ئەو هیچی نەوت، تەنها ئەوەندە نەبێت لێی ڕوانیم، پۆلاک و پوورم پێشمان کەوتن و چووینە ژوورەوە، هێشتا دەستی کانیشام بەر نەدابوو، لەو کاتەدا ساشا خۆی خستە بەینمانەوە و دەستی نا بە پشتی منەوە و بۆ ژوورەوە پێش خۆی دام، لەگەڵ پۆلاک لە شانی یەکەوە دانیشتبووین و زوو زوو پرسیاری کەسوکارمی لێ دەکردم، دەیویست ئەوە بزانێت ئاخۆ کێ ماوە و کێ بە دەرد و برسێتی مردووە، پاشان باسی گوزەرانی خۆیانی بۆ گێڕامەوە، وتی، 'تاکو ئەمڕۆ چواردە کەسمان لێ مردووە، بێجگە لەو چوار جووەی لە ڕێگای کەرکووک بە دەستی هەمەوەندییەکان ڕووت کرانەوە و پاشان سەریان بڕین.'

هەروەها پۆلاک باسی ئەوەی بۆ کردم چۆن لە دەستی چەتە ڕزگاری بووبوو، لەو کاتەدا سەرنجم چووە سەر چاوی کانیشای

کچی و لە قسەکانی ئەو بێئاگا مام، کاتێک پوورم جامێک ماست و دوو پارچە نانی لەبەردەممدا دانا، بەرچاوی گرتم و لە خەیاڵەکانم دایبڕیم. پوورە فەریدە لە لامەوە دانیشت و دەستی خستە سەر ڕانم و پرسیی، 'ئەوە چی گەیاندیتیە ئێرە؟'

دەستم برد و پارچەیەکم لە نانە تیرییەکە کردەوە و ژەندم بە ماستەکەدا، پێش ئەوەی بیبەم بۆ دەمم پێم وت، 'سیلەی ڕەحم.'

پۆلاک دەستی کرد بە پێکەنین، 'جا بەم ئاگربارانە؟'

'پووری گیان بەنیازم بۆ بەغداد بچم.'

'وام زانی خسوسی بۆ کن ئێمە هاتوویت.'

'گرنگ ئەوەیە چاوم پێتان کەوت.'

'کوڕە، ماڵەکەت ڕووناک کردەوە.'

پوورم ئەمەی وت و دەستی لێک هەڵگلۆفین و پرسیی، 'دەی کەسوکار چۆنن؟ کێ ماوە کێ نەماوە؟'

'چیتان بۆ باس بکەم، ئەوەی ڕاستی بێت، گرانی و نەخۆشی شاری تەنک کردووە، ئەوەندەی من بزانم تەنها لە گەڕەکی جوولەکان بیست کەسی لێ مردووە، گرانییەکە لەو شارەدا خەڵک لە برساندا گۆشتی پشیلە و کەر ئەخۆن، تەنانەت ڕاوی سەگەکانیش دەکەن. ئەوە با دزیوفزی لەولاوە بوەستێت!'

'کوڕە لێرە خەڵک بەدەست هەمەوەندییەکانەوە گیریان خواردووە، ئەڵێیت گەلەگورگن و هەرچ کەسێکیان بەردەست بکەوێت گۆشتی دەخۆن و ئێسقانی دەپروێنن.'

لەو کاتەدا پۆلاک تفەنگەکەی گرت بەدەستەوە و چووە دەرەوە، کاتێک ئەو ڕۆیشت، پوورم وتی، 'ئەوە بۆ دوو ساڵ دەبێت ئێمە ئاوا پیاوەکانمان بە شەو و ڕۆژ ئێشک دەگرن.'

پوورم هەستا و بەدەم نزاخوێندنەوە بەجێی هێشتین، لەو کاتەدا

من سەرم داخستبوو، 'بۆچی بۆ بەغداد دەچیت؟'

کاتێک سەرم هەڵبڕی و لێم ڕوانین، نەمزانی کامیان بوون ئەو پرسیارەیان لێ کردم. لەو کاتەدا هەردووکیان لێیان دەڕوانیم، لەبەرخۆمەوە وتم، 'بۆ خوێندن.'

کانیشا وتی، 'زۆرت پێ دەچێت؟'

'چەند ساڵێک.'

لە چاوەکانیدا زیاتر لەو پرسیارە هاکەزاییەم دەبینی، کە پێ دەچوو باوکی یان پووریشم هەمان ئەو پرسیارەیان لێ بکردمایە، بەسەرنجەوە لێم ڕوانی و لە خەیاڵی خۆمدا بۆ وەڵامێکی گونجاوتر دەگەڕام، 'ساڵێک یان دووانم پێ دەچێت، بەڵام ئەگەر بگەڕێمەوە، ئەوا بێرەدا تێدەپەڕم.'

'هیواخوازم زۆرت پێ نەچێت!'

چەند هەناسەیەک بێدەنگ مام و لەوەدا بووم وەڵامی بدەمەوە، ویستم لە گەڕانەوەم دڵنیای بکەمەوە، لەو کاتەدا باوکی هاتە ژوورەوە و بەدوایدا ژوورەکە پڕ بوو لە کەسوکاری دایکم، ئەوەندە باسی گرانی و تاعوون و چەتەیان کرد، ماندوو بووم و بەردەوام باوێشکم دەدا و خەریک بوو خەو دەیبردمەوە، خۆم لە پوورە فەریدە نزیک کردەوە و بەگوێیدا چپاندم، 'من دەبێت تاوێکی تر بەرەو کەرکووک لەگەڵ کاروان بەڕێ کەوم.'

خێرا هەڵسایە سەر پێ و بانگی لە کانیشا و پۆلاکی مێردی کرد و داوای لێ کردن لەگەڵم بێن بۆ قاتی سەرەوە و لەوێ جێگام بۆ ڕابخەن، داوای یارمەتیم کرد و لەوێداماڵئاواییم لە هەندێکیان کرد، خاڵە موسا لەو کاتەدا هاتە ژوورەوە و خێرا باوەشی پێدا کردم، دوای هەواڵپرسین، سەرەخۆشیی مردنی دایکمی لێ کردم و پێی وتم، 'ئاگات لە خۆت بێت و متمانە بە هەموو کەسێک نەکەیت!'

خاڵە موسام ویستی درێژە بە باسەکانی بدات، منیش دەستم خستە سەر شانی و پێم وت، 'سبەینێ دەبێت تاریکوڕوون بەرەو کەرکووک بەڕێ بکەوم و پێویستم بە پشوو هەیە.'

پاشان پۆلاک چرایەکی گرت بە دەستیەوە و پێشم کەوت بۆ حەوشەکە و لەوێوە بە پلیکانەکاندا چووینە هەیوانی قاتی سەرەوە، دەرگای ژوورێکی کردەوە، سندوقێکی بۆراق، چەند پارچە ڕاخەر و لێفەیەکی قەدکراوی لەسەر بوو، چراکەی لە سووچێکی ژوورەکەوە دانا و ویستی دەست بداتە نوێنەکان، تەکانم دایە بەر خۆم و ویستم دەستی بگرم و پێی بڵێم، کە خۆم جێگا بۆ خۆم ڕادەخەم و پێویست ناکات تۆ عەزێت بکێشیت، لەو کاتەدا لە دەنگی کانیشا ڕاچڵەکیم، لە تەنیشتمەوە دەستێکی خستە سەر باڵی من و بە دەستەکەی تری ڕاخەرەکەی لە دەستی باوکی وەر گرت و پێی وت، 'نا باوکە وازی لێ بێنە بۆ من.'

پۆلاک دەستی گێڕایەوە و لێی پرسیم، 'سبەی کەی بەڕێ دەکەویت؟'

'پێش خۆرکەوتن.'

لەگەڵ پۆلاک لەبەر پەنجەرەکەدا وەستابووین، دیار بوو من و ئەو گەیشتبووینە کۆتاییی قسەکردنمان و بێدەنگ لە باڵاخانەکانی بەرامبەرمان دەڕوانی، کاتێک کانیشا جێگاکەی ڕاخست و فەرمووی لێ کردم، ئەوان پێکەوە لە دەرگای ژوورەکە چوونە دەرەوە و منیش چووم لەسەر جێگاکەم ڕاکشام، قاچم ڕاکێشا و دەستم دایە متیلی لێفەکە و ویستم ڕایکێشم و بیدەم بەسەر خۆمدا، لەو کاتەدا دەرگای ژوورەکە کرایەوە و کانیشا بە گۆزەیەکی ملبارێک و جامێکەوە گەڕایەوە، گورج دایە بەر خۆم و ویستم تۆزێک خۆم ڕاست بکەمەوە، بەدەم ڕۆیشتنەوە و بەبێ ئەوەی لێم بڕوانێت،

وتی، 'وتم نەوەک شەو تینووت بێت.'
سوپاسم کرد و گۆزەکەی لە لای جێگاکەمەوە دانا، لەو کاتەدا ڕاست بووبوومەوە و لەسەر جێگاکەم دانیشتبووم، پێش ئەوەی بڕوات هەڵوێستەیەکی کرد و بێ ئەوەی لێم بڕوانێت، لەبەرخۆیەوە لێی پرسیم، 'چاوەڕوانت بم؟'
سەری داخستبوو و لە بەرپێی خۆی دەڕوانی، منیش ماندووبوونی ڕێگا و قسەوباسەکانی ئەو ڕۆژە تەواوی خەیاڵمیان داگیر کردبوو، تاوێک بەبێدەنگی لێم ڕوانی، چووبوو لەناو دەرگاکەدا وەستابوو، پێیەکی نابووە ئەودیو دەرگاکە و لەوێوە لێی دەڕوانیم، دەمزانی چاوەڕوانی وەڵامی من دەکات، نازانم بۆ ئاوام پێ وت، 'ئەگەر خوا بۆم ڕێک بخات!'
'نزات لای خوا بۆ دەکەم، بەڵکو جارێکی تر بە ڕێبواری ڕێگات بخاتەوە سەر ماڵی ئێمە.'
'ئەگەر لە نسیبم نووسرابێت، بەتایبەتی بۆ دێنیتان دێمەوە.'
'خوازیارم لە مەقسەدم گەیشتبیت!'
هەموو گیانم کەوتبووە سەر ئارەقە و دەمم تەتەڵەی دەکرد، ویستم لەوە دڵنیای بکەمەوە، کە بەدڵنیاییەوە بەتایبەتی بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە، لەو کاتەدا هەردووکمان لە دەنگی تەقەی تفەنگێک ڕاچڵەکین، کاتێک من ڕووم لەو وەر گێڕا و سەرنجم لە پەنجەرەی ژوورەکە دا، ئەو لە دەرگاکە چووە دەرەوە و منیش تاوێک بەدەوری خۆمدا ڕوانیم، پاشان لە دڵی خۆمدا کەوتمە سەرزەنشتکردنی خۆم، لە دەرەوە گوێم لە دەنگی پیاوەکان بوو پێکەوە قسەیان ئەکرد، لەسەر پشت پاڵ کەوتبووم و لە بنمیچی ژوورەکەم دەڕوانی، بیرم لە کانیشا دەکردەوە و قسەکانی لە بەر گوێمدا بەردەوام دووبارە دەبوونەوە، شێوازی دەموچاوی لە پێشچاومدا لا نەدەچوو، لە

خەیاڵی خۆمدا دەستیم گرت و چەندین وەڵامی جۆراوجۆرم دایەوە.

کاتێک پۆلاک لە خەون بەخەبەری هێنام، لەگەڵ خاڵە موسام پێکەوە لە تەنیشتی جێگاکەمەوە وەستابوون، دیار بوو چراکەی تەنیشتم کوژابۆوە، خاڵە موسا فتیلەیەکی بەدەستەوە بوو، دەرەوە هێشتا تاریک دیار بوو، خاڵە موسا وتی، 'ئەو پیاوانە قەیرێکە چاوەڕوانی تۆن.'

خێرا ماڵئاواییم لە پوورە فەریدەم کرد و سەروخوار چاوم بە ماڵەکەیاندا بۆ کچەکان گێڕا، ویستم لە پوورم بپرسم، دەی کچەکان لەکوێن؟

پاشان قسەکەم گۆڕی و لەژێر لێوەوە و بەشەرمەوە پێم وت، 'پووری گیان، من وەڵامێکی کانیشا قەرزارم!'

بەسەرنجەوە لێی ڕوانیم و ناوچاوی چرچ کرد و برۆکانی لێک نێزیک کردنەوە، پێش ئەوەی وەڵامم بداتەوە، پۆلاک دەستی دایە باڵم و پێش خۆی دام و بەرەو کۆڵان ڕۆیشتین، بەناچاری لەگەڵیاندا ڕۆیشتم، هەردووکیان دوو تفەنگی درێژیان لە شان کردبوو، پیاوێکیش دووراودوور لە دوامانەوە بوو، کاتێک گەیشتینە لای کاروانەکە، هەموو لە دوورەوە لە ئێمەیان دەڕوانی و عەبدولکەریم ئەلیاس بە دەنگێکی بەرز وتی، 'ئەگەر تۆزێک بچوویتایەتەوە سەر باوکت، ئەوا ئێمەت ئەوەندە ماتڵ نەدەکرد.'

داوای لێبوورنم لێ کرد و لەگەڵ خاڵە موسا و پۆلاک ئەملاولای یەکمان ماچ کرد و لەگەڵ کاروان کەوتمە ڕێ.

تاوەکو گەیشتینە ناو شاری کەرکووک، ڕێبەرەکەمان چەند جارێک ڕێگاکەی گۆڕی، کاروانچییەکان ڕەشۆی وڵاخەکانیان لە پشتی یەک بەست و قیتارێکیان لێ دروست کردن، ڕێبەرەکە ڕەشۆی وڵاخەکەی پێشەوەی گرتبوو، من و عەبدولکەیم لە ڕاست و چەپی

ولاخەکانەوە دەڕۆیشتین، سەرجەم پیاوەکانی تر بە چواردەورماندا بلاوەیان لێ کردبوو، تفەنگەکانیان لەناو دەستیان گرتبوو، بەو جۆرە دووراودوور بازنەیەکی گەورەیان بەدەوری ئێمەدا کێشا بوو، پێش خۆرئاوابوون لە لاڕێوە گەیشتینە ناو شاری کەرکووک، کاتێک لە گەڕەکی ڕەحیماوا گەیشتینە خانی ئەولا، عەبدولکەریم پێی وتم، 'لێرە دەمێنینەوە تاکو کاروان لە موسڵ و هەولێرەوە دەگات، ئەوسا پێکەوە بەرەو بەغداد دەڕۆین.'

پێم وت، 'دەچم بۆ کنێسەتەکە و ئەمشەو لەوێ دەمێنمەوە و بەیانیی زوو دەگەڕێمەوە.'

'نا، نا، سبەی لێرە دەمێنینەوە، دوو سبەی پێش خۆرکەوتن باشە لێرە بیت، کوڕە دوا نەکەویت.'

سەرم بۆ عەبدولکەریم ئەلیاس.لەقاند و لای ئەوان ڕۆیشتم، دەستە دەستە لەسەر جادە و ناو کۆلانەکاندا سەربازە تورکەکان بەسەر ماڵەکاندا دەگەڕان، هەر وەکو چۆن مامە سلێمانم ئامۆژگاریی کردبووم، تاکو توانیم خۆم لێ پاراستن و بە لاڕێ و بندیواری ماڵەکاندا خۆم گەیاندە گەڕەکی جوولەکان، کاتێک بە بەردەمی ماڵی ماتاندا تێپەڕیم، تاوێک لە سەر دیوارەکەوە لە ناو حەوشە و ماڵەکەم ڕوانی، جێگای سووتانی پەیکەرەکانی ماتان ئاسەواری پەڵەیەکی ڕەشی گەورەی لەناو باخەکەدا بەجێ هێشتبوو، بە جۆرێک، کە تەواوی باخەکە و دیواری حەوشەکەش ڕەش دیار بوو، کاتێک گەیشتمە کنێسەتەکە، شارۆنی حاخام بەتەنها لەوێ بوو، ناو کنێسەتەکە زۆر چۆڵ دیار بوو، بۆنی گەچ و قوڕ و لیتەی لێ دەهات، شارۆن سەری پێچراو و دەستێکی بە مشکییەک ڕاستوچەپ لە ملیدا هەڵبەستبوو، کنێسەتەکە بێجگە لە پێنج کورسی و مێزێک، هیچی تری تێدا نەبوو، شارۆنی حاخام

بەردەوام بەدەوری کورسی و مێزەکەدا دەگەڕا و لەبەرخۆیەوە نزای دەکرد، کاتێک منی بینی، بەبێزارییەوە لێی ڕوانیم و وتی، 'ئەوەی کنێسەت بسووتێنێت، بێڕێزی بە خوای خۆی دەکات.'

کاتێک سڵاوم لێ کرد، وەڵامی نەدامەوە و بەردەوام بوو، وتی، 'شێخوڵاکان، هەموویان عەبدی خەلیفە تورکەکانیانن!'

'ئوستاز، چی ڕووی داوە؟'

'کاتێک ئەوان دێن و بە ناوی خواوە موقەدەساتی ئێمە دەسووتێنن، ئیتر چیتر قابیلی ئەوەیە، کە ڕوو نەدات، ئەو خوایەی ئەم جۆرە زوڵمانەی لا قبووڵە، پێ ناچێت خۆی لە عەرەبێک یان تورکێک زاناتر بێت.'

ئەو حاخامە پیرە چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک، هاتبووە بەردەمی من و دەستێکی خستبووە سەر شانم، پاش تاوێک بێدەنگی، وتی، 'حەفتەی پێشوو، لەگەڵ قوتابییەکانم مەشغووڵی دەرسخوێندن بووم، لەناکاو مەلا شەمسەدینی گەیلانی و دەروێشەکانی هاتن، هەموو شمشێریان بە دەستەوە بوو، وەکو قەڵای عەدەنیان گرتبێت، لە پێش چاوی خۆمدا ئەلیاسی برازا و قوتابیمیان سەر بڕی، ئیتر کارێکیان پێ کردین ئیسلام بە دوژمنی خۆی نەکردبێت، ئەگەر ئەو مەخفەرە نزیکمان نەبووایە هەموومانیان بە دەردی ئەلیاس دەبرد، کاتێک حەیتە تورکەکان گەیشتن، دوانیان لە ژوورەوە مانەوە و خۆیان نەدا بەدەستەوە و ئاگریان لە خۆیان و کنێسەتەکە بەر دا، تاوەکو بوون بە خۆڵ هاواریان لە خوا دەکرد، وەکو ئەو خوایەی ئەوان بانگیان لێ دەکرد، ئەوەندە نەزان بێت، بە کوشتنی مەزڵومێک ئەوان خەڵات بکات.'

دوای ئەوەی حاخام هەموو بەسەرهاتی ئەو ڕۆژە و ڕۆژانی دواتری بۆ گێڕامەوە، پێکەوە چووینە ژووی پشتەوە و لەوێوە لە

دەرگایەکەوە چووین بۆ ماڵەکەی خۆی، ماڵەکەی دەکەوتە پشتی کنێسەتەکەوە، بەدەم ڕێوە لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەگەر ئەم دەروازەیە نەدەبوو هەموومانیان قەتڵوعام دەکرد!'

ئەو ئێوارەیە دوو نانی هێنا و ڕۆنی پیا سوین و پیازی جنینە سەر، دوای ئەوەی نانمان خوارد، گۆزەیەک شەراب و دوو جامی هێنا و لەسەر سفرەکە داینا و لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەوەیش شەرابی ماتان، ئەزانم بە خەیاڵت غەریب نییە!'

دوو ڕۆژ لە کەرکووک مامەوە، ئەو بەیانییەی لای شارۆنی حاخام ڕۆیشتم، دەستیم ماچ کرد، ئەویش دەستی هێنا بە سەرمدا و تاوێک سەرم نا بە سنگیەوە، جلەکانی بۆنی باوکمیان لێ دەهات، هەستم پێ کرد، دەستی لەسەر سەرم ئەلەرزین، کاتێک سەرم لەسەر سنگی هەڵبڕی و لێم ڕوانی، خۆی پێ ڕانەگیرا و بێدەنگ چەند دڵۆپێک فرمێسک بە ڕوومەتەکانیدا گل بوونەوە و تێکلاو بە بنجی ڕیشە سپییەکەی بوون. پاشان بە دەنگێکی تێکشکاوەوە، لەبەرخۆیەوە وتی، 'هەموومان لێرە بڕۆین باشە، پێویستە ئێمە لەوێ بین، چونکە هەموو شتێک لەوێ ڕوو دەدات!'

لەو کاتەدا هیچم نەوت، بەڵام قسەکانی شارۆنی حاخام تەواوی خەیاڵیان داگیر کردم، لای ئەو ڕۆیشتم و بەدەم ڕێگاوە خەریکی لێکدانەوەی قسەکانی ئەو بووم، کاتێک ئەوەم بیر کەوتەوە، کە ئەو قسەیەی حاخامم پێشتر بیستبوو، لە گەڕەکی جوولەکان دەر چووبووم، پاشان تاوێک وەستام و لە دوورەوە لە ماڵە قوڕینەکانی گەڕەکی جوولەکانم ڕوانی، لەبەرخۆمەوە وتم، 'من ئەبێت لەوێ بم، چونکە هەموو شتێک لەوێ ڕوو دەدات!'

کاتێک گەیشتمە لای کاروانچییەکان لە خانەکەی ئەولا، ڕوانیم ژمارەی وڵاخەکان زیاتر لە دوو سەد وڵاخ دەبوون و خەڵکێکی زۆر

لەوێ بۆ ڕۆیشتن خۆیان ئامادە کردبوو، دیار بوو کاروان لە هەولێر و مووسڵەوە گەیشتبوو، نزیکەی سێ سەد پیاو دەبووین، کاتێک کەوتینە ڕێ عەبدولکەریم ئەلیاس پێی وتم، 'تۆ لەگەڵ کاروانەکەی شەمعوون شومر کوێیی بازرگان دەبیت!'

ئەو کاروانەی لە هەولێرەوە هاتبوو، ژمارەیان لە سەد کەس زیاتر دەبوو، شەمعوون شومر هەر لە دوورەوە بە ناوی خۆمەوە بانگی کردم و دەیزانی کێم و کوڕی کێم، پێم وا بوو عەبدولکەریم ئەلیاس باسی منی بۆ کردبوو، هەولێرییەکان بێجگە لە کۆڵ و بارەکان، چوار خێزانیشیان لەگەڵدا بوو، لەوێدا پێنج ژن و دوانزە منداڵم بژارد، داوایان لە من کرد لە ڕێگا هاوکارییان بکەم، پاشان کاتێک گەیشتینە بەغداد، لیرەیەکی زێڕم پێ بدەن. بە درێژایی ئەو ڕێگایە لە خەیاڵی بینینەوەی کانیشادا بووم، ئیتر دواقسەی و چاوە ڕەشەکانی کانیشا تەواوی خەیاڵمیان داگیر کردبوو.

ئەو ڕۆژە بۆ ژن و منداڵەکان چەند بارگیرێک و دوو عارەبانەیان دابین کردبوو، ژنەکان بە نۆرە سواری بارگیرەکان دەبوون و منداڵەکانیش لەناو عارەبانەکەدا دانیشتوون، لە ڕێگا لە ژنێکم پرسی، 'بۆچی ئەو ڕێگا دوورەتان گرتۆتە بەر و خێرە بەرەو بەغداد دەڕۆن؟'

ژنەکە لە وەڵامدا ئاوای پێ وتم، 'لەسەر فەتوای مەلا ئەبوبەکری لەناو خانووەکانی قەراتێ دەر کراین. دوای ئەوەی حوجرەکەی مزگەوتی گەورەی ناو قەراتێ سووتا، ساموێلی زاوامان و مێردی خوشکمیان بەوە تۆمەتبار کرد، گوایا ئەو حوجرەکەی سووتاندییە، دوای ئەو بەزمەی خەرکی ناو قەراتێ ساموێلیان گرت!'

لەو کاتەدا ژنەکە قوڕگی پڕ بوو لە گریان و نەیتوانی لە قسەکانی بەردەوام بێت. ئیتر ژنەکان بەکۆمەڵ دەستیان کرد بە

شین و واوەیلا و لەخۆدان، بە جۆرێک زۆربەی کاروانچییەکان لە ئێمەیان دەڕوانی، لەو کاتەدا کابرایەکی ڕیشنی کوتەبالا لێم هاتە پێشەوە و دەستی گرتم و لە ژنەکانی دوور خستمەوە و پێی وتم، 'ئەرێ برا ئەو شارەهەنگەت لۆ ورووژاند و هارت کردن، بە خودای ئەو داماوانە لە هەولێرێوە تاکو کەرکووکێ دەمیان لێک نەنایە، هەر شین و واوەیلایان بووە، لۆ خۆم بەدیاریانەوە بووم و بەو چاوانەی خۆم بینیم ئەو داماوانە چییان لێ بەسەر هات.'

کابرا بەدەم قسەکردنەوە کڵاو و جامانەکەی لە سەری داگرت و نایە بنباڵی، دوای ئەوەی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا لێی ڕوانیم و وتی، 'بە سامویڵە شەل مەشهوور بوو، بە خودای ئەوەندەیان لێ دابوو هەر چوار پەلیان شکاندبوو، داوایان لێ کردبوو ببیتە موسرمان و ئەوانیش لێی خۆش دەبن، ئەویش بەوە ڕازی نەبووە، پاشان بەردەبارانیان کرد و کوشتیان، ئیدی هەر ئەو ڕۆژە خەرکەکە پەلاماری ماری جووەکانی ناو قەراتیان دا، دوای تارانکردن و سووتانی مارەکانیان، ئەوەتا بە چاوی خۆت دەیبینیت کە کوو بە دەستی بەتار دەربەدەریان کردن، جووەکانی نێو قەراتێ هەموویان قەومی یەکتری بوون، ئەوەتا ناچار کراون بەرەو بەغدایە بچن و لەم گرانی و نەگبەتییەدا ئەو ڕێگایەی بگرنە بەر، بە خودای برا چوار پیاوی ئەو خێزانەی لە سەفەربەلیکن و خودا دەزانیتن کەنگی دەگەڕێنەوە ئێروکانە؟'

دەمەو ئێوارەی ئەو ڕۆژە، کاتێک لە دووزخورماتوو لامان دا، لە ژنەکەم پرسی، ئایا ئێوە دەمێکەیە لە هەولێر دەژین، ئەو لە وەڵامدا پێی وتم، 'ئەمەی جوولەکە زیاتر لە دە بنەچەمان لەناو قەراتێدا براونەتەوە و قڕیان کردن.'

پێنجی سێی ساڵی ١٩١٧ لەگەڵ کاروان گەیشتمە بەغداد،

عەبدولکەریم ئەلیاس ناونیشانی دوکانێکی لە شۆڕیجە پێ دام و پێی وتم، 'کەی ویستت هەواڵم بزانیت، دەتوانیت پرسیاری من لەوان بکەیت.'

کاتێک ویستم بڕۆم، بانگی کردم و پارچە پەڕۆیەکی پێچراوەی دایە دەستم و پێی وتم، 'ئەوەش ئامانەتییەکەت، سلێمان پێی داوم و دەستگیرۆیی بکە و بەفیڕۆی مەیە.'

لە خەیاڵی خۆمدا لە خۆئامادەکردندا بووم و ویستم پێی بڵێم، 'حەقم لای ئەو خێزانە هەولێرییەیە و چۆن بتوانم لێیان وەر بگرم؟'

ئەو بواری قسەکردنی پێ نەدام و دەستی تەوقەکردنی بۆ درێژ کردم و خواحافیزیی لێ کردم، ئیتر منیش بێجگە لە سوپاسکردنی، هیچم نەوت.

کاتێک ئەوانم بەجێ هێشت، بینیم هەموو کۆڵان و جادەکانی شار پڕ بوون لە سەرباز و خەڵکی مەدەنی، هەموو پێکەوە خەریکی سەنگەرلێدان بوون، دوای چوار کاتژمێر بە پرسیار و گەڕان گەیشتمە گەڕەکی تەورات و چوومە بەردەمی ماڵی مامە ئیسماعیل، کاتێک لە دەرگام دا، ژنە تازەکەی دەرگای کردەوە و بەساردوسڕییەکەوە پێشوازیی لێ کردم، دوای ئەوەی لەبەرخۆیەوە چەند جارێک وتی، پیاومان لە ماڵەوە نین، پاشان لە پێش منەوە چووە ژوورەوە و دەرگای ماڵەکەی بە ڕوومدا داخست، ناچار بەتەنیا لەسەر کورسییەک و لەناو باخەکەیاندا دانیشتم، پێش خۆرئاوابوون مامە ئیسماعیل لەگەڵ ڕەحیم و ڕەحمان لە بازاڕ گەڕانەوە، کاتێک مامە ئیسماعیل دەرگای حەوشەکەی کردەوە، پێی وتم، 'دەمێکەیە هاتوویت؟ بۆچی نەچوویتەتە ژوورەوە؟ دەی بۆ ڕیفکا خوڵقی نەکردوویت خۆ تۆ بێگانە نیت؟'

لە وەڵامدا پێم وت، 'ئەوەندە نابێت گەیشتووم و خولق کراوم و

خۆم نەچوومەتە ژوورەوە!'

ڕەحیم و ڕەحمانی کوڕی هاوتەمەنی من بوون و هەردووکیان بە یەک سک لە سلێمانی لەدایک بووبوون، چەند ڕۆژێک دوای لەدایکبوونی ئەوان دایکیان مردبوو، پێکەوە چەند ساڵێک لە کنێسەتەکەی جوولەکانی سلێمانی خوێندبوومان، پاشان مامە ئیسماعیل ئەو ژنە تازەیەی هێنا و لەبەر خاتری ئەو بۆ بەغداد گوێزایەوە، ئەوسا لە دایکمم بیست، کە کەسوکاری ڕازی نەبوون ڕیفکا بێت لە سلێمانی دانیشێت.

ئیسماعیل ئیسحاق، لە شاری سلێمانی بە سمەی ئاڵتوونچی ناسراو بوو، ئەو پیاوە نە برای باوکم بوو نە ئامۆزای، بەڵکو لەگەڵ باوکمدا هاوڕێی منداڵیی یەکتر بوون و لە جوولەکان دراوسێ ماڵمان بوو، ئێمەش هەر لە منداڵییەوە بە مامە بانگمان دەکرد، هەروەها ڕەحیم و ڕەحمانیش بە باوکمیان ئەوت مامە شەلمۆ.

خێرا پرسیاری ئەوەم لێ کردن، ئاخۆ ئەو هەموو سەرباز و خەڵکە چەکدارە لەسەر جادە و ناو کۆڵانەکاندا چی دەکەن؟

ڕەحمان باسی ئەوەی بۆ کردم، کە سوپای ئینگلیز لە چەند قۆڵێکەوە هێرشیان بۆ سەر شاری بەغداد هێناوە، موختاری گەڕەکەکان داوایان لە خەڵکی کردووە هەموو چەک هەڵگرن و دژی ئینگلیز بوەستنەوە، لەو کاتەدا مامە ئیسماعیل لەبەرخۆیەوە وتی، 'وەکو ئێمە زۆر لە تورک ڕازی بین، تاکو بۆ پاراستنی خەلیفەکەیان خۆمان بەکوشت بدەین.'

ڕەحمان لە وەڵامدا وتی، 'ئەوەندەیان هێز هێناوەتە ناو شاری بەغداد، مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت!'

باوکی لە ڕەحمانی ڕوانی و بەبێزارییەکەوە، 'کوڕی خۆم، ئەوە زیاتر لە سەد ساڵە تورک زوڵممان لێ دەکات، جا نازانم مەگەر

یەکێک زۆر نەفام بێت بە دڵ بۆ ئەوان بجەنگێت.'

'مامە گیان وا مەڵێ، لای زۆرینەی خەڵک تورکەکان زۆر موقەدەسن.'

'خوای نەوەی ئیسرائیل خۆیان و خەلیفەکانیان تەفروتوونا بکات.'

درەنگانی شەو کوڕەکان جێگایان لە ژوورەکەی خۆیان بۆ چاک کردم، ئەو شەوە بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا گوێم لە دەنگی عوود بوو، ڕەحیم و ڕەحمان هەردووکیان لە تیپێکی موزیکدا بوون و یەکێکیان عوودی ئەژەند و ئەوی تریان تەپڵی لێ دەدا، ئەو شەوە ئەوەندە سەرسام بووم بە دەنگی تەپڵ و عوود، تاکو بەیانی نەخەوتین و بەردەوام داوام لێ دەکردن گۆرانی بڵێن و موزیک بژەنن.

ڕۆژی دوایی پێکەوە بۆ بازاڕی مسوال لە شۆڕیجە چووین، ئەو بازاڕە بێجگە لە موشتەریەکان هەموو خاوەندوکان و دەستگێڕەکانیش جوو بوون، چەند جارێک لە ڕاستەوە بۆ چەپی ئەو بازاڕە گەڕام، ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام مسگەر و سەڕافەکان بوون. دەنگی لێدانی مس و زیوەکانم لە دوورەوە دەبیست، کاتێک دوای دەنگەکان کەوتم، بینیم چۆن زەنگۆڵەی دەنگی بەرکەوتنی قەڵەمە ئاسنەکان لەسەر ڕووی مسەکاندا بەردەوام دەزرینگانەوە، تاوێک بەسەرنجەوە لێم دەڕوانین، سەرسام بووم بە دەستڕەنگینیی ئەو مسگەرانە، کاتێک نەخشی سەر مسەکانیان هەڵدەکۆڵی، لای سەڕافەکان ئەوەی لە سەرەتاوە جێگای سەرسوڕمانم بوو، ئەو هەموو پارە جۆراوجۆرە بوو، کە لەبەردەمیاندا دانرابوون و بەبێ ئەوەی ترسیان هەبێت لە دزین یان فڕاندن، سەڕافەکان هەموو بەڕیز دانیشتبوون و تەڕپووشی ڕەنگسوریان لەسەردا بوو،

سەرتاپا جلەکانیان کەوا و سەڵتەی سپی بوو، سمێڵیان باریک و ڕیشیان تاشیبوو، لە بەردەمیاندا پارچە کاغەز و دراوی ناوازەم دەبینی، کە ئەوسا نەمدەزانی ئاخۆ بۆچی بەکار دێن یان لە چ وڵاتێکەوە هاتوون، ئەو ڕۆژە چەند جارێک لە ڕاستەوە بۆ چەپ بە بازاڕی مسوالدا گەڕام و لەو خەڵک و کارگەرانەم دەڕوانی.

بەو جۆرە چەند حەفتەیەک تێپەڕی، شەوێکیان لە دەنگی ناڵە و تەقەکردن بەئاگا هاتین، خەڵکی گەڕەک هەموو هاتبوونە بەردەرگا و پۆل پۆل وەستابوون و قسەیان دەکرد، باس لەوە دەکرا گوایا سوپای ئینگلیز هێرشی بۆ سەر شاری بەغداد هێناوە.

سەرلەبەیانیی ڕۆژی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩١٧ سوپای بەریتانی شاری بەغدادیان داگیر کرد، شەقامی شۆڕیجە بە جووەکانی دانیشتووی بەغداد ٠ تەنرابوو، منیش لەگەڵ ڕەحمان و ڕەحیم لە کەنارەوە وەستابووین، هەموو چاوەڕوانی هاتنی سەربازە ئینگلیزەکان بووین، دوور لە ئێمەوە دەست کرا بە هاوار و بانگ لەو سەربازە عوسمانییانەی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بەدیل گیرابوون، کاتێک گەیشتنە بەردەمی ئێمە، لەناکاو لەناو هاوار و بانگی خەڵکەکەدا دەنگی شریخەی تەقەی تفەنگ هات و چەند سەربازێکی تورک لە ڕیزەکاندا کەوتنە سەر زەوی، ئەو سەربازە ئینگلیزانەی لەملاولای سەربازە تورکە دیلکراوەکانەوە دەڕۆیشتن، ڕووی تفەنگەکانیان کردە خەڵکەکە و دەستیان کرد بە هاوارکردن، بەو جۆرە چەند جارێک تەقە لە سەربازە دیلەکان کرا و زیاتر لە بیست سەرباز لە بەرپێی ئەوانی تردا کەوتبوون، خەڵکەکە لەمبەر و ئەوبەری جادەکەوە بەردیان لە سەربازە دیلەکان دەگرت، چەند جارێک بە چەقۆ هێرش کرایە سەر دیلەکان، سەربازە ئینگلیزەکان ناچار بوون ڕووی تفەنگەکانیان لە خەڵکەکە کرد و چەند جارێک

بەسەریاندا تەقەیان کرد، لەو کاتەدا کەس نەیدەزانی لە کوێوە تفەنگ بە سەربازە تورکەکانەوە دەنرێت، پاشان چەندین سەربازی هیندی بەڕاکردن خۆیان کرد بە بالاخانەیەکی بەرامبەر ئەو جێگایەی ئێمەی لێ وەستابووین و دوو گەنجیان بالبەست کرد و لەگەڵ خۆیاندا بردنیان، لەو کاتەدا ڕەحیم پێی وتم، 'ئەو دوو کەسەی تەقەیان لە سەربازە تورکەکان کرد، ئەندامی بزووتنەوەی خەڵتوزن.'

ویستم پرسیاری ئەوە لە ڕەحیم بکەم، 'ئایا بزووتنەوەی خەڵتوز چییە؟'

لەو کاتەدا سەربازە ئینگلیزەکان هێرشیان هێنایە سەر خەڵکەکە و ئێمەش بڵاوەمان لێ کرد و بۆ دوکانەکەی مامە ئیسماعیل لە شەقامی مسوال گەڕاینەوە.

ئەو ئێوارەیە، کاتێک دەرگای دوکانەکەمان داخست، مامە ئیسماعیل ئاڵتوون و کەرەستەی ناو دوکانەکەی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە، دوای ئەو ڕۆژە حەفتەیەک زیاتر نەیهێشت ئێمەش لە ماڵ بچینە دەرەوە، زیاتر لە مانگێک ئاڵۆزی و شەڕ و تۆڵەسەندنەوە لە لایەنگرانی عوسمانییەکان و ئەفسەر و کاربەدەستەکانیان بەردەوام بوو، شەو و ڕۆژ لەناو گەڕەک و سەر جادەکانی شاری بەغداد گوێت لە دەنگی تەقەی تفەنگ دەبوو، چەند مزگەوتێک سووتێنران و چەندین مەلای لایەنگری تورکەکان کوژران. دوای دوو مانگ ئینگلیزەکان بە زەبری هێز توانییان ئارامی بۆ شاری بەغداد بگەڕێننەوە.

دوای ئەوەی سێ مانگ بوو لە شاری بەغداد بووم، چووم بۆ کنێسەتی ئیسحاق لە گەڕەکی تەورات و ئەو نامەیەی مامە سلێمانم پێی دابووم گەیاندم، پاشان حاخامەکە سەری بۆ لەقاندم و پێی وتم، کە چەند مانگێک پێش ئەو ڕۆژە لە هاتنی من ئاگادار کراوەتەوە،

پاشان پرسیاری ئەوەی لێ کردم، 'بۆچی ئەوەندە دوا کەوتوویت؟'

لە وەڵامدا باسی شەڕ و نائارامیی ڕێگا و ناو شاری بەغدادم بۆ کرد، حاخام سەری ڕاوەشاند و لەبەرخۆیەوە وتی، 'خۆ من ڕۆژانی شەڕ و نەهامەتی دەرگای کنێسەت داناخەم!'

لەو کاتەدا وام زانی حاخام لە مەبەستی قسەکەم تێنەگەیشتبوو، هەر بۆیە کاتێک قسەکەم دووبارە کردەوە، تەنها سەری بۆ ڕاوەشاندم و هیچی نەوت، حاخام دانیاڵ کابرایەکی کورتەباڵای گەنمڕەنگ بوو، ئەوەندە بەهێواشی دەدوا، ناچار بووم زۆر خۆمی لێ نزیک بکەمەوە تاکو لە قسەکانی تێبگەم.

لەدوای ئەو ڕۆژەوە هەموو بەیانییەک دەچووم بۆ کنێسەتی ئیسحاق، دوانیوەڕوانیش لە گەڕەکی تەوراتەوە بەپێ بە کەناری ڕووباری دیجلەدا بۆ دوکانەکەی مامە ئیسماعیل لە شەقامی مسوال دەچووم، شەوانی هەینییش لەگەڵ ڕەحیم و ڕەحماندا دەچووم بۆ یەکێک لەو یانانەی تیپی مۆسیقاکەی ئەوان ئاهەنگیان لێ دەگێڕا.

دوانیوەڕوان لەبەر ئەوەی کاتم زۆر بوو، بە جادە و کۆڵانەکانی شاری بەغدادا دەگەڕام، لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا لە بازاڕی سەرای چوومە کتێبخانەی سەردەم، خاوەنەکەی بە ناوی مەحموود حیلمەوە خۆی پێ ناساندم، قاوەی گەرمی پێشکەش کردم و چەند کتێبێک و دوو گۆڤاری خستە بەردەستم، پاشان پێی وتم، 'ئەم گۆڤارانە لە میسرەوە بۆمان هاتوون،'

کاتێک قسەی بۆ دەکردم، کتێبێکی قەبارە ئەستووری لەناو دەست گرتبوو، لەسەر بەرگەکەی نوسرابوو 'رأس المال'. زیاتر لە سێ کاتژمێر لە کتێبخانەی سەردەم بووم، بێجگە لە من، کەسی تر سەردانی ئەو کتێبخانەیان نەکرد، کاتێک ویستم بڕۆم، مەحموود حەلیم کتێبی 'رأس المال'ی بە دیاری دایە دەستم.

شەش مانگ بوو لە بەغداد بووم، ئێوارەیەکیان مامە ئیسماعیل نامەیەکی قەدکراوی خستە ناو دەستم و پێی وتم، 'سلێمانی هاروونی ئاشەوان بۆی ناردویت.'

نامەکە پارچە کاغەزێکی بۆر بوو، تەنها ئەمەی لەسەر نووسرابوو،

'باوکت لە سەرەمەرگدایە و بە زووترین کات خۆت بگەیەنەرەوە سلێمانی، خافڵ نەبیت!

سلێمانی هاروونی ئاشەوان.'

## ١٠

ئێوارەی ڕۆژی هەینیی مانگی نۆی ساڵی ١٩١٧، باوکم لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، ئەو ڕۆژە گەڕەکی جوولەکان تەواو خرۆشابوو، لە ماڵی ئێمەدا تفت هەڵدایە نەدەکەوتە سەر ئەرز، کاتێک لە کنێسەت بەدیار مەیتەکەیەوە بووین، بینیم هەموو ئەو خەڵکە لە منیان دەڕوانی، خامێی موشێی عەتار خۆی لێ نزیک کردمەوە و بە گوێمدا چپاندی، 'هەتیو، تۆزێک بگری و دوو دڵۆپ فرمێسک بە چاوتا بێتە خوار!' .

لەو ساتەدا ویستم گوێ لە ئامۆژگاریی هاوڕێکەم بگرم، بەڵام لەبەر ئاڵۆزیی خەیاڵەکانم و تێنەگەیشتنم لە مانای مردن، نەمتوانی بۆ باوکم بگریم، خەمی من زۆر جیاوازتر بوو لە خەمی ئەو خەڵکەی ئەو شەوە لە کنێسەتەکە ئامادە بوون، ئەوان هەموو خەمی خۆیان بوو، خەمی لەدەستدانی سەرگەورە و دەمڕاستەکەیان دەخوارد، پیاوێکیان لەدەست دابوو بە هەموو تەمەنی لە خزمەتی ئەواندا بوو، شەو و ڕۆژ ماڵ و دوکانەکەی کردبوو بە جێگای چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەوان.

نانیان نەدەما، بۆ لای باوکم دەهاتن.

گرانی و شەڕ لە شاردا دادەکەوت، بەردەرگایان بە ئێمە دەگرت.

دەمزانی ئەوان لەبەر لەدەستدانی بەشەکەی خۆیان دەگریان، دەمویست لە خەیاڵی خۆمدا باوەڕ بەوە بکەم ئیتر باوکم مردووە و زیندوو نابێتەوە، تاوەکو ترسم لەوە نەبێت جارێکی تر پەلامارم بدات

و بۆ هەموو شتیک سەرزەنشتم بکات، ئەوەم دەزانی و دەمبینی لاشەی بێگیانی لەوێدا کەوتووە، ویستم پڕ بە هۆڵی کنێسەتەکە هاوار بکەم و بەو خەڵکە بڵێم، خەڵکینە داوای لێبورنتان لێ دەکەم، من وەکو باوکمم پێ ناکرێت و ئیتر ئێوە لەمڕۆ بەدواوە موشووری خۆتان بخۆن، ترسم لە لاشەی بێگیانی باوکم خەیاڵەکەیان پێ گۆڕیم، پاشان لەژێر لێوەوە بەچپە بە خۆمم وت، 'ئەرێ باوکە بۆ مردیت و پەلەت چی بوو، دەی نەتدەزانی من جارێکا ئامادە نیم و ناتوانم کارەکانی تۆ راپەڕێنم.'

پاشان بە گوێی خامێی موشێی عەتاردا چپاندم، 'ئەرێ ئەو خەڵکە کەی دەڕۆن؟'

چاوی لێ داچریم و توند لاڕانی گوشیم، لەژێر لێوەوە و بە گوێمدا چپاندی، 'ئای جارێ لەکوێتە قوڕت بەسەر، ئەوە هەتیویش کەوتیت!'

دەمەو بەیانیی ڕۆژی دواتر، پێش خۆرکەوتن تەرمەکەیمان گەیاندە گۆڕستان، باوکم وەسیێتی بۆ کردبووین لە تەنیشت باڕئاموونی باپیرەیەوە لە گۆڕستانی جوولەکان بە خاکی بسپێرین، کاتێک تەرمەکیمان لەگۆڕ نا و چەند پیاوێک گڵیان بەسەردا دەکرد، لەگەڵ حاخامدا نزای کادیشمان لەسەر گۆڕەکەی خوێند، دوای ئەوە مامە سلێمان پێی وتم، 'باپیرە خواجە خینۆ یەکەم جوو بووە لە سەرەتای دروستبوونی سلێمانیدا بەردی بناغەی خانووی لە گەڕەکی جوولەکان دانـاوە، هەروەها سەرکاری ڕێکخستن و دروستکردنی بازاڕی سلێمانییش بوو. کاتی خۆی مەحموود پاشای بابان بۆ چەند مانگێک کودەتا بەسەر سلێمان پاشای برایدا دەکات و دەسەڵات دەگرێتەوە دەست، بە تۆمەتی ئەوەی باپیرە خواجە خینۆ لە دژی مەحموود پاشا بە پارە پشتگیریی سلێمان پاشای

برای کردبوو، ساڵی ١٨٣٠ چەند پیاوێک دەنێرێت بەدوای باپیرە خواجەدا و هەر ئەو شـەوە لاشەکەیان بەسەربڕاوی لەبەردەم کنێسەتەکەدا فڕێ دابوو.'

چەند هەنگاوێک لە خەڵکەکە دوور کەوتینەوە و مامە سلێمانم بـەردەوام بوو لە قسەکانی و وتـی، گوایا ئەمەی لە هاروونی ئاشەوانی باوکیەوە بیستووە، مامە سلێمانم باسی خواجە خینۆی باپیرە گەورەمانی زۆر بۆ کردم، پاشان هاتە سەر باسی باپیرە باڕئاموون و دیسان گلەییی زۆری لە هاروونی ئاشەوانی باوکی کرد. مامم کاتێک ناوی ئەوانی ئەهێنا، منیش لەگەڵیدا ناوەکانیانم بەدوای ئەودا دەوتـەوە، بە مەبەستی ئەوەی لەو جێگایە هەستی خۆم بە ڕۆحیانەتی مردووەکانمان ڕابگەیەنم، تاوەکو ئەوەیان بۆ دووپات بکەمەوە کە یادی ئەوان·هەردەم لە خەیاڵی ئێمەدا زیندووە. لەدوای ئەو ڕۆژەوە بۆ ماوەی حەفتەیەک شیڤەمان بۆ باوکم گێڕا، منیش لەگەڵ مامە سلێمان و یاقووبی کوڕیدا چەند ڕۆژێـک لە کنێسـەت بووین و پاشان لە ماڵی مامە سلێمانم پێشوازیمان لە میوانان دەکرد.

ڕۆژێک دوای مردنی باوکم، ماڵی پوورە فەریدە و پۆلاکی مێردی و کچەکانی لە قەرەداغەوە هاتبوون، کانیشا کاتێک بۆ مردنی باوکم دڵنەوایی دامەوە، دەستی لە دەستم هەڵپێکا و لەژێر لێوەوە پێی وتم، 'زۆر چاوەڕوانت بووم، ئیتر هەر نەهاتیت؟ بەلام ئێستا بە مردنی باوکت دەتبەخشم.'

لەو کاتەدا تەزوویەکی سارد بە جەستەمدا هات و لە تاواندا دەستێکم بەسەر سنگمەوە گرت، پاشان ئەو پرسیارە لە خەیاڵمدا قوت بوویەوە، 'ئایا خوا منی تەنها لەبەر ئەوە خوڵقاندووە، کە ببم بە حاخام

و پێشڕەوی و ڕابەرایەتیی گەلەکەم بکەم؟ یان... چۆن و ئێستا چی بکەم باشە؟'

لەو کاتەدا کانیشا توند دەستی گوشیم، لە خەیاڵەکەم دایبڕیم و خێرا لەبەرخۆمەوە پێم وت، 'بەنیاز بووم.'

'لەگەڵ دایکم و باوکم باسم کردووە، هەردووکیان بەوە ڕازین.'

'چیت بۆ باس کردوون؟'

لەو کاتەدا مامە سلێمانم دەستی خستە سەر شانم و داوای لێ کردم تاکو ئاشەکە لەگەڵی بچم. کاتێک لە شانی مامەوە دەڕۆیشتم چەند جارێک ئاوڕم لە کانیشا دایەوە، بێدەنگ تەنها لە چاوی یەکتریمان دەڕوانی.

کاتێک گەیشتینە بەردەمی ئاشەکە، مامم پاڵی دا بە دەرگای ئاشەکەوە و لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئیتر کاتی ئەوە هاتووە موشوورێکی خۆت بخۆیت، چونکە من پێم باشە لەو نێزیکانەدا کەتان شوو بە یاقووب بکات و بۆ خۆیان خێزان دروست بکەن، ئیتر پێویست ناکات بۆ بەغداد بگەڕێیتەوە، پێویستە ژنێک بێنیت و بۆ خۆت دانیشیت و خەریکی کار و کاسپی بیت.'

'مامە گیان، ویستم پرسیارت لەو بارەوە لێ بکەم!'

'دەی بزانم، بڵێ.'

'ئەو ئەرکەی لەسەر شانمە، بە پێویستی دەزانم جێبەجێی بکەم!'

'کام ئەرک، نازانم تۆ بەتەمای چیت؟'

'دەمەوێت ببم بە حاخام و خەونەکەی دایکم و باوکم بهێنمە دی.'

'یانی بەنیازیت بۆ بەغداد بگەڕێیتەوە؟'

'بەڵێ.'

'کوڕێ گیان، لەمەولا ئەوەت بۆ ناگونجێت و پێویستیت بە خەرجی دەبێت، ئێستا پێویستە تۆ ئەرکەکانی شەلمۆی باوکت لە

ئەستۆ بگریت، ئەگەر خاتری منت لایە لێرە بمێنەرەوە، ئینجا لە کنێسەتەکەی خۆمان لە بەردەستی حاخامدا دەتوانیت بخوێنیت.'

لەو کاتەدا بێدەنگ بەرامبەری مامم ڕاوەستابووم و لێم دەڕوانی، هەرچەندم دەکرد نەمدەتوانی دانی پێدا بنێم و بە مردنی باوکم ڕازی بم، هەستم دەکرد مردنی ئەو بۆشاییەکی گەورەی لەدوای خۆی بەجێ هێشتبوو، ئەوەی من تاکو ئەو ڕۆژە دەربارەی باوکم بیستبووم و وەکو کوڕی یان کەسێکی نزیکی ناسیبووم، ئەو بازرگانێکی زۆر لێهاتوو بوو، بە هەموو تەمەنی هەوڵی ئەوەی لەگەڵ مندا دەدا، تاکو منیش وەک ئەو بیر بکەمەوە و کەسێکی کاسبکار و باوەڕدارم لێ دەر بچێت، بەوە دڵگران بووم نەمتوانی دڵی ڕازی بکەم و ببمە ئەو کوڕە نموونەییەی ئەو دەیویست.

پاشان دوایین هیوا و خەونی باوکم ئەوە بوو، کە بخوێنم و ببم بە حاخام، ئەوسا خۆیشم تەواو باوەڕم بەوە هەبوو، کە لە چارەمدا نووسراوە و من تەنها بۆ ئەوە لەدایک بووم کە ببم بە حاخام، بەڵام لە بەغداد ڕەحیم و ڕەحمان ڕێڕەوی ئەو خەون و خەیاڵەی منیان گۆڕی، نازانم بۆچی بەردەوام دەمویست بۆ بەغداد بگەڕێمەوە، ئایا بۆ خوێندن بوو یان خوازیاری گوێبیستی نەغمەی مۆسیقا و مەینۆشین بووم، لەو کاتەدا لە خەیاڵی ئەوەدا بووم و ویستم ڕاستگۆیانە ئەو ڕاستییە بە مامە سلێمانم بڵێم، بەڵام کاتێک مامم دەستی خستە سەر شانم و بەهێواشی پێی وتم، 'کوڕێ گیان، ئەگەر من ڕازی نەبم تۆ بۆ بەغداد بگەڕێیتەوە! خۆ دڵنیام تۆ بێگوێیی مامت ناکەیت؟'

کاتێک مامم ئەمەی پێ وتم، تاوێک بێدەنگ لێم ڕوانی و لە دڵی خۆمدا وتم، 'تۆ بڵێی مامە سلێمان توانای ئەوەی هەبێت هەست بە خەیاڵەکانم بکات؟'

مامم بەردەوام بوو، لەبەرخۆیەوە وتی، 'بزانە باوکت چی لە پاش خۆی بۆ بەجێ هێشتوویت؟'

پاشان سەرم داخست و لە خەیاڵمدا بیرم لە باوکم دەکردەوە، لەو کاتەدا بیرم لەوە دەکردەوە، ئاخۆ باوکم بێجگە لە خانوویەک و دوکانەکەی لە قەیسەریی نەقیب، دەبێت چیی تری لە پاش خۆی بۆ بەجێ هێشتبم؟

باوکم بەردەوام لە ژیانیدا تووڕە و بێزار دیار بوو، زوو زوو گلەییی ئەوەی لە بەخت و ژیانی خۆی دەکرد، کە بە درێژایی تەمەنی زیاتر لە نیوەی ڕەنج و ماندووبوونی بۆ... بە دەردی خۆی دەیوت، 'بۆ ئاغاکەم بووە.'

باوکم مەبەستی لە شێخ سەعیدی حەفید بوو، لەبیرم دێت خۆی ئاوای بۆ گێڕامەوە، 'لە ساڵی ۱۸۵۰ بەدواوە، عوسمانییەکان بڕیاری سەندنی جزیەیان لەسەر مەسیحی و جووەکان هەڵگرت، ئیتر جوولەکە و مەسیحییەکان سەرانەیان بە موسوڵمانەکان نەدەدا، هەر لەو ساڵانەدا عوسمانییەکان بڕیاری ئەوەیشیان دەر کرد، کە گەنجە جوولەکەکان ئیتر لەو ساڵە بەدواوە بە سەرباز ناگیرێن، بەڵام دەبێت لەبری ئەوە بەدەل بدەن، زۆربەی شێخ و ئاغاکان گوێیان بەو بڕیارە نەدا و بە جیا سەرانەی خۆیان لە جوولەکەکان وەر دەگرت، هەروەها لە بەرامبەر ئەوەشدا شێخەکان ژیان و ماڵی جوولەکەکانیان دەپاراست.'

هەروەها شێخ سەعید چەند ساڵێک پێش ئەوەی بچێت بۆ موسڵ و لەوێ بکوژرێت، خۆی بە باوکمی وتبوو، 'ئێوە ئەهلی زیمەیەن و جزیەی خۆتان بدەن و ئێمەش چاومان لێتان دەبێت!'

'من ناتوانم لێرە بمێنمەوە و وەکو باوکم ببمە کۆیلەی ماڵی شێخان!' کاتێک ئەمەم بە دەنگی بەرز و بەتووڕەیی بە مامە سلێمانم

وت، پاشان خۆشم هەستم بە تەریقبوونەیەک کرد و لە تاواندا هەموو جەستەم کەوتە سەر ئارەقەیەکی سارد.

مامە سلێمان دەستی خستە سەر شانم و بەبێ ئەوەی لێم بڕوانێت لەبەرخۆیەوە وتی، 'چەند ڕۆژێک پێش مردنی باوکت یەکێک لە پیاوەکانی شێخ قادری حەفید هات بۆ دوکان و پێی وتم، گوایا ئێستا حاجی سەید حەسەن حاکمی شاری سلێمانییە و لەمڕۆ بەدواوە ئێمە زیمەیەی ئەوین.'

'جا ئەوە گوزەرانە ئێمەی جووی تێدا دەژین، بچین بۆ بەغداد باشتر نییە؟'

'نا نا، ئەم شارە زێدی باووباپیرانمانە و ڕۆحیانەتی مردووەکانیشمان لێرەن، ڕۆحی ئەوان پابەندە بەم شوێنەوە و ناتوانن لەگەڵماندا بۆ بەغداد ڕەو بکەن، ئیتر لەوێ کەسمان نییە ئاگای لێمان بێت!'

'لەوەیاندا لەگەڵتام و منیش باوەڕم وایە، بەڵام دەی جەنابی شێخ سەید حەسەن چی لێمان دەوێت؟'

'لەمەودوا دەبێت جزیە بەو بدەین، یانی دابینکردنی شەکر و چای دیوەخانەکەی جەنابی لەسەر شانی ئێمەیە، پاشان پاراستنی سەروماڵی ئێمەیش لە ئەستۆی شێخ حاجی سەید حەسەنە و هەرچی کێشەیەکمان هەبێت بۆ لای جەنابی دەچین.'

'مامە گیان، چەند ڕۆژێک کاتم بدەرێ، با باش بیری لێ بکەمەوە، ئێستا زۆر هەست بە بێزاری دەکەم و بەڕاستی نازانم چیت وەڵام بدەمەوە، بێجگە لەوەی دەزانم پڕم لە تووڕەیی و بێزاری.'

'هیچ پەلەم لێت نییە، ئەگەر بتوانیت ڕاستگۆ بیت لەگەڵ کانیشای کچی فەریدە و دەسیدەسیی پێ نەکەیت!'

مانگێک بەسەر مردنی باوکمدا تێپەڕی، بۆ ئـەوەی مردنی باوکم لەبیری خۆم بەرمەوە، زۆربەی کات بە خەیاڵ لە کووچە و کۆلانەکانی بەغداد بووم، حەفتەیەک پێش ئەو ڕۆژەی مامە سلێمانم زەماوەند بۆ یاقووبی کوڕی و کەتانی خوشکم و من و کانیشا ڕێک بخات، لێی پرسیم، 'ئەریَ کوڕیَ گیان تۆ بەنیازیت کیَ بۆ سەر زەماوەندەکەت بانگ بکەیت؟'

ڕۆژی زەماوەندەکە بەیانیی ڕۆژی پێنجشەممە بوو، حەمەجانی حاجی سەلیم ئـەو ڕۆژە پێش خۆرکەوتن هاتبوو بۆ گەڕەکی جوولەکان، کاتێک لە دەرگای دا، هێشتا تاریک بوو، دەنگیم ناسییەوە و پێش ئەوەی دەرگاکەی لیَ بکەمەوە بۆنی عەترەکەیم کرد، دەرگام لیَ کردەوە و بینیم چۆغەیەکی بۆری بەسەر کراسێکی سپیی بیَ قۆپچەدا لەبەر کردبوو، شەرواڵێکی ڕەش و جووتێک کلاشی سپیی لەپێدا بوو، مشکییەکی بێکلاوی ڕاستوچەپ لە سەریەوە ئالاندبوو، بە بالایدا هەڵم ڕوانی و لێم پرسی، 'ئەریَ جانە گیان ڕەنگی ترت شک نەبرد تا تێکەڵی کەیت؟'

'کوڕە چی بکەم مردووت مرێت، بە خوا مشکی و شەرواڵەکەم بە ئەمانەت وەر گرتووە!'

'ئەو گەڵوگیپاڵە و سەر زەماوەندیان نەوتووە.'

دوای ئـەوەی ئەمەم پیَ وت، پێکەوە چووین بۆ ژوورەکـەی باوکم و دوو بوخچەی پێچراوەی پڕ لە جلوبەرگم خستە بەردەمی حەمەجان و پێم وت، 'ئەوە میراتی باوکمە لەدوای بەجیَ ماوە!'

کاتێک بوخچەکانمان کردەوە، حەمەجان قاتێک ڕانکوچۆغەی باوکمی لەبەر کرد، پشتێنێکی ڕەشی گوڵداری بەسەردا بەست، خەریکی داخستنی قۆپچەی چۆغەکەی بـوو، بەبیَ ئـەوەی لێم بڕوانێت لێی پرسیم، 'لێم دێت؟'

'ئەڵێی...'

'ئەڵێی بە باڵای خۆت براوە!'

لە دەنگی مامە سلێمانم ڕاپەڕیم و خێرا هەڵسامە سەر پێ و ئاوڕم دایەوە، لەناو دەرگای ژوورەکەدا وەستابوو لە حەمەجانی دەڕوانــی، لەگەڵ خۆیدا ژوورەکــەی پڕ کرد لە بۆنی سابوونی سورەیا، زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوەکانی و بەسەرنجەوە بە باڵای حەمەجاندا هەڵی ڕوانی، کاتێک ئاوڕم لە حەمەجان دایەوە، بینیم چۆن بەپەلە خەریکی کردنەوەی قۆپچەی چۆغەکەی بوو.

'ئادەی کوڕگەل دەستوبردی لێ بکەن و ئەوە من لە ئاشەکە ئینتیزارتان ئەکەم.'

دوای ئەوەی مامە سلێمانم ئەمەی وت، ڕووی لێ وەرگێڕاین و لە ژوورەکــە چــووە دەرەوە، حەمەجان چۆغەکەی لە بەری داکەند و خەریکی کردنەوەی بەنەخوێنی شەرواڵەکەی بوو، کاتێک بەنەخوێنەکەی کردەوە و شەرواڵەکەی کەوتە بەر پێی، پاشان کڵاو و مشکییەکەی لە سەری داگرت و فڕێی دایە سەر ئەو بەستە جلەی لەسەر بوخچە کراوەکە دانرابوون، سەری داخست و لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەک ڕووی نەبوونی ڕەش بێت!'

'کوڕە چەڵتەچەڵت، کەی کاتی ئەو بەزم و باڵۆرانەیە، خۆت بگۆڕە و با بڕۆین بۆ ئاشەکە و مامە سلێمانم چاوەڕوانمان دەکات.'

کاتێک لەگەڵ حەمەجان گەیشتینە ئاشەکە، سیمانەی سەعادەت و خامێی موشێی عەتاریش لەوێ بوون، لەبەر ئەوەی ڕۆژێک پێش ئەو ڕۆژە هەمووانم لە هاتنی حەمەجان ئاگادار کردبۆوە، کەسیان بە ئامادەبوونی حەمەجان سەرسام نەبوون، بەڵام حەمەجان بێزاری و دوورەپەرێزیی پێوە دیار بوو، کاتێک مامە سلێمان کاری پێ ڕاسپاردین، هیچی بە حەمەجان نەوت، کاری من و سیمانە ئەوە

بوو بچین لە قەسابخانەکەی خوار گەڕەکی جوولەکان گۆشت بۆ
ماڵی مامە سلێمان بەرین، لەو کاتەدا حەمەجان تاوەکو ناو دەرگای
ئاشەکە دوای ئێمە کەوت، مامە سلێمان بانگی لە حەمەجان کرد،
'حەمەجان ئەمڕۆ تۆ بەردەستیی مامی خۆت دەکەیت، تاوێکی تر
من و تۆ ئەو شەکر و ڕۆنە دەبەین بۆ ماڵی ئێمە.'

کاتێک مامە سلێمان ئەمەی بە حەمەجان وت، دەستی بۆ لای
سێ فەردە و دوو تەنەکە ڕۆن ڕاکێشا، کە لە تەنیشت بەرداشی
ئاشەکەوە دانرابوون.

کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە لەناو حەوشەی کنێسەت
بووین، لەوێ چوار کۆڵەکە چەقێندرابوون و پاشان جاجمێکی
سپییان بەسەردا گرتبوو، لەگەڵ کانیشا و لە تەنیشتی یاقووب و
کەتانی خوشکمەوە بەرامبەر حاخام وەستابووین و ئەو نزای بۆ
دەخوێندین و ئێمەیش لەدوایەوە بەکۆرس دەمانوتەوە.

دوای دوو کاتژمێر، لە کنێسەت هاتینە دەر و بەرەو لای ئاشەکە
کەوتینە ڕێ، حاخام بە تەوراتە لوولکراوەکەی دەستیەوە لە
پێشمانەوە دەڕۆیشت، دوو پیاو بە دەهۆڵ و زوڕناوە لە پشتمانەوە
بوون، دەنگی دەهۆڵ و زوڕناکە و نزاکانی حاخام تێکەڵ بە یەکترین
دەبوون، یاقووب و کەتانی خوشکیشم لە دوای من و کانیشاوە
بوون، لەو کاتەدا کانیشا توند دەستی لە دەستم هەڵپێکابوو، هەستم
پێ کرد چۆن هەموو گیانی دەلەرزی و دەستی ئارەقەیەکی ساردی
کردبوو.

بە درێژیی گۆڕەپانی بەردەمی ئاشەکە سفرە داخرابوون و
هاوڕێ و دۆست و کەسوکارمان پێکەوە نانمان خوارد و پاشان
تاوەکو درەنگانێکی شەو سەمامان کرد و گۆرانیمان وت، کاتێک
ژنان کانیشایان برد بۆ ژوورێکی ماڵی خۆمان، هاوڕێکانم منیان

خستە سەر شانیان و تاوەکو بەردەرگای ژوورەکە بردمیان، وەکو ئەودیو دەرگاکە گۆڕەپانی جەنگ بێت، داوایان لێ کردم ئازا بم و پیاوەتیی خۆم بنوێنم، کاتێک چوومە ژوورەوە، بینیم کانیشا لەسەر دۆشەکە پەڕە گوڵینەکەی دایکم پاڵ کەوتبوو، تەنانەت پێڵاوەکانیشم دانەکەند و بەبێ ئەوەی هیچ بڵێم چووم لە تەنیشتی کانیشاوە ڕاکشام، کاتێک دەستیم گرت هەستم بە ساردوسڕیی جەستەی کرد، دیار بوو ئەویش وەکو من زۆر ماندووی ئەو ڕۆژە بوو، یان کاریگەریی شەرابەکەی مۆردەخای بوو هەردووکمانی لە پەلوپۆ خستبوو.

•

## ١١

مانگی تشرینی ساڵی ١٩١٨ ئینگلیزەکان گەیشتنە شاری سلێمانی، پاش دوو حەفتە و دوای ئەوەی بارودۆخەکە ئارام بوویەوە، نوئێل ناوێک کرا بە ڕاوێژکاری سیاسی و مێجەر دانلیس وەکو ڕاوێژکاری سەربازیی شێخ مەحموود دانرا، چەند ڕۆژێک دوای هاتنیان مامە سلێمان و حاخام لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بۆ ماڵی شێخ مەحموود بانگ کران، مامە سلێمانم پێی وتم، 'خایم تۆ لە ئێمە سەربەدەرتریت، پێم باشە لەگەڵماندا بێیت!'

کاتێک ئێمە گەیشتینە بەر دەرگای ماڵی شێخ، چەکدارێکی زۆر لەوێبوون و لەگەڵ سەربازە ئینگلیزەکاندا تێکەڵ بە یەکترین بووبوون،

سمێڵی شۆڕ و جامانە و مشکییە تێکەڵەکانی تفەنگچییەکانی شێخ مەحموود زۆریان لەگەڵ سەربازە پونجابییەکاندا جیاوازتر نەبوو. ئەوەی لە یەکترین جیای دەکردنەوە شەرواڵ و مرادخانی و خەنجەری بەر ورگیان و ئەو چەندین فیشەکلۆغەی لە کەمەر و شانیانەوە پێچابوویان، کاتێک لە کۆڵان و سەربانەکانم ڕوانی، لەبەرخۆمەوە لە مامە سلێمانم پرسی، 'ئەو هەموو پیاوە سمێڵبابڕە، تفەنگچیی شێخ مەحموودن؟'

مامە سلێمانم لەبەرخۆیەوە و بەهێواشی، 'زۆربەیان کاسەلێسی ماڵی شێخن.'

کاتێک گەیشتینە بەردەرگای ماڵی شێخ، یەکێک لە دەرگاوانەکان

بەتەوسێکەوە لێی پرسین، 'ئێوە جوولەکەن؟'

'بەڵێ، دوێنێ خولق کراین تاکو بۆ ماڵی جەنابی شێخ بێین.'

کاتێک مامە سلێمان ئەمەی وت، یەکێک لە پاسەوانەکان هاتە بەردەممان و یەکێکی تریان خێرا ڕووی لوولەی تفەنگەکەی تێکردین، کابرایەکی سمێڵڕەشی بالآبەرز لە پشتمانەوە پێی وتین، 'بە ئەمری جەنابی شێخ حەسەن، ئێوەی جوو ڕووی ئەم مەجلیسەتان نییە.'

حاخام ڕووی تێکرد و لێی پرسی، 'جەنابی شێخ مەحموود خۆی، یان مەندوبی ئینگلیز ئاگاداری ئەم ڕێگیرییەن؟'

'ئیتر ئەوە ئەمری جەنابی شێخ حەسەنە و فەرموون بڕۆن و ئێوە هیچ کارتان بێرە نییە.'

مامە سلێمان لە کابرا چووە پێشەوە، لەو کاتەدا چەند پیاوێک تفەنگەکانیان لە شانیان داگرت و بێ ئەوەی هیچ بڵێن، هاتن لە نزیکی مامە سلێمانمەوە وەستان و ڕووی لوولەی تفەنگەکانیان تێکرد، مامم پشتی لە من بوو، بینیم چۆن تفەنگچییەکان بەتووڕەییەوە لە ئێمەیان دەڕوانی، حاخام لەبەرخۆیەوە چەند جارێک وتی، 'دەی خوای ئێمە بۆ خۆی پاداشتی ئەم کردەوەیەتان بداتەوە.'

مامە سلێمان بەبێدەنگی سەری داخست و بەناو خەڵکەکەدا ڕۆیشت، من و حاخامیش جێپێکانی ئەومان هەڵگرتەوە و بەرەو گەڕەکی جوولەکان بەڕێ کەوتین، ئیتر بەدرێژایی ئەو ڕێگایە قسەمان لەگەڵ یەکتر نەکرد.

دوو ڕۆژ دوای ئەو ڕۆژە، بە گەڕەکدا جاڕ درا و هەموو خەڵکی گەڕەکی جوولەکانیان لە کنێسەتەکە کۆ کردەوە، کاتێک من گەیشتمە ئەوێ، چەندیین سەرباز بە تفەنگەوە لە پێش کنێسەتەکە وەستابوون، تەنانەت سەربانی کنێسەتەکەش دوو سەربازی هندیی

لێ بوو، لەناو حەوشەکەدا مێجەر نوئێل لەگەڵ موشێی عەتار قسەی دەکرد، کابرایەکی پۆشتەی باڵابەرزی مووزەرد، کاتێک حاخام و مامە سلێمان گەیشتن و پێکەوە بۆ ناو حەوشەی کنێسەتەکە چوون، کوڕێکی گەنج، کە تاکو ئەو کاتە بەردەوام لە شانی نوئێلەوە بوو، خامێی موشێی عەتار لە کاتی چوونەژوورەوەیدا چووە بەردەمی و ڕێگای چوونەژوورەوەی لێ گرت، کوڕەکە بەتووڕەییەوە وتی، 'من موتەرجیمی ڕەسمیم.'

دیار بوو مێجەر نوئێل ئاگاداری ئەوە نەبوو، کە ڕێگەیان لە چاوساخ و موتەرجیمەکەی گرتبوو، خامێ شانی کوڕەکەی گرت و بەتووڕەییەوە پاڵێکی پێوە نا و پێی وت، 'تۆ بۆ جاسووسی هاتویت و ئێمە پێویستمان بە تەرجومەی جەنابت نییە!'

کاتێک خامێ کوڕەکەی بە پاڵ لە کنێسەت کردە دەرەوە، لە بەردەرگا سەربازەکان لە خامێ ڕاست بوونەوە و ڕووی لوولەی تفەنگەکانیان تێکرد، کوڕەکەش کزەڵە و بێدەنگ لە شانی سەربازەکانەوە ڕاوەستا، خامێ گەڕایەوە بۆ لای ئێمە و وتی، 'ئەوە ناوی ڕەفیق حیلمییە و کەرکووکییە و ئێستاش جاسووسی بۆ تورکەکان دەکات.'

کاتێک من چوومە ناو کنێسەتەکە، گوێم لە حاخام بوو وتی، 'داوامان لێتان ئەوەیە، وەکو عوسمانییەکان مامەڵەمان لەگەڵ نەکەن، فەرق و جیاوازی لەنێوان خەڵکی ئەم شارەدا نەکەن!'

عەزیزی حەکیم لە شانی مێجەر نوئێلەوە وەستابوو، ئامادەبووان هەرچییەکیان دەوت، ڕووی دەمی دەکردە کابرای ئینگلیز و بە دەنگی نزم پێی دەوت، لەو کاتەدا نەمدەزانی عەزیزی حەکیم بە چ زمانێک قسەی لەگەڵ مێجەر نوئێلدا دەکرد، پاشان مامە سلێمان ئەوەی بۆ باس کردم، کە عەزیزی حەکیم زیاتر لە دە ساڵ لە

هندستان ژیاوە و لەوێ فێری دەرمانسازی و زمانی ئینگلیزی بووە.

مامە سلێمانم بە دەنگی بەرز وتی، 'ئێمە و خەڵکی هەژاری ئەم شارە ئەوەی ئێستا زۆر بە گرنگی بزانین، وەکو تەنها داوایەک لە فەرمانڕەوای ئینگلیزمان هەبێت، نان و ئاوی خاوێن بۆ ئەو خەڵکە هەژارە دابین بکرێت. ئیتر ئەگەر کوردە موالییەکان داواکاریی یان قسەی تریان کردبێت، ئەوە هیچ پەیوەندیی بە ئێمەی جوولەکەوە نییە.'

ئەو خەڵکەی ئەو ڕۆژە لە کنێسەت ئامادە بوون، دەتوانم بڵێم تەواوی پیاوان و گەنجانی گەڕەکی جوولەکان بوون، لە دوای ئەوەی مامە سلێمانم ئەوەی وت، چەند کەسێک هەڵسانە سەر پێ و گلەیی و گازندەی ئەوەیان کرد، کە ئەوان نایانەوێت لەمەولا سەرانە بە شێخەکان بدەن، لەو کاتەدا لە چەندین لاوە دەست کرا بە پاڕانەوە و بێزاریدەربڕین، بە جۆرێک، کە حاخام ناچار بوو هاواریان لێ بکات و بێدەنگیان بکات، دوای ئەوەی عەزیزی حەکیم تاوێک لەگەڵ مێجەر نوئێڵدا دوا، کاتێک هەموومان لە کنێسەتەکە هاتینە دەرەوە، چەند سەربازێک ڕەشۆی چەند ئەسپێکیان بەدەستەوە بوو بەرەو بەردەرگای کنێسەکە هاتن، دوای ئەوەی مێجەر نوئێڵ و ئەفسەرەکانی هاوەڵی سواری ئەسپەکان بوون، دەیان سەرباز و ئەو کەسانەی لەگەڵیان هاتبوون بە پێ بەدوایاندا بەرەو ناو شار گەڕانەوە.

مامە سلێمانم لە شانی حاخامەوە وەستابوو، لەبەرخۆیەوە وتی، 'داگیرکەر هەر داگیرکەرە و باوەڕ ناکەم ئەمانیش هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ عوسمانییەکاندا هەبێت، ئیتر پێویستە ئێمەش پشت بە خۆمان ببەستین و چاوەڕوان نەبین ئینگلیز خێرمان پێ بکەن.'

## ١٢

چەند مانگێک دوای هاوسەرگیریمان و ئەو ڕۆژەی زەماوەندمان تێدا کرد، کانیشای هاوژینم دەردێکی گرانی گرت و لەناو جێگادا کەوت، ڕۆژی جارێک عەزیزی حەکیم ئەهات و دەوای بە کانیشا دەدا، کەتانی خوشکم بە ڕۆژدا خزمەتی دەکرد و منیش کاروباری دوکانەکەم بەڕێوە دەبرد. ئێوارانیش کاتێک دەگەڕامەوەماڵەوە تاکو درەنگانێک بەدیاریەوە دادەنیشتم.

'کاکە گیان، وا بزانم کانیشا دووگیانە!'

کاتێک کەتانی خوشکم ئەمەی پێ وتم، خۆر ئاوا بووبوو، دیار بوو کەتان لە بەردەرگای ماڵەکەمان چاوەڕوانم بوو تاکو ئەو هەواڵەم پێ بڵێت.

دڵم لەو هەواڵە داخورپا و تەزوویەک بە گیانمدا هات، دەستی کەتانم گرت و پێم وت، 'کەتان گیان وا مەڵێ و دووگیانیی چی، ئەو بەسەزمانە هێزی تێدا نییە و قومێک ئاوی پێ قووت نادرێت!'

'کوڕە، سێ یان چوار مانگە دووگیانە!'

'وا مەڵێ خوشکێ گیان، بەخوا نە خۆی و نە کۆرپەکەی ژیان دەر نابەن.'

'ئیتر ئاوایە کە پێم وتیت، کاکە گیان درۆت لەگەڵ ناکەم!'

ئەو شەوە چووم بۆ لای عەزیزی حەکیم، کاتێک گوزەرانی کانیشام بۆ باس کرد و لەژێر لێوەوە وتم، 'قوربان کانیشا دووگیانە،'

عەزیزی حەکیم لە وەڵامدا پێی وتم، 'کوڕە وا مەڵێ، ئەو توڵفە

بەسەزمانە سیلیەتی و ئەمڕۆ و سبەی چاوەڕوانی مردنە، دەی جەنابت نەدەبوایە ئاگاداری ئەوە بوویتایە، کە ئەو ئافرەتە ناساخە و باشترە جەنابت سواری نەبیت، یان ئیتر تۆ نێرەکەریت و کارت بەسەر ئەوەوە نییە.'

'نا نا قوربان، کانیشا سێ بۆ چوار مانگ دەبێت دووگیانە!'

'دەی ئێستا ئێمە چی بکەین، ئەوە چەند ڕۆژێکە دەوای پێ دەدەم، پێویستی بەوەیە چەند حەفتەیەکی تر ئەو دەوایە بەکار بێنێت، چونکە سییەکانی لەسەر سنگیدا هەڵئاوساون، جا مادام دووگیانە، ئەوا من ئەو ژەهرە بە قوڕگیدا نەکەم باشترە، چونکە لەبری ئەوەی چاکی بکەمەوە، دەترسم بیکوژم!'

'دەی چار چییە و ئێستا چی بکەین؟'

'وەکو پێم وتیت، مادام دووگیانە، ئیتر من هیچم پێ ناکرێت، کەواتە ئەوەی ئەمێنێتەوە ئەوەیە بانگی حاخام بکە تا نزای بۆ بکات.'

'یانی چاوەڕوانی مردنی بکەم؟'

'بۆ هەتیو باوەڕ ناکەیت خوا شفای بۆ بنێرێت؟'

'ئەگەر بینێرێت، ئەوە بۆ بەندەیەکی زەبوونی خۆیەتی و من ناتوانم ڕێگای لێ بگرم!'

'ئاخر تۆ ئاوا بیر دەکەیتەوە بۆیە حاڵی قوونت جوانە!'

'ماڵی تۆم بەقوڕ گرت، من بۆ دەوا هاتووم و تۆ چیم پێ دەدەیت؟'

بەبێ ماڵئاوایی لە ماڵی عەزیزی حەکیم دەر چووم، لە خەیاڵی خۆمدا چەندین جار پرسیاری ئەوەم لە خۆم کرد، 'تۆ بڵێی عەزیز ڕاست بکات و کانیشا بەختی ژیانی نەمابێت؟'

کاتێک گەیشتمە بەردەرگای ماڵەوە، کەتان لەناو دەرگاکەدا چاوەڕوانی دەکردم، لێی ڕوانیم و لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەرێ تۆ لەبیرت چووە، کە من ماڵ و مێردی خۆم هەیە؟'

'دەزانـم، ئەزانم، کەتان گیان، ئێ چی بکەم لای عەزیز بووم، ئەوە نەبێت ئەویش ئەوەندە دەم و دوامانی پاک بێت.'

'ئێستا خەوی لێ کەوت، باشترە، لە ئێوارە گوزەرانی باشترە و چەند کەوچکێک شۆربای خوارد.'

'بەڕاستە کەتان گیان، بەراستی ئەوە خەبەرێکی خۆشە، دەی بڕۆ ئازیزم، بڕۆ با لەوە زیاتر ماتڵ نەبیت، کەوشەکانت لە پێ کە و ئەوە منیش تاکو سەر شیوەکە لەگەڵتا دێم.'

'باش دەبێت، لەو ڕۆژەوەی کانیشا نەخۆشە، هەموو ڕۆژێک دەچم بۆ کنێسەت و نزای بۆ دەکەم.'

'هیوادارم بە نزای تۆ بێت خوشکێ گیان.'

کەتان فتیلەیەکی بەدەستەوە بوو لە پێشمەوە بەرەو دەرگای حەوشەکە دەڕۆیشـت، لەناو دەرگـای حەوشەکەدا ئاوڕێکی لێ دامەوە و پێی وتم، 'توخوا کاکە گیان ئاگات لە کانیشا بێت و خافڵی نەکەیت.'

'بێخەم بە کەتان گیان.'

'چونکە ئەو دوودڵە لەوەی تۆ ئەوت خۆش بوێت!'

'چۆن؟ کانیشا خۆی ئەوەی پێ وتیت؟'

'ئەرێ.'

پاشان لەبەرماڵی خۆمان لەسەر شیوەکە وەستام، تاکو کەتان دەرگـای ماڵی مامە سلێمانمی کـردەوە و چـووە ژوورەوە، بیرم لە قسەکەی کەتان دەکردەوە، ڕوانیم ڕووناکیی مانگ بە بەرزیی بالای کەندەڵانی شیوەکەدا شۆڕ بووبووەوە و تاکو سەر ڕووی ئاوەکە گەیشتبوو، نازانم بڵێم ئاوەکە یان باشترە بڵێم میزاوەکە، شنەبایەک بە پێچاوپێچی شیوەکەدا گیڤەی کرد و لە خوارەوە بۆ

سەر بۆن و بەرامی گووزاوی لەگەڵ خۆی هێنا و پێش ئەوەی بیپرژێنێت بەسەر ماڵەکاندا من یەکەم کەس بووم ئەو شەوە بۆنی پاشەڕۆی خەڵکی شارم کرد، کاتێک پڕ بە سییەکانم بۆنم هەڵمژی، لە خەیاڵی خۆمدا وتم، 'ئێستا دەزانم بۆچی کانیشا سیلیەتی و سییەکانی هەڵئاوساون، کچێک لە قەرەداخ لەناو ئەو سرووشتە پاک و بێگەردەدا گەورە بووبێت و ناچار لەبەر دڵدارەکەی هاتبێتە ئەم گەڕەکە، بێجگە لەوەی کە لە مێردەکەی دوودڵە، ئیتر ئەوە دەردی گران کردووە!'

کاتێک گەڕامەوە، تاوێک بوو لە تەنیشتی جێگاکەی کانیشاوە دانیستبووم، ماڵەکە بێدەنگ بوو، کانیشا لەسەر پشت لێی کەوتبوو، بێئاگا بوو لەوەی من هاتبوومەوە، دەستیم گرت و لەبەرخۆمەوە وتم، 'مردن، مردن، وەکو من لەم تەمەنەمدا لە مانای مردن باش تێگەیشتبم، یان ئەو کولتوور و دیانەتەی لەلایەن کەسوکارمەوە بەمیراتی بۆم بەجێ ماوە، مانای تەواویان بە وشەی مردن بەخشیبێت، تاوەکو من وەکو خۆی قبوڵم بێت و دوودڵ نەبم لێی، کاتی خۆی بە مردنی دایکم باوەڕم وا بوو، خۆی تەمەننای مردنی دەکرد و بەردەوام خەیاڵی لای ئەو ژیانە ئەبەدییە بوو کە لە دوای ئەم ژیانەوە دەست پێ دەکات، پاشان لە ڕۆژی مردنی باوکمدا، ناچار بووم بەوەی پەیڕەوی ئامۆژگارییەکانی خۆی بم، هەروەها مردنم بە مافێکی ڕەوا زانی بۆ کەسێکی گیرۆدەی وەکو ئەو، چونکە پێم وا بوو ئەو جۆرە باوکانە ئەگەر نەمرن، ژیانی نەوەکانی دوای خۆیان دەست پێ ناکات.'

زیاتر لە کاتژمێرێکم تێپەڕاند و هێشتا بێدەنگ بەدیار کانیشاوە دانیشتبووم، چرای ژوورەکە لە بێنەوتیدا کز دەگرا، لە لای کانیشاوە ڕاکشام و سەرم خستە سەر لایەکی سەرینەکەی و دەستیم گرت

و له دڵی خۆمدا وتم، 'ناتوانم بەئاسانی دەستبەرداری تۆ ببم، هەروەها نایشتوانم بەرەوڕوو خۆشەویستیی خۆمت بۆ دەر ببڕم، بەڵام ئەگەر مردن تۆم لێ بسەنێت، ئەوکات ژیان و مردن هیچ جیاوازییەکیان لای من نامێنێت.'

## ١٣

لەگەڵ حەمەجان سەلیم و خامێی موشێی عەتاردا پەنجا هۆقە شەکرمان بەشەریکی کڕیبوو، حەمەجان سەلیم وتی، 'خێروبێری ئەو قەندە بۆ جەمعییە خێرخوازییەکەمان خەرج دەکەین!'

خامێ لە وەڵامدا پێی وت، 'جەمعییەی چی و تەڕەماشی چی، ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت؟ بەخوا برا من بەشی خۆم ناکەم بە خێر!'

حەمەجان سەلیم بەسەرنجەوە لە منی ڕوانی، منیش پێم وت، 'با قازانجەکەی بۆ لێقەوماوان بێت، بەڵام بە هیچ شێوەیەک دەستبەرداری دەستمایەکەم نابم!'

کاتێک ئێمە لەم قسە و باسانەدا بووین، سێ پیاوی چەکدار لەناو دوکانەکەی خۆیدا پەلاماری موشێی عەتاریان دا، هەرسێکمان چووین بەهانایەوە و چووین لەنێوان چەکدارەکان و موشێی عەتاردا ڕاوەستاین، بەڵام تاکو ئێمە گەیشتین لێیان دا و دوکانەکەیان بەسەریەکدا شێواند، دوای ئەوەی ڕووی لوولەی تفەنگەکانیان کردە ئێمە و هەڕەشەی کوشتنیان لێ کردین، ناچار بووین و ڕێگامان پێ دان و چووینە کەنارەوە، یەکێک لە چەکدارەکان مشکییەکەی خستە ملی و بەدوای خۆیدا بۆ بەر دوکانەکەی ڕایکێشا، لەو کاتەدا من و حەمەجان سەلیم بە هەردووکمان خامێی کوڕی موشێی عەتارمان گرتبوو، خامێ ئەوەندە تووڕە بوو، لەبەرخۆیەوە جنێوی بە پیاوە تفەنگچییەکان دەدا، ناچار بووم توند دەمی خامێ بگرم بۆ ئەوەی

پیاوەکان گوێیان لە دەنگی نەبێت، بەڵام خامێ ئەوەندە بەهێز بوو خۆی لە دەستی ئێمە دەر هێنا و پەلاماری یەکێک لە تفەنگچییەکانی دا، دوای ئەوەی چەند کۆڵەمستێکی تێسرەواند، کابرا کەوتە سەر ئەرزەکە و خامێ تفەنگی کابرای بەدەستەوە گرت و ڕووی لوولەکەی کردە دوو کابرا تفەنگچییەکە، لەو کاتەدا لەناو قەیسەریی نەقیبدا بوو بە هاوار هاوار و ڕاکردن، لەناکاو داودی چایچی بازی دایە نێوانیان و خۆی خستە بەر لوولەی تفەنگەکان، کاتێک ئێمە ئەو کردەوەیەی داودمان بینی، لەگەڵ حەمەجاندا چووین و لە شانی داودی چایچییەوە و بەرەو ڕووی دوو پیاوە تفەنگچییەکە ڕاوەستاین، یەکێکیان بەتووڕەیییەوە هاواری لێ کردین و وتی، 'وەلا کەون، سەگبابینە وەلا کەون.'

پاشان لە بەینی من و حەمەجانەوە پەلاماری خامێی دا و دەستی لە یەخەی گیر کرد، ئەوی تریان لوولەی تفەنگەکەی کردە حەوا و فیشەکێکی تەقاند، لە ڕاست و چەپمانەوە چەند دوکاندارێک دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی کەرەستەی دوکانەکانیان، تەپوتۆز لە بنمیچی قەیسەرییەکەوە بەسەرماندا هاتە خوار، چەند دوکاندارێک دەرگای دوکانەکانیان داخست و بەڕاکردن بە لاماندا تێپەڕین، یەکێک لە تفەنگچییەکان لەگەڵ خامێی موشێی عەتاردا دەستیان دابووە یەخەی یەکتری و زوو زوو جنێویان دەدا و هەڕەشەی کوشتنیان لە یەکترین دەکرد، من لەو کاتەدا بەترسەوە لە خامێ و پیاوە چەکدارەکەم دەڕوانی، لەناکاو چوار پیاوی تفەنگبەدەست پەیدا بوون، خێرا ڕایان کرد و بە هەموویانەوە پەلاماری خامێی موشێی عەتاریان دا، بە قۆناغی تفەنگەکانیان ئەوەندەیان بە جەستەی خامێدا کێشا، بێهۆش کەوتە بەر پێیان و خوێن لە دەم و لووت و گوێکانیەوە دەڕۆیشت، موشێی عەتار یەک یەک بەسەریاندا

دەگەڕا و لێیان دەپاڕایەوە، من و حەمەجان سەلیمیش هەوڵمان دەدا دەستی تفەنگچییەکان بگرین و نەهێڵین خامێی هاوڕێمان بکوژن، پیاوە تفەنگچییەکان لەبەرخۆیانەوە زوو زوو هاواریان دەکرد، 'بیکوژن، وەک سەگ بیتۆپێنن.'

لە کاتی ئەو ڕووداوەدا، هیچکام لەو پیاوە تفەنگچییانە قسەیەکی ئەوەندە گونجاو یان باشیان لەدەم نەهاتە دەر تاکو لێرەدا شایەنی تۆمارکردن بێت، تەنها ئەوەندە نەبێت، کاتێک یەکێک لە پیاوەکان لە حەمەجان سەلیم هاتە پێشەوە و هەڕەشەی لێ کرد و پێی وت، 'ئەرێ خوێڕی، تۆ کارت چییە بەسەر ئەم جوولەکانەوە؟'

لەو کاتەدا، حەمەجان سەلیم دەستەسڕێکی لە گیرفانی ڕانکوچۆغەکەی دەر هێنا و ئارەقەی نێوچەوانی پێ سڕی و بەبێزارییەکەوە لەبەرخۆیەوە وتی، 'خوا زوڵم لە کەس قبووڵ ناکات!'

یەکێکی تریان بە حەمەجانی وت، 'کوڕە باوەحیز جاوەجاو.'

ئەو کابرا تفەنگچییەی لە سەرەتاوە خامێ پەلاماری دا و تفەنگەکەی لێ سەندبوو، تاوەکو ئەو ساتەیش بێهۆش لەبەر پێماندا کەوتبوو، لەناکاو هەستایە سەر پێ و دوای ئەوەی تاوێک بەدەوری خۆیدا خولایەوە، پاشان کەوتە شەقتێهەڵدانی خامێ، ناچار بووم باوەشم کرد بە کابرای تووڕەدا و لە خامێی موشێی عەتارم دوور خستەوە، دووان لە پیاوەکان چوونە بنباڵی خامێ و هەڵیان ساندە سەر پێی خۆی و لەگەڵ خۆیاندا بردیان، موشێی عەتار چاوی پڕ بوون لە فرمێسک و بەردەوام لەبەرخۆیەوە نزای دەکرد، دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن، من و حەمەجان سەلیم شتومەکی دوکانەکەی موشێی عەتارمان کۆ کردەوە و پێکەوە چووین بۆ گەڕەکی گاوران، لە بەردەمی کەنیسەی مریەمدا ڕێکەوتی عەبدولکەریم ئەلیاسمان

کرد، کاتێک ئەو هەواڵەمان بۆ عەبدولکەریم ئەلیاس گێڕایەوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بێدەنگ هەردوو دەستی لە پشتی هەڵپێکان و بە کۆڵانەکەدا دەستی کرد بە گەڕان، من و حەمەجان سەلیمیش لە دوورەوە سەرسام لێمان دەڕوانی، پاش تاوێک، بەبێ ئەوەی هیچمان پێ بڵێت، پێشمان کەوت و بەرەو سەرا کەوتینە ڕێ، عەبدولکەریم ئەلیاس لە ڕێگا هیچی نەوت، من لەبەرخۆمەوە پێم وت، 'زۆریان لە خامێی کوڕی موشێی عەتار داوە!'

بەبێ ئەوەی لێم بڕوانێت، سەرێکی بۆ لەقاندم و هەنگاوەکانی زیاتر خێرا کردن و بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، دەنگی خشەی نووکی کەوشەکانی دەهات، کاتێک بەر لکی کەوا شۆڕەکەی دەکەوت، زوو زوو لە ڕێگا هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا و پاشان فەقیانە سپییەکانی یەک یەک دەکردنەوە و دیسان لە بازویدا توند گرێی دەدانەوە، کاتێک گەیشتینە ناو حەوشەی سەرا، عەبدولکەریم ئەلیاس بەتەنیا چووە ژوورەوە، من و حەمەجان لەناو حەوشەی سەرادا زیاتر لە دوو کاتژمێر دەبوو پیاسەمان دەکرد و چاوەڕوان بووین، کاتێک عەبدولکەریم ئەلیاس هاتە دەرەوە خەریک بوو خۆر ئاوا دەبوو، وەکو منداڵێک دەستی موشێی عەتاری گرتبوو، لەگەڵ خۆیدا هێنای بۆ لای ئێمە و عەبدولکەریم ئەلیاس وتی، 'بە ئەمری سەید عومەری موتەسەڕیف گیراوە، چونکە موشێ کەمتەرخەم بووە لە بەرانبەر حەق و حیسابی و دابینکرنی خەرجیی دیوەخانەکەی جەنابی موتەسەڕیفدا، دەبێت هەر ئێستا و پێش خۆرئاوابوون مشوری مانگێک کەرەستەی بۆ بخۆین. ئیتر بەو مەرجە مەرەخەسیان کردووە!'

لە عەبدولکەریم ئەلیاسم پرسی، 'دەی خامێی کوڕی؟'

بەبێزارییەوە لێی ڕوانیم و پێی وتم، 'سبەینێ!'

موشێ، ئەو پیاوە پیرە زەردەڵە بێهێزە، بێدەنگ لێی دەڕوانین و لە نێوانماندا وەستابوو، وەکو ئەوەی ئاگای لە قسەکانی عەبدولکەریم ئەلیاس نەبووبێت، چەند جارێک لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەرێ، کڵاو و مشکییەکەیان لێ ساندووم!'

## ١٤

لەدوای ڕۆژی زەماوەندەکەمانەوە کانیشا نەخۆش کەوتبوو، لەگەڵ کەتانی خوشکمدا شەوانە بەدیاریەوە بووین، چونکە بەردەوام دەڕشایەوە و لەتاو ئازاری سکی دەنگی گریانی دەگەشتە کۆلان، هەموو ڕۆژێک عەزیزی حەکیم سەردانی دەکرد و دەوای دەرخوارد دەدا، ئەو ڕۆژانە تەنها ئەوەم لە عەزیزی حەکیم ئەبیست، کە دەوایەکی چارەسەرکەری بۆ کانیشا نییە و دەردەکەی زۆر گرانە، کانیشا تەنها لە بنمیچی ژوورەکەی دەڕوانی و زوو زوو لەبەرخۆیەوە دەیوت، 'مردنم زۆر لە ژیان پێ باشترە.'

حەفتەیەک دوای ڕۆژی زەماوەند، حەمەجان هات بۆ ماڵمان و پێی وتم، 'کارێکی زۆر گرنگ و چارەنووسسازم پێتە!'

پێشتر حەمەجانم بەو شپرزەییەوە نەبینیبوو، ڕەنگی زەرد و زوو زوو قسەکانی دەبڕی و هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا، بەتەنیا بردمیە ژوورێک و دەستی گرتم و پێی وتم، 'دەبێت پێش هەموو شتێک گفتی ئەوەم پێ بدەیت، کە تاوەکو دواهەناسەت دیفاع لە مەسیری ئێمە دەکەیت.'

بەردەوام دەستی دەگوشیم و لێی دەڕوانیم، منیش لە ناچاریدا سەرم بۆ ڕاوەشاند و پێم وت، 'برا گفت بێت! بەڵام جانە گیان، دیفاع لە کێ بکەم و ئێوە کێن؟'

'من و ساشا.'

'چۆن؟ تۆ و کام ساشا؟'

'کوڕە خۆتم لێ گێل مەکە، ساشای خوشکی کانیشای ژنت!'

'ئەرێ حەمەجان بۆ خاتری حەزرەتی دواد شتی ئاوا نەڵێیت!'

'بۆ برا بەخوا لەبەر خاتری داود بێت یان محەمەد، ئیتر ئێمە دڵمان چۆتە سەر یەک و گفتمان بە یەکترین داوە بۆ یەک بین.'

'دەی ناموبارەک، ئەمە لە کەیەوە؟'

'لە ڕۆژی زەماوەندەکەی تۆ و کانیشاوە.'

'کوڕە جانە گیان بۆ خۆتِ هەڵدەخەڵەتێنیت، ساشا جوولەکە و تۆ مسوڵمان، بەخوا گیانیشت دەر چێت پوورم و پۆلاکی باوکی ئەو کچەت نایەنێ، ئینجا جانە تۆ دەبوایە ئەوەت لە پێشچاو بگرتایە.'

'ئیتر ماڵی عەشقم وێران کرد، خایم کار لـەوەدا نەماوە لێی پەشیمان ببمەوە، تۆ تەنها کەسی دەزانیت، هەر خۆت سەبەب بوویت و دەبێت خۆیشت حەلێکمان بۆ وەدۆزیت.'

'ئەرێ هەی نارەسەن، من بۆ سەبەب بووم؟'

'ئەگەر تۆ نەبوویتایە منێکی مسوڵمان لە گەڕەکی جوولەکان ڕێگام نەدەکەوتە سەر زەماوەند.'

'تۆ ڕاست دەکەیت، جانە گیان مەسیری ساشای پوورزام بەدەست من بووایە ئەوا کەسم لە تۆ پێ باشتر نەبوو، بەڵام ئەگەر دەتانەوێت بۆ یەک بن، ئەوا حەلی ئێوە تەنها ئەوەیە ساشا ببێت بە مسوڵمان، یان تۆی کوڕە حاجی دەبێت بۆ کچە جوولەکەیەک لە دینی ئیسلام وەر گەڕێیت.'

'عەشق بەلایە خایم گیان، ئیتر تۆ چیت پێ باشە من ڕەتی ناکەمەوە.'

'من ئێستا ماڵم وێران بووە و ئەوەندە نابێت باوکم مردووە، ئەوەتا لە شەوی بووک و زاوایەتیمانەوە کانیشای ژنم زەلیلە و لەناو جێگادا کەوتووە، ئیتر جانە گیان دەبێت تۆیش تۆزێک لە حاڵ

و گوزەرانی من بڕوانیت، نازانم بڵێم چی! ئەگەر لە ئێستادا جەنابت تەنها خەیاڵت لای گەڵوگونی خۆت بێت، ئەوا تۆ بۆ من ڕەفیقێکی سپڵە و بێکەڵکیت.'

دوای ئەوەی بێدەنگ لێی ڕوانیم، سەری ڕاوەشاند و پاشان توند باوەشی پێدا کردم.

حەمەجان لەو ڕۆژانـەدا بەتەنیا لەگەڵ دایکیدا ژوورێکیان لە گەڕەکی مەڵکەندی لە ماڵی شێخ خالید بەرزنجی بەکرێ گرتبوو، یان باشترە بڵێم بەبێ کرێ لەو ژوورەدا بوون، ئەویش بە هۆی ئەوەی خوشکەکەی حەمەجان سەربەهەوێ شووی بە شێخ خالیدی خاوەن ماڵ کردبوو، بە بیرم دێت حەمەجان پێی وتم، 'ڕابەی خوشکم شووی کردووە بە پیاوێک پەنجا ساڵ لە خۆی گەورەترە، بە ڕەچەڵەک لە شێخەکانی بەرزنجەیە و سـەروەتـدارە و زۆر پیاوی چاکە.'

نزیکەی شەش مانگ کانیشا زەلیل لەناو جێگادا کەوتبوو، عەزیزی حەکیم پێی وتم، 'ژنەکەت ئەمرێت یان ئەبێت چاوەڕوانی بەهار بکەین، تاوەکو لە گژوگیای ئەو هەردە دەوای بۆ دروست بکەم.'

لە ڕۆژانی سەرەتای مانگی دووەمی بەهاردا بووین، کاتێک لەگەڵ مامە سلێمان خوازبێنیی ساشامان بۆ حەمەجان کرد، پۆلاکی خەزوورم پێی وتین، 'ئەگەر ببێت بە جوولەکە ئەوا کچەکەمی پیرۆز بێت.'

کاتێک لە چایخانەکەی داود ئەو هەواڵەم بە حەمەجان ڕاگەیاند، دەستی توند گوشیم و بە دەنگێکی گریاناوییەوە لەژێر لێوەوە وتی، 'زۆر خەممە خوا لە خۆم بڕەنجێنم!'

'کوڕە جانە گیان، ئەگەر تەنها مەبەستت لە خواپەرستی بێت، ئەوا تۆ بێ داود و محەمەدیش دەتوانیت پەیوەندییت لەگەڵ خوای خۆتدا هەبێت، چونکە جوو بیت یان موسوڵمان خوا هەر خوایە،

خۆت غەشیم مەکە و بە عەقڵی ئەو عەرەبە چەکلانە بیر مەکەرەوە!'
'دەترسم ئەودونیام لەکیس بچێت!'
کاتێک حەمەجان ئەمەی وت، توند دەستیم گرت و بۆ لای خۆمم ڕاکێشا و پێم وت، 'کوڕە ناپیاو، دەی جەنابت باسی عەشقی چیم بۆ دەکەیت، ئەگەر تۆ کێرت بە دەستەوە بێت و وەکو شێخ و مەلاکان تەنها خەیاڵت لای حۆرییەکانی ئەودونیات بێت، کەواتە بۆ درۆ لەگەڵ خۆت و ئەو کچە قوڕبەسەرە دەکەیت، من وام زانی عاقڵیت و لەگەڵ ساشادا لەم دونیات بە عەشق بەهەشتێک بۆ خۆت و دڵخوازەکەت دەخوڵقێنیت.'
حەمەجان سەری خستبووە سەر تەپڵەکەکەی نێوانمان و بەکوڵ دەگریا، داودی چاییچی لەولامانەوە و لەبەردەم مێز و مەقەڵییەکەیدا بێدەنگ وەستابوو گوێی لێ گرتبووین، پاشان دوو پیاڵە چای بۆ هێناین و پیاڵەکانی لەسەر تەپڵەکەکە دانا و لە حەمەجانی ڕوانی و لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەوە چییە؟ ئەو پیاوە بۆ خوا دەگری یان بۆ خورما؟'

حەفتەیەک بەسەر خوازبێنیکردنی ساشا بۆ حەمەجاندا تێپەڕیبوو، دیار بوو گژوگیای قەدپاڵی شاخی گوێژە دەوا بوون، کانیشا دەیتوانی هەڵسێتە سەر پێ و شەوانە بەئارامی دەخەوت، دوانیوەڕۆی ڕۆژی پێنجشەممە بوو، چوومە بنباڵی کانیشا و لەگەڵ مامە سلێمان و خەڵکی گەڕەکدا چووین بۆ کنێسەت، پوورە فەریدە و پۆلاکی خەزورم لە قەرەداغەوە هاتبوون، دوای ئەوەی حاخام نزای بۆ ساشا و حەمەجان کرد و هاوسەرگیریی پێ ڕەوا کردن، پاشان بەبێ زەماوەندگێڕان ساشا و حەمەجان لە کنێسەتەوە لەگەڵ خەسوو و خەزوریدا بەرەو شارۆچکەی قەرەداغ ڕۆیشتن.

مەبەست لە ڕۆیشتنی حەمەجان شوێنونیی ژنهێنانەکەی بوو، ویستی کەسوکاری و خەڵکی شار نەزانن و پاشان دوای شەش مانگ یان ساڵێک لەگەڵ ساشا بۆ سلێمانی بگەڕێنەوە. بە دایکی وتبوو، چەند مانگێک دەچێت لە بەغداد کرێکاری دەکات! ئەو ڕۆژە لە کنێسەت دوو لیرەی ڕەشادییم کردە ناو چنگی حەمەجان و پێم وت، 'ئەوە پشتگیریی منە و ئەگەر دەستگیرۆیی بکەیت، دوو ساڵ بێنانوئاو نابیت.'

## ١٥

له سالانی حوکمڕانیی شێخ مەحموودا، لەگەڵ کانیشا له بەغداد بووم، له گەڕەکی تەورات و له تەنیشت ماڵی مامه ئیسماعیلەوه خانوویەکم بەکری گرتبوو، ڕۆژانـه له بـازاڕی مسوال خەریکی گۆڕینەوه و فرۆشتنی زێڕ و زیو بووم و بێئاگا بووم لەوەی له سلێمانی چی دەگوزەرێت.

ئەو ڕۆژەی هەواڵی بۆردومانکردنی شـاری سلێمانیمان پێ گەیشت، له بازاڕی مسوالەوه بەڕاکردن بۆ شەقامی شۆڕیجه چووم، لەوێ سەدان کورد کۆ بووبوونەوه و پۆل پۆل پێکەوه وەستابوون و قسەیان دەکرد، له ڕێگاوه کابرایەکی ڕەقەڵەی بالابەرز وتی، 'دەڵێن ئەو شاری سلێمانییه خاپوور بووه!'

کەسێکی تر لەناو خەڵکەکەوه به دەنگی بەرز وتی، 'دەڵێن شار بۆته وێرانه.'

مەلایەکی گەنج هەردوو دەستی بەرز کردنەوه و هاواری کرد و وتی، 'ئینگلیز خوانەناس و بێویژدانن، ئیتر سەد خۆزگەم به حوکمی جاران.'

'دەیان فڕۆکه سلێمانییان بۆردومان کردووه، شار وێران بووه و ڕۆحلەبەری بەزیندووی لێ دەر نەچووه!'

کاتێک ئەمەم له کابرا ڕەقەڵه بالابەرزەکه بیست، ویستم پرسیاری ئەوەی لێ بکەم ئایا گەڕەکی جوولەکان بۆردومان کراوه؟ بەلام لەبەر زۆریی خەڵکەکه ڕێگام نەبوو له کابرای هەواڵبەر نێزیک

ببمەوە، چۆن چووبووم بۆ شەقامی شۆڕیجە، ئاوایش بەڕاکردن بۆ بـازاڕی مسوال گـەڕامـەوە، ئەو ئێوارەیە لە بێزاری و خەمی کەسوکارمدا لەگەڵ ڕەحیم و ڕەحماندا لەسەر کەناری ڕووباری دیجلە بۆ یانەی شەوانەی مەیحان چووین، یانەی مەیحان تەنها شاگردێک و ئێمەی لێ بووین، بەدەم عارەقخواردنەوەوە تەنها باسی بۆردومانەکەی شاری سلێمانیمان دەکرد، لە درەنگانی شەودا چوار سەربازی ئینگلیز هاتن و لەسەر مێزێک لە تەنیشت ئێمەوە دانیشتن، دوو جار لەسەریەک دوو پێکی خەستم بەبێ ئاو لە عارەقەکە تێکرد و خێرا خواردمەوە، نەمدەتوانی چاو لەسەر سەربازە ئینگلیزەکان لا بەرم، ئارەقەیەکی سارد تەواوی جەستەمی تەڕ کردبوو، ڕەحیم و ڕەحمان پێیان وتـم، 'ئـەوە چییە ماڵت بە قوڕ گیرێت خۆ ئەو سەربازانە سلێمانییان بۆردومان نەکردووە!'

خێرا هەستامە سەر پێ و بەلای مێزی سەربازەکاندا چووم بۆ باخی پشتەوەی یانەکە، دوای ئەوەی چەند جارێک لە ڕاستەوە بۆ چەپ بە باخەکەدا گەڕام، تاوێک بەسەر دیواری باخەکەدا لە ڕووباری دیجلەم ڕوانی، کاتێک گەڕامەوە ڕەحمان لێی ڕوانیم و دەستی خستە سەر دەستم و پێی وتم، 'ئیتر تاوەکو کورد خەریکی غەزا و حەلیفی تورکان بێت، ئەوە مەسیری دەبێت!'

بەتووڕەییەوە دەستم لەژێر دەستی ڕەحماندا دەر هێنا و لە سەربازەکانم ڕوانی و وتم، 'ئیتر من ئەوانە نازانم و ئەمشەو تۆڵەی ئەو قەتڵوعامەی سلێمانی لەم ئینگلیزە خوێڕیانە دەکەمەوە!'

ڕەحیم و ڕەحمان ناڕەزاییی خۆیان دەر بڕی و ئامادە نەبوون هاوکاریم بکەن، پاشان شۆمای شاگردم بردە باخی پشتەوەی یانەکە و بۆردومانەکەی شاری سلێمانیم بۆ باس کرد، شۆما پێی وتم، کە باوکی بە گوللەی ئینگلیز بریندار کراوە و ئەوە بۆ ساڵێک

دەچێت زەلیلە و لەناو جێگادا کەوتووە.

بەو جۆرە ئەو شەوە لەگەڵ شۆمای شاگردی یانەی مەیحاندا ڕێک کەوتم، کە پێکەوە هەردوو دەرگای یانەکە بگرین و ئاگری تێ بەر بدەین، پاشان من پارەی گەڕانەوەی بۆ زاخۆ پێ بدەم، کاتێک ئێمە دەستمان کرد بە نەوتڕشتن، ڕەحیم و ڕەحمان بەجێیان هێشتم، ئەوەندەمان نەوت ڕشتبوو تاوەکو بەر پێ و ژێر مێزی سەربازەکان چووبوو، بەڵام دیار بوو ئەوان مەست بوون و ئاگایان لە چواردەوریان نەمابوو، کاتێک شۆمای شاگرد ئاگری لە یانەکە بەر دا من بە بەلەمێک پەڕیبوومەوە و لەوبەری ڕووباری دیجلەوە لە گڕی ئاگرەکەم دەڕوانی، دڵم پڕ بووبوو لە گریان و بەردەوام خەیاڵم لای کەسوکارم بوو.

دوو ڕۆژ دوای ئەو شەوە، موشێی عەتارم لە بازاڕی مسوال بینی و هەواڵی ئەوەی پێ ڕاگەیاندم، کە کەسوکارم لە کاتی بۆردومانەکەدا بێوەی بوون، موشێی عەتار پێی وتم، 'ئەوەی من بیناسم و بەتایبەتی دانیشتووی گەڕەکی جوولەکان بێت، کەس خوێن لە پەنجەی نەهاتووە.'

ڕۆژی دووی مانگی چواری ساڵی ١٩٢٦، لە بەغداد، حەکیمی کوڕم لەدایک بوو، دوای لەدایکبوونی حەکیم، باری دەروونیی کانیشای خێزانم تێک چوو، بە جۆرێک کە نەیدەتوانی خزمەتی خۆی و کۆرپەکەی بکات، مەجبوور بووم ئەو ساڵانە کارەکەر بگرم، تاوەکو بتوانم بۆ کار و کاسپی بڕۆم و ئەو لە ماڵەوە خزمەتی کانیشا و حەکیمم بۆ بکات. خەلوەی کارەکەرمان کچێکی عەرەبی شیعە مەزهەب بوو، ساڵانی گرانی و جەنگ لە شاری نەجەفەوە لەگەڵ دایکیدا بۆ بەغداد هەڵهاتبوون و لە گەڕەکی تەورات دەژیان.

ڕۆژی چواری مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٩، کانیشا لەناو جێگادا

گیانی دەر چوو، کاتێک ئەو بەیانییە بەخەبەر هاتم، وام زانی هێشتا ئەو خەوتووە، پاشان چووم خەلوەم لە ژوورەکەی خۆی بانگ کرد، بەبێ ئەوەی لە کانیشا بڕوانێت پێی وتم، 'گیانی دەر چووە!'

پاشان خەلوە پێی وتم، کە کانیشا خۆی دەرمانخوارد کردووە! لە سەرەتاوە لە مەبەستی خەلوە تێنەگەیشتم، پاشان پێی وتم، کە کانیشا دوو ڕۆژ پێش ئەو بەیانییە خەلوەی ڕاسپاردبوو تاوەکو زەهری بۆ پەیدا بکات، بەدەم گریانەوە پێی وتم، 'وام زانی دادە کانیشا ئەو زەهرەی بۆ کوشتنی جرجەکان دەوێت!'

نەمتوانی بۆ کانیشا بگریم، بەڵام لەبەرخۆمەوە خەم و تووڕەیی خۆمم بەسەر لاشەی بێگیانیدا دەر بڕی، بەبیرم دێت، پێم وت، 'تۆ ڕۆژێک وەکو هاوسەری ژیانم ڕوویەکی خۆشت نەبوو، بەردەوام خەمبار و گۆشەگیر بوویت، لەوەتەی پێکەوەین مردنت لە ژیان پێ باشتر بووە، قەرزارم بیت، چونکە ئامادە نەبوویت پێکەوە لەزەت لە ژیان ببینین!'

ئەو ڕۆژە لەگەڵ ڕەحیم و ڕەحماندا تەرمەکەیمان برد بۆ کنێسەت و دوای ئەوەی حاخام نزای بۆ کرد لە گۆڕستانی گەڕەکی تەوارت بە خاکمان سپارد، مامە ئیسماعیل ئامادەی پرسە و ناشتنی کانیشای هاوسەرم نەبوو، چونکە بە نەخۆشییەکی کوتوپڕ لە جێگادا کەوتبوو، منیش لەو ڕۆژانەدا لەنێوان شاری بەسرە و بەغدادا بازرگانیم دەکرد، وشک هەڵگەڕابووم و گەرمای ڕێگا بە جۆرێک کاری تێ کردبووم، هاوڕێ و دۆستەکانم نەیاندەناسیمەوە، تینوێتیم بە هیچ جۆرێک نەدەشکا، بەردەوام سەرم دەئێشا و پێستم وشک هەڵهاتبوو، دوای ناشتنی کانیشا، پوورە فەریدە و پۆلاکی خەزوورم ئاگادار کردەوە، بە نیازی دڵی خۆم کانیشام بەکاتی ناشتبوو، بەو مەبەستەی لە داهاتوویەکی نێزیکدا تەرمەکەی بۆ سلێمانی بەرمەوە.

دوای حەفتەیەک، حەمەجان و پۆلاکی خەزوورم گەیشتنە بەغداد، لەسەر گۆڕەکەی کانیشا پۆلاک پێی وتم، 'ئەریێ تۆ سووریت لەسەر ئەوەی تەرمی کانیشا بۆ سلێمانی بەریتەوە؟'

مانگێک بەسەر مردنی کانیشادا تێپەڕیبوو، حەمەجان پێی وتم، 'تاوەکو درەنگ بخایەنێت و جەستەی کانیشا لەژێر خاکدا بێت بۆ بردنەوەی باشترە.'

لە ماڵی خۆمان چاوەڕوانی ڕەحیم و ڕەحمانمان دەکرد، ئەو ڕۆژە لەگەڵ حەمەجان و پۆلاکی خەزوورمدا بەنیاز بووین ئێسکوپرووسکی کانیشا لە گۆڕ دەر بێنین، بە بیرم دێت ڕەحیم و ڕەحمان درەنگ هاتن و بە چاوی پڕ لە فرمێسک و بەدەم گریانەوە وتیان، 'باوکمان مرد.'

لەگەڵ حەمەجان و پۆلاکی خەزوورمدا لە سەفەر و بڕیارەکەی خۆمان پەشیمان بووینەوە، پێکەوە چووین و تەرمەکەی مامە ئیسماعیلمان بۆ کنێسەت برد، شەوێک لە کنێسەت بەدیار تەرمەکەیەوە بووین، ئەو ڕۆژەی لە نزیک قەبرەکەی کانیشاوە بە خاکمان سپارد، پۆلاکی خەزوورم لە بردنەوەی تەرمەکەی کانیشا بۆ سلێمانی پەشیمانی کردمەوە، بێجگە لە حەمەجان، لای کەسی تر باسی ئەوەم نەکرد، کە کانیشا شەوی پێش مردنەکەی ژەهری خواردبوو، حەمەجان لە وەڵامدا پێی وتم، 'ئەریێ خۆ تۆ لەگەڵیدا خراپ نەبوویت؟ بۆچی ئەو ناحەقییەی دەرحەق کردیت؟ لەوانەیە سەبەب ئەو دڵپیسییەی بووبێت!'

لەو کاتەدا هیچ وەڵامێکی حەمەجانم نەدایەوە.

حەفتەیەک بوو مامە ئیسماعیل مردبوو، حەمەجان و پۆلاک

بەجێیان هێشتم و بۆ کوردستان گەڕانەوە، ڕیفکای ژنی مامە ئیسماعیل ڕەدووی کابرایەکی بازرگانی جووی خەڵکی بەسرە کەوتبوو، کاتێک ڕەحیم و ڕەحمان ئەو هەواڵەیان پێ وتم، دڵشکاوی و بێزاری بە ڕوویانەوە دیار بوو، ڕەحیم باسی ئەوەی بۆ کردم، کە دەچێت بۆ بەسرە و ڕیفکا بەزۆر لەو پیاوە دەسێنێتەوە، پاشان ڕەحمان بە دەنگێکی گڕ و گریاناوییەوە لەبەرخۆیەوە وتی، 'باشترە، بەیەکجاری بۆ سلێمانی بگەڕێنەوە.'

لەدوای ئەو ڕۆژەوە، وەکو جاران شەوانی ڕۆژی هەینی پێکەوە دەچووین بۆ یانەی خەموود و بە درێژاییی ئەو شەوە ئەوان خەریکی ژەنینی عوود و تەپڵ بوون، منیش لە کەنارەوە دانیشتبووم و عارەقم دەخواردەوە، کاتژمێر دوانزەی شەو، دوای ئەوەی یانەکە بەتەواوی چۆڵ دەبوو، پێکەوە لەگەڵ تیپی مۆسیقاکەیاندا دەچوینە باخی پشتی یانەکە و لەوێ تاکو دەمەو بەیانی ئاهەنگمان دەگێڕا، باخی یانە و ئوتێلی خەموود دەکەوتە سەر ڕووباری دیجلە، پاشان بە درێژاییی ڕۆژی شەممە لە ئوتێلی خەموود لێی دەخەوتین، ئاهەنگگێڕان و مەشرووبخواردنەوە کارێکی کرد ڕەحیم و ڕەحمان لە بیریان چوویەوە بەنیازی چی بوون و منیش دوای مردنی کانیشا وازم لە بازرگانی هێنابوو.

خەلوەی کارەکەرم پەروەردەکردنی حەکیمی گرتبووە ئەستۆی خۆی، حەلیمەی دایکی هێنابووە لای خۆی و لە ماڵەکەی مندا پێکەوە دەژیان، وەکو خەونێک ئەو شەوانەم دێتەوە یاد، چونکە بەردەوام مەست بووم و ئاگام لە خۆم نەبوو، چەند جارێک لە گەڕانەوەمدا بۆ ماڵەوە دوای ئەوەی بەمەستی دەچوومە ناو جێگاوە، خەلوە دەهات و بە درێژاییی شەو خۆی لە باوەشم توند دەکرد و لەسەر باڵم دەخەوت، نەمتوانی لەزەت لە جەستەی ببینم و باوەڕ بەو

پەیوەندییەمان بێنم، چونکە بەردەوام بۆنی کانیشای لێ دەهات و کاتێک لێم دەڕوانی زوو زوو ڕوخساری کانیشا دەهاتە پێش چاوم.

ڕەحیم و ڕەحمان دەیانویست دوکانەکەیان بە جوویەک بفرۆشن، ئەویش ئەو گرێبەستە سەرزارەکییە بوو باوکیان لەگەڵ دراوسێ دوکانەکانیان کردبووی، ئەوەندەی من لەبیرم بێت چەند جارێک کڕیاری عەرەب هاتن و زیاتر لەو پارەیان پێ دان کە داوایان دەکرد، لە دواییدا بە هەرزان بە جوویەکی خەڵکی زاخۆیان فرۆشت، ئەو ئێوارەیەی دوکانەکەیان فرۆشتبوو، لەسەر مێزی خواردنەوە بوو بە شەڕیان و لە فرۆشتنی دوکانەکەیان پەشیمان بوونەوە، بە بیرم دێت پێم وتن، 'ئەو پارەیەی وەرتان گرتووە دەتوانن لە سلێمانی ڕیزێک دوکانی پێ بکڕن!'

کاتێک من ئەوەم پێ وتن، بێدەنگ بوون و ڕەحمان لێی ڕوانیم و لەژێر لێوەوە وتی، 'بێجگە لە پارەی دوکان و خانووەکە، باوکم حەفتا لیرەی زێڕی ڕەشادیی لەدوای خۆی بۆ بەجێ هێشتوون.'

هەرسێکمان بێدەنگ بووبووین و من لەو کاتەدا خەریکی تێکردنی پێکێک عارەق بووم، ڕەحیم لەناکاو دەنگی هەڵبڕی و بەتووڕەییەوە وتی، 'نازانین ڕیفکا کاتێک هەڵگیراوە بێجگە لە ئاڵتوون چەندی پارە لەگەڵ خۆیدا بردووە!'

دوای ئەوەی ڕەحیم ئەمەی وت، هەرسێکمان بێدەنگ بووین، دیار بوو لە خەیاڵی خۆماندا بیرمان لە ڕیفکا دەکردەوە.

ساڵێک بەسەر مردنی کانیشادا تێپەڕیبوو، لەگەڵ ڕەحیم و ڕەحماندا خۆمان بۆ گەڕانەوە ئامادە کرد، حەکیمی کوڕم لە چارەکەیەکدا پێچایەوە و ڕەحیم ڕاست و چەپ لە کۆڵی خۆی بەست، خانووەکەم بۆ خەلوە و دایکی بەجێ هێشت و پێشەکی کرێی ساڵێکم دا بە خاوەنماڵەکە، ئەو بەیانییەی لە ماڵ دەر چووم خەلوە

دەستی گرتم و پێی وتم، 'هیوات لەسەر هەڵچنم؟ ئایا دەگەڕێیتەوە؟'
بەبێ ئەوەی لێی بڕوانم لەبەرخۆمەوە پێم وت، 'بەنیازم، بەڵی بەنیازم!'

گەیشتینەوە شاری سلێمانی، لە ماڵی خۆمان ژوورێکم بۆ ڕەحیم و ڕەحمان ئامادە کرد، حەکیمی کوڕم بردە لای کەتانی خوشکم، ڕۆژانە لەگەڵ ڕەحیم و ڕەحماندا بۆ قەیسەریی نەقیب دەچووین، هەردووکیان لە کاری کڕین و فرۆشتندا لەگەڵ من و حەمەجان و خامێی موشێی عەتاردا بوون بە شەریک، ئەو ڕۆژانە سەرەتای مانگی ئەیلوول بوو، لە بەغداد حکومەت پێک هێنرا و چەند کوردێک لە مەجلیسی نەوابدا بووبوونە مەندووبی کورد، هەواڵەکانم لە حەمەجان سەلیم و خامێی موشێوە پێ دەگەیشت، لەو ڕۆژانەدا ئەوان بەردەوام بەسەر خەڵکیدا دەگەڕان و قسەیان بۆ دەکردن، وەکو خۆیان دەیانوت، 'ئێمە بە ناماقوڵیی ئەو بەناو وەفدە ڕازی نین، کە بە ناوی کوردەوە لە بەغدادن و خەریکن مامەڵە بە مافی میللەت و نیشتمانی ئێمەوە دەکەن.'

ئێوارەی ڕۆژی هەینی بوو، لەبەر کوڕوکاڵ ڕێگام نەبوو بچمە ناو دوکانەکەی خۆم، دوای ئەوەی داوام لێ کردن و لە دوکانەکەم کردمنە دەرەوە و دەرگای دوکانەکەم گرت، پاشان حەمەجان و خامێی موشێ پێشڕەوییان کردن و پێکەوە چوون بۆ بەردەم چایخانەکەی داود، لەوێ حەمەجان هەڵی کوتابووە سەر تەپلەکێک و قسەی بۆ ئەو خەڵکە دەکرد، ئەوەندە خەڵکی لە چواردەوری خۆی کۆ کردبووەوە، ڕێگام نەبوو لێی نزیک ببمەوە و لە دوورەوە وەستابووم و لێم دەڕوانی، بە جۆرێک ڕێگای دەرگای خوارەوەی قەیسەریی نەقیبیان گرتبوو، ناچار بووم لەگەڵ ڕەحیم و ڕەحماندا لە دەرگای سەرەوەی قەیسەریی نەقیبەوە دەر چووین، ئەو ئێوارەیە

لە تـەواوی کۆڵان و شەقامەکانی شـاردا و لە هەر جێگایەکەوە دەڕۆیشتیت، خەڵکی شار دەستە دەستە کۆ بووبوونەوە و پێکەوە قسەیان دەکرد.

کاتێک گەیشتینە بەردەمی مزگەوتی خانەقا، بینیم مەلایەک چووبووە سەر بەرزییەک و قسەی بۆ خەڵکەکە دەکرد، مەلاکە کڵاو و مێزەرەکەی لەسەری داگرتبوو، خستبوویە بنباڵی و لە کاتی قسەکردندا دەستی لە هەوادا با دەدا، ڕیزی یەکەم ئەوانەی چواردەوریان لە مەلاکە دابوو، هەموو جلی خاکییان لەبەردا بوو، تاکو دواقۆپچەی چۆغەکانیان لە بەرملیاندا داخستبوو، فەقیانەکانیان توند لەسەر بـازوویـان شەتەک دابـوو، پشتێنێکی باریکیان لە کەمەریانەوە ئاڵاندبوو، کڵاوێکی ڕەنگ سووری قوتەڵەیان لەسەیان نابوو، ئەژنۆیان دادابـووە سەر شۆستەی بەردەمی مزگەوتەکە و بێدەنگ گوێیان لە مەلاکە گرتبوو، مەلاکە دوای ئـەوەی چەند شیعرێکی بە زمانی عەرەبی خوێندەوە، دەستی کرد بە نزاخوێندن و زوو زوو خەڵکەکە لەدوایەوە دەیانوت، 'ئامین.'

مەلاکە تاوێک بوو بێدەنگ گوێی لە هاوار و بانگی گوێگرانی گرتبوو، دوای ئـەوەی خۆی ڕاسـت کـردەوە و بەسەرنجەوە لە هەمووانی ڕوانی، دەنگی هەڵبڕی و پڕ بە قورگی نەڕاندی، 'مەحوی ئاوای وت، خەڵکینە گوێ ڕادێرن، مەحوی دەفەرموێت:

بەجێ نایێ، دەبێ ڕوو کەینە سارا،
حەقی ئادابی مەجنوونی لە شارا
کە چەرخ ئەسکەندەری دی دەردەدارە
وتی: ئەم هەم بووە هەم دەردی دارا
هەتا حەق ناسیرە، هەر حەقمە مەنزوور
وەکوو مەنسوور ئەگەر بمکەن بە دارا'

کاتێک لەگەڵ ڕەحیم و ڕەحمان بۆ گەڕەکی جوولەکان بەڕێوە بووین، دیمەنی ئەو خەڵکەی لە دەسەڵات و حکومەتی بەغداد ناڕازی و توورە بوون لە پێش چاومدا لا نەدەچوو، بە جۆرێک لە کاتی ڕۆیشتندا بەئەستەم بەرپێی خۆم دەبینی، دوو دێڕی یەکەمی ئەو شیعرەی مەلاکەی مزگەوتی خانەقا خوێندییەوە بەردەوام لەبەرخۆمەوە دەموتەوە:

'بەجێ نایێ، دەبێ ڕوو کەینە سارا،
حەقی ئادابی مەجنوونی لە شارا'

گەیشتینەوە ناو گەڕەکی جوولەکان و لە بەردەمی ماڵی خۆمان، بینیم حەمەجان و خامێ لەگەڵ دوو کوڕی گەنجی تردا لەوێ وەستابوون و قسەیان دەکرد، منیش کاتێک لێیان نزیک بوومەوە، بانگم لێ کردن، 'ئەرێ ئەم چەلەحانێیە نەبڕایەوە ماڵتان بە قوڕ گیرێت؟'

'خۆ جەنابت خۆتمان لێ جیا ناکەیتەوە، ئیتر سبەینێ دەبێت لەپێش ئێمەوە لە بەردەرکی سەرا بیت!'

'کوڕە ناماقووڵیت کرد، سبەی ڕۆژی شەممەیە و من لە ماڵەوەم و ئیسراحەتم.'

'سبەی ئەوی لەو تەزاهوراتە بەشدار نەبێت، ئەوی پشتگیریی لە ویستنی حەقمان نەکات، ئەو کەسە دەبێت شەرم لە خۆی بکات!'

'ئێ باشە حەمەجان گیان، تەزاهورات و سەندنی حەقی میللەت، خۆ ئەوە سبەینێیە، دەی ئێستا بۆچی بەردەرگاتان لێ گرتووم؟'

'ئەم دوو پیاوە لە کەرکووکەوە هاتوون و میوانی ئێمەن، ئەمشەو لە قەلاکەی جەنابت دەخەون و سبەینێ لە تەزاهوراتەکەدا بەشداری دەکەن.'

شەمسەدین عیزەت و خالید نەجمەدین، دوو کوڕی بالابەرزی

باریکەلەی ڕەشتاڵە بوون، تەوقەم لەگەڵدا کردن و دوای ئەوەی بەخێرهاتنم کردن، پێم وتن، 'من خاوەنماڵ نیم و ئیتر میوانێک لە کەرکووک و شارەکەی ماتانی پەیکەرتاشەوە هاتبێت، دەرگای ماڵەکەم بە ڕوویدا کراوەیە و لە خزمەتیدام.'

خالید نەجمەدین زۆر کەمدوو بوو، بەڵام شەمسەدین عیزەت لەبەرخۆیەوە لە وەڵامدا پێی وتم، 'مەقسەدت ماتانە شێتی دارتاش نەبێت؟'

'بەڵێ بەڵێ، خۆیەتی، وەکو جەنابت فەرمووت، ماتانە شێتی دارتاش!'

پاشان دەرگای حەوشەکەم کردەوە و پێکەوە چووینە ژوورەوە، کاتێک لە ژووری دانیشتنەکە بووین، ڕووم کردە حەمەجان و پێم وت، 'ئیتر میوانێک ناوەخت هاتبێت و ڕووی لە ماڵی بێکەیبانوو کردبێت، ئەوە لە نانی تیری و کەرە زیاتر دەبێت چاوەڕوانی هیچ نەکات.'

'کوڕە ئێمە لە نانی تیری و کەرە زیاتر هیچمان ناوێت، مەگەر ئێرە ماڵی جوولەکە نەبێت!'

کاتێک شەمسەدین عیزەت ئەمەی وت، هەردووکیان لە حەمەجانیان ڕوانی و پێکەنین، بەبێزارییەکەوە لە حەمەجان سەلیمم ڕوانی و ئەویش بەدەم پێکەنینەوە ڕووی کردە میوانەکانی و لەژێر لێوەوە پێی وتن، 'پێویستی بەو ناماقووڵییە نەدەکرد!'

خامێی موشێی عەتار لەو کاتەدا بە زمانی ئارامی لەگەڵ ڕەحیم و ڕەحماندا قسەی دەکرد، پاشان لەبەرخۆمەوە پێم وتن، 'وا بزانم ئێوە دوای کڵاوی بابردوو کەوتوون، چونکە ئەو چەند پیاوە بەناو ماقووڵانەی لە بەغدادن، لەبری هەموومان بڕیاریان داوە مەسیری ئێمە چۆن دەبێت.'

'قابیله ئێمه له مافی ڕەوای خۆمان بێدەنگ بین، هەتاکو ئەوان تەسپیتی حەقی میلەت جێبەجێ نەکەن، ئێمه به ئینتیخابات ڕازی نابین.'

'جا ئەگەر ئەوان مەسڵەحەتچی و وەتەنفرۆشیان ناو بێت، دەی ئێمه دەبێت له مێژوودا چ ناو و ناتۆرەیەکمان پێ ببڕێت؟'

خامێی موشێی عەتار کاتێک ئەمەی وت، چوو بۆ ژووری پشت دالانەکە، هەموومان لەو کاتەدا بێدەنگ بووین، وەکو ئەوەی ئەو لێدوانەی خامێی موشێی عەتار کاریگەریی لەسەر ڕۆحی هەموومان بەجێ هێشتبێت، یان خەیاڵی هەمووانی بزواندبێت.

کاتێک خامێی موشێی عەتار گەڕایەوە، نانەشانەیەک نانی تیریی لەسەرهەڵچنراوی بەدەستەوە بوو، شەمسەدین عیزەت وەکو چاوەڕوانی خامێی موشێی عەتاری کردبێت، لەوی ڕوانی و پاشان چاوی پێدا گێڕاین و پێی وتین، 'زۆر هەڵە هەیە له مێژوودا ڕاست ناکرێتەوە، ئیتر جیل دوای جیل دەبێت کەرانەی ئەو هەڵەیە بدەن!'

'ئەڵێم حەمەجان لەگەڵ خامێ خزمەتی ئەو پیاوانە بکەن، من دەبێت لەگەڵ ڕەحیم و ڕەحمان بۆ گەڕەکی سەرشەقام بچم، چونکە ئەو کوڕانە بەنیازن لەگەڵ نەجاتی عەبە سیس و ئەواندا پێکەوە تیپێکی مۆسیقا دروست بکەن.'

'ئەرێ وتم ئاخۆ دەبێت ئەم دووانە چ پیاوماقووڵێک بن، نەمزانی، که جەنابیان لۆتین! توخوا ئەمڕۆ ڕۆژی ئەوەیە، ئێمه بەتەمای چین و تۆیش به چییەوە سەرقاڵیت!'

کاتێک حەمەجان سەلیم ئەمەی وت، لەگەڵ خامێی موشێی عەتاردا خەریکی تەڕکردنی نانە تیرییەکە بوون، منیش لێی چوومە پێشەوە و دەستم خستە سەر شانی و پێم وت، 'کوڕە هەی بێفەڕ، نەفام، ئەگەر بتزانیایە ئەو دوو کوڕە چیان له بارەدایە ناماقووڵیی

ئاوات نەدەکرد! ئەوە ئێمە دەڕۆین و تاوێکمان پێ دەچێت، ئیتر ناپیاو ئاگات لەو ماڵ و میوانانە بێت.'

گەیشتینە ماڵی نەجاتی عەبە سیس، زیاتر لە دە پیاوی جافی خزمی نەجات میوان بوون، دوای ئەوەی ڕەحیم و ڕەحمانم بە نەجات ناساند، پاشان میوانەکانی نەجات زیاتر لە کاتژمێرێک لەدەوری ڕەحیم کۆ بوونەوە و یەک یەک عوودەکەیان دەگرت بە دەستیانەوە و هەوڵی ژەنینیان دەدا، پاشان یەکێک لە میوانەکان دەستی کرد بە هۆرەی جافی و داوای لە ڕەحیم کرد عوودی بۆ بژەنێت، ڕەحمانیش لە شانی لای ڕاستی منەوە دانیشتبوو، زوو زوو دەستێکی دەکێشا بە ڕووی چەرمی تەپڵەکەیدا و زرمەی لێ هەڵدەستاند، وەکو ئەوەی بیەوێت پێیان بڵێت ئەری خەڵکینە منیش لێرەم و توانای تەپڵێدانی باشم هەیە، دوای ئەوەی هەموو بەسەرنجەوە لێیان دەڕوانی، سەری بە سەر کۆشیدا شۆڕ دەکردەوە و هەردوو دەستی بەملاولای چەرمی تەپڵەکەیدا دەگرت، لەو کاتەدا نەجات دەستی کرد بە گۆرانیوتن و ڕەحیم و ڕەحمانیش لەگەڵ ڕیتمی دەنگی ئەودا مۆسیقایان بۆ ژەند، نەجات دەنگی هەڵبڕی،

'سبەینێ کە ڕۆژ هەڵهات
کوڕان لەگەڵ گزنگی خۆر
ئەڕژێنە ناو شەقامی شار
سروودی بانگی ئازادی...'

یەکێک لە میوانە جافەکانی نەجات گۆرانییەکەی بە نەجات بڕی و دەستی کرد بە هۆرەکردن، دیار بوو میوانەکانی کەیفیان بە گۆرانییەکانی نەجات نەدەهات، منیش لەو کاتەدا خۆم خستە سەر چۆک و لە نەجات نزیک بوومەوە و پێم وت، 'ئێمە دەڕۆین و جارێکی تر میواندارییت دەکەینەوە.'

'کوڕە ئەم دووانە بەرەکتن و خوا بەتایبەتی بۆ منی ناردوون!'

کاتێک نەجات ویستی لە قسەکانی بەردەوام بێت، یەکێک لە میوانەکان دەستی کردەوە بە هۆرەکردن. پاشان میوانەکان زیاتر بواریان بە ئێمە نەدا و لە ماڵی نەجات هاتبووینە دەرەوە، نەجات داوای لە ڕەحیم و ڕەحمان کرد، تاوەکو پێکەوە ڕاهێنان لەسەر چەند گۆرانییەک بکەن و پاشان تۆماریان بکەن. لەو کاتەدا هەردووکیان لە منیان دەڕوانی، منیش دەستم خستە سەر دەستی نەجات و پێم وت، 'ئیتر ئەم دوو پیاوە لێرەن و ئەگەر ژیان باقی بێت ئەوا ئێوە پێکەوە ئاهەنگ ساز بکەن.'

ڕۆژی دوای ئەو شەوە و بەیانیی زوو پێش خۆرکەوتن، کاتێک من لە خەون هەڵسام میوانەکانم ڕۆیشتبوون، تەنانەت ڕەحیم و ڕەحمانیشیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ بەردەرکی سەرا بردبوو، بەبێ ئەوەی خۆم بگۆڕم بە شەرواڵ و کراسێکەوە و بە سەری ڕووتی چووم بۆ ماڵی کەتانی خوشکم، یاقووب ئەو ڕۆژە بڕیاری دابوو نەچێت بۆ بازاڕ و دوکانەکەی نەکاتەوە، لە کاتێکدا هەرسێکمان لەسەر سفرەی نانخوادنەکە کۆ بووبووینەوە و نانوماستمان دەخوارد، لەناو شارەوە دەست کرا بە تەقەکردن، لە سەرەتاوە دەنگی تەقەی تفەنگەکان ناوازە بوون، پاشان دوای نانخواردن لەگەڵ یاقووبی ئامۆزامدا چووبووینە بەر هەیوانی ماڵەکە و لە دوورەوە لە ناو شارمان دەڕوانی، بێجگە لە دووکەڵی ئاگرێک، کە لە ئێمەوە دیار بوو، بەردەوام دەنگی تەقەی شەستتیر و مەتەرلیۆز دەهات.

کەتانی خوشکم هاتبوو لە شانمەوە وەستابوو، لەو کاتەدا حەکیمی کوڕمی بە باوەشەوە بوو، لە کەتانم ڕوانی و پێم وت، 'خوشکێ گیان ئیتر ناچارم، ئەرکی بەخێوکردنی حەکیمم خستۆتە سەر شانی تۆ!'

کەتان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و لەبەرخۆیەوە وتی، 'نا، نا، کاکە گیان ئەرکی سەر شانمە، خۆ ئیتر ئێمە منداڵمان نابێت و لەوە دەچێت وەجاخمان کوێر بێت.'

لە کاتێکدا ویستم وەڵامی کەتان بدەمەوە، بینیم حەمەجان بەڕاکردن بەوبەری شیوەکەدا دادەگەڕا، کاتێک من و یاقووب بانگمان کرد، لە پردی بەردەمی ماڵی ئێمەوە پەڕییەوە و بەرەو لای ئێمە هات، کاتێک گەیشتە ناو حەوشەکە، بینیم حەمەجان دەستەکانی سوور بوون و بێ پشتێن و بە سەری ڕووتی لەناو حەوشەکەدا ڕاوەستا، حەمەجان دەیویست پێمان بڵێت چی ڕووی داوە، بەردەوام هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا و بەکوڵ دەگریا، کاتێک من و یاقووب چووینە خوارەوە، حەمەجان چۆکی دادابووە سەر کاشییەکان، شەرواڵ و کراسە سپییەکەی پەڵەی خوێنیان پێوە دیار بوو، بەدەم گریانەوە بەردەوام دەیوت، 'ئەو زاڵمانە قەتڵوعامیان کردین!'

کاتێک لەگەڵ یاقووب دەستمان خستە بنباڵی حەمەجان و هەڵمان ساندە سەر پێ، ئاسەواری هەردوو دەستی خوێناویی حەمەجان لەسەر کاشییەکان بەجێ مان، دیسان بەدەم گریانەوە لێی ڕوانیم، 'بەخوا خایم گیان نەمتوانی ڕزگاریان بکەم، خۆ ئەوان لە پێشمانەوە نەبوون، کەچی لە پێش هەموومانەوە ئەوان پێکران و بە گوللەکانەوە بوون!'

'کێ پێکرا؟'

'دەی ماڵوێران خۆم، کوڕە ڕەحیم و ڕەحمان، خایم باوەڕم پێ بکە، ویستم ڕزگاریان بکەم، بەخوا لەو بەردەرکی سەرایە ڕۆژی حەشر هەڵسابوو!'

زۆری پێ چوو تاوەکو لە مەبەستی حەمەجان تێگەیشتم، یان

نەمدەویست باوەڕ بەو قسانەی حەمەجان بێنم، تاوەکو چوومە سەر جەستەی بێگیانی هەردووکیان.

کوژرانی ڕەحیم و ڕەحمان ئاسەواری برینێکیان لەسەر سنگمدا بەجێ هێشت، کە بە درێژاییی تەمەنم لە یادی ئەواندا بەردەوام برینەکە تازە دەبوویەوە و ئازاری دەهات، ئەو ڕۆژەی حەمەجان ئەو هەواڵەی بۆ هێنام نەمتوانی لێی تووڕە ببم و پێی بڵێم تۆ بۆچی ئەو دوو کوڕەت لەگەڵ خۆت برد و بەکوشتت دان، بەردەوام دەمویست ئەو گلەییە لە حەمەجان بکەم، بەڵام کوژراو و بریندارەکانی ڕۆژی شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ ئەوەندە زۆر بوون، تاوەکو حەفتەیەک ئاوی شیوەکەی گەڕەکی جوولەکان لە خوێنی کوژراوەکاندا سوور بوو.

کاتێک تەرمەکەیانمان وەر گرتەوە، حاخام پێی وتم، کە هەردووکیان لە دواوە پێکراون، لە قەبرستانی جوولەکان هەردووکیانمان ناشت، لەسەر کێلی گۆڕەکەیان بە عیبری نووسیم، 'ئێوەیش لێرە بوون!'

## ١٦

بێجگە لە ڕووداوەکانی ڕۆژی شەشی ئەیلوول، لە هەمان ساڵدا سیمانە سەعادەت ئەم بەسەرهاتەی خۆی ئاوا بۆ گێڕامەوە، ئیتر لە زمانی ئەوەوە وەکو خۆی،

"٢٣ی مانگی ئابی ساڵی ١٩٣٠ بوو، دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، دوای ئەوەی لە کنێسەت تەوراتمان خوێند و نزامان کرد، لەگەڵ خامێ و عەزیز و چەند هاوڕێیەکی ترماندا، خواردن و مەزە و عارەقمان برد و وەکو پیشەی دایمیمان ڕۆژی شەممان پێکەوە گەنجان کۆ ئەبووینەوە و دەچووین بۆ دەشت، لەودیو گردی مام هەباس و لە نەدیویدا بووین، سفرەمان لێ داخست و دەستمان کرد بە گۆرانیوتن و عارەقخواردنەوە، هێشتا تامی عارەقی ناو پەرداخەکانمان نەکردبوو، خامێ خەریکی زەلاتە دروستکردن بوو، لەناکاو دەیان کەس لەملاولامانەوە پەیدا بوون، هەموویان سەروگوێلاکیان بە جامانە هەڵبەستبوو، لە سەرەتاوە ئێمە خۆمان تێک نەدا و بێخەبەر لە دوورەوە لێمان دەڕوانین، لەناکاو هاواریان لێ کردین و بەکۆمەڵ بەرەو ڕوومان بەڕاکردن هاتن، کاتێک بینیم هەموو دار و خاکەنازیان بەدەستەوە و بەدەم ڕاکردنەوە هاواریان لێ دەکردین، 'بیان کوژن، لێیان دەن، جوولەکەی پیس، مەلعوونەکان.'

لەو کاتەدا من لە هاوڕێکانم بێئاگا مام و لە ترسان هەڵسام و بەڕاکردن بەرەو ماڵ ڕام کرد، کاتێک بەدەم ڕاکردنەوە چەند

جارێک ئاورم دایەوە، بینیم خامێ و عەزیز و هاوڕێکانم لەگەڵ هێرشبەراندا دەستیان دابووە یەخەی یەکری و لە یەکتریان دەدا، یەکێک لە هێرشبەرەکان تاکو نزیکی گەڕەکی جوولەکان دوام کەوت و تەنها جارێک توانی لێم نزیک بێتەوە و بە دارەکەی دەستی لە دواوە جارێک لە ناوشانی دام، لە تاو ئازار و لە ترساندا، ئەوەندی تر خێرا ڕام دەکرد، کاتێک نزیکی گەڕەک بوومەوە کابرا کۆڵی لێ دام و بە ڕێگای خۆیدا گەڕایەوە، بە هەناسەبڕکێ گەیشتمە بەردەمی کنێسەتەکە و بینیم، مامە بارئاموون لەگەڵ چەند پیاوێکی تردا وەستابوون، ویستم بەڕاکردن بەلایاندا تێپەڕم و هیچیان پێ نەڵێم، تاوەکو زوو خۆم بگەیەنمەماڵەوە و تفەنگەکەی باوکم بە فیشەکدانەکەیەوە بەرم و بە فریای هاوڕێکانم بکەوم، مامە بارئاموون بانگی لێ کردم، "وەرە، وەرە، ئەوە بۆ وا باڵت لێ پەیدا بووە، چی ڕووی داوە؟'

لە خەیاڵمدا ئەوەم ئامادە کردبوو، کە بڵێم هیچ نییە و لە دەشتێن و چەخماخمان لەبیر چووە، بەڵام ئەوەندە پەشۆکابووم، لە پڕێکدا بەدەم هەناسەبڕکێوە وتم، 'قەتڵوعامیان کردین، جەردە، کوتەک، بێڵ و تەنانەت خەنجەریشیان پێیە!'

ئەوەندەم وت و بەرەو ماڵەوە ڕام کرد، کاتێک گەیشتمە ماڵەوە، دایکم و پوورە فەرداو لە بەردەرگای حەوشە وەکو پیشەی هەموو عەسرانێکیان پێکەوە دانیشتبوون، لە گەرمەی قەسەوباسدا بوون، ئەوەندە خێرا بەلایاندا تێپەڕیم، لەبیرم دێت، کە ئەوان بە جووت لەناو دەرگاکەدا دانیشتبوون، خێرا بەسەر شانی هەردووکیاندا بازم دا و چوومە ژوورەوە، چووم بۆ ژووری دیوەخانەکەمان و لەژێر فەرشەکانەوە سەرقاپی ژێرزەمینەکەم هەڵدایەوە و بێ ئەوەی پەتی پەیژەکەی ڕاکێشم و پێیدا هەڵی سەپێرم، خۆم بە لێوارەکەیدا شۆڕ

کردەوە و بازم دایە خوارەوە، ژێرزەمینەکە بەئەستەم ڕووناکیی تێ دەکەوت، چونکە هیچ پەنجەرە یان ڕاڕەوی تری لەسەر نەبوو، ئەو ڕووناکییەی تێی دەکەوت لەو دەلاقە بچووکەوە بوو، کە ئەکەوتە سەر ژووری دیوەخانەکەمان، من دەمێک بوو بە دزیی باوکمەوە تەواوی ئەو ژێرزەمینە گەڕابووم و ئەمزانی چیی تێدایە، بێجگە لەوەی پێشتر چەندین جار تفەنگە ماوزەڕەکەی باوکمم کردبووە شانم و بەو ژێرزەمینە تاریکەدا پێوەی گەڕابووم، دەستم دایە فیشەکدانەکە و ڕاست و چەپ لە خۆم بەست و تفەنگەکەم گرت بە دەستمەوە، کاتێک پەیژەکەم نا بە لێواری دەلاقەکەوە، ویستم بەخێرایی پێیدا سەر کەوم، لووتم بوو بە لووتی دایکمەوە، پوورە فەرداو و دایکم پێشیان لێ گرتم و دەستیان کرد بە پرسیارکردن، دایکم پرسیی، 'ئەوە چییە، ئەو تفەنگەی باوکت بۆ کوێ دەبەیت، لەو دەر و دەشتە ڕەوەبەرازتان تووش بووە؟'

کاتێک لە نێوانیاندا وەستابووم و ویستم تفەنگەکە بکەمە شانم و بەرەو دەرەوە بڕۆم، تفەنگەکە ئەوەندە درێژ بوو، نیو مەترێکی لەسەر سەرمەوە ڕەت بووبوو، لە ئاوڕدانەوەمدا لوولەکەی بەر لاچاوی پوورە فەرداو کەوت و هاواری لێ بەرز بوویەوە، ئاوڕم نەدایەوە و بەرەو دەرگای دەرەوە لە دەستیان هەڵهاتم، دایکم لە دواوە بانگی لێ کردم، 'نەڕۆی، نەڕۆی، جا کێ دەڵێت باوکت بەوە ڕازییە.'

کاتێک لە ماڵ دەر چووم، لە خەیاڵی ئەوەدا بووم، کە ئاخۆ دوایی لەگەڵ باوکمدا تووشی چ دەردیسەرییەک دەبم، بەڵام ئەوەی هێزی دەدایە بەر ئەژنۆکانم و بەرەو دەرەوەی گەڕەکی جوولەکان و گردی مام هەباس پێکانیان دەجووڵاندم، تەنها فریاکەوتنی هاوڕێکانم بوو، لە ڕێگا، بە لاچاو چەند کەسێکم بینی لێیان دەڕوانیم

و بانگیان لی دەکردم، بەڵام من وەکو سەربازێک کە فەرمانێکی گرنگی پێ سپێردرابێت و بەرەو شوێنی ڕووداوەکە بەڕاکردن بەڕێوە بووم، کاتێک گەیشتمە سەر گردەکەی مام هەباس، ڕوانیم لە دوورەوە هێرشبەرەکان و خامێ و عەزیز و ئەوان بەرانبەری یەکتری وەستابوون و خڕەبەردی ئەو شیوەیان دەگرتە یەکتری، لە دوورەوە بینیم کەسێک لەو جێگایەدا و لەدەوری سفرە ڕەنگ شینەکەی ئێمە کەوتبوو، ئەژنۆیەکم دادایە سەر زەوی و تفەنگەکەم لە شانم داگرت و میلم هێنایەوە، پاشان هاوارم بەرەو ڕووی هێرشبەرەکان کرد، پێم وا بێت هێشتا دەنگەکەم نەگەیشتبووە گوێی ئەوان، لە ترسان و بێ ئەوەی خۆم بمەوێت، پەنجەم بەر پەلەپیتکەی تفەنگەکە کەوت، بە هۆی ئەوەی هێرشبەرەکان لەو کاتەدا لە یەک شوێندا کۆ بووبوونەوە، ئاگام لێ بوو، یەکێکیان بە لادا هات و لەسەر دەم کەوتە سەر زەوی، لەناو خۆیاندا بووە هاتوهاوار و ڕاکردن، دووانیان پێکراوەکەیان بە دەستەبەرە هەڵگرت و لە چەند هەناسەیەکدا لە چاو ون بوون، کاتێک گەیشتمە لای هاوڕێکانم و لێم ڕوانین، بەئەستەم ناسیمنەوە، هەموو سەروگوێلاکیان لە خوێن هەڵکشا بوو، عەزیزی کوڕی مامم بێگیان لە تەنیشت سفرەکە کەوتبوو، زەڵاتەکە بەو ناوەدا ڕژابوو، شووشەی عارەقەکەمان شکابوو، پێکەوە پەلاماری عەزیزمان دا و خامێ تفەنگەکەی لە دەست وەر گرتم و پێی وتم، 'دەبێت ئەم بەڵایە لەم دەشتە وەشارین!'

عەزیزم لە کۆڵ کرد و لە دوورەوە گەڕەکی جوولەکان و بەردەرگای کنێسەتەکەمان لێوە دیار بوو، کاتێک لەناو باخەکەی مام مارۆدا بووین، کەوتینە نەدیوی و گەڕەکمان لێوە دیار نەما، خامێ خێرا تفەنگ و فیشەکدانەکەی لە نزیک کەپر و جێگای حەوانەوەی باخەکە لەژێر خۆڵدا شاردەوە، پاشان گەڕایەوە لامان و پێی وتین،

"ئیتر سەریشتان ببڕن باسی ئەو تفەنگە ناکەن و ئێمە چەکمان پێ نەبووە، ئەو کەسەی تفەنگی بەوانەوە ناوە ئێمە نەبووین!"

کاتێک خامێ ئەمەی وت، هەموو سەری ڕەزامەندییمان بۆ لەقاند و کەوتینە ڕێ، لە دوورەوە کەسوکار و هاوڕێ هاتن بەرەو پیرمان و عەزیزیان لە کۆڵ داگرتم و بردیان بۆ حەوشەی کنێسەتەکە، لەوێ لە کاتێکدا خامێ و هاوڕێکانم خەریکی خۆپاککردنەوە و پێچانی برینەکانیان بوون، ناردیان بەدوای کافەی برینپێچی ئامۆزامدا، کافە کچی بنیامینی مامم بوو، تەمەنی خۆی دەدا لە پەنجا ساڵ و دوای مردنی بارامی مێردی بڕیاری دابوو جارێکی تر شوو نەکاتەوە، مامە بنیامین ئەوەندی خۆش دەویست و ڕێزی لی دەگرت، دەمێک بوو داواکەی قبووڵ کردبوو، هەرچ کەسێک دەچووە داوای دەری دەکردە دەرەوە، کاتێک ڕۆژانە لە ماڵ دەر دەچوو تاکو بۆ نەخۆشخانە بۆ سەر کار بچێت، نەک هەر گەنجانی گەڕەکی جوولەکان، بەڵکو کوڕانی چوارباخ و سەرشەقامیش لەسەر ڕێگای دەوەستان و ڕۆژیان بە نیگایەکی کافە دەست پێ دەکرد.

لەناکاو بێدەنگی کەوتە نێو ئەو خەڵکەی لەو کاتەدا لە حەوشەی کنێسەتەکەدا ئامادە بوون، کاتێک سەرم هەڵبڕی بینیم کافە لەنێو دەرگای کنێسەتەکەدا ڕاوەستابوو، هەموو لێمان دەڕوانی، بێدەنگیی ئەو خەڵکە درێژەی کێشا و کەسێک نەبوو فەرمووی لێ بکات، تاکو ئەویش بتوانێت بێتە ناو کنێسەتەکەوە، لەو کاتەدا مامم لە دوایەوە پەیدا بوو، بەهەڵەشەیییەکەوە بە کافەی کچی وت، "بۆ ڕاوەستاویت کچم؟ برۆ بەلایانەوە دەی."

کافە، هەر زوو پێی وتین، کە عەزیز ماوە و جارێکا دڵی لێ دەدات، مامە بنیامین و باوکم لە منیان پرسیی، تاکو لە سەرەتاوە تەواوی ڕووداوەکەیان بۆ بگێڕمەوە، کاتێک بە ڕاستی و ڕەوانی

بۆم باس کردن، مامە بارئاموون وتی، "ئێوە تفەنگتان پێ نەبووە و نازانن کێ تفەنگی بەوانەوە ناوە!"

باوکم پرسیاری تفەنگەکەی لێ کردم، منیش لە وەڵامدا پێم وت، 'نازانم.'

بەتوورەییەکەوە لێی ڕوانیم و پێی وتم، 'گرنگ ئەوەیە باش شاردبێتتانەوە!'

ئێمە لەو قسانەدا بووین، چوار پۆلیس خۆیان کرد بە حەوشەی کنێسەتەکەدا، مامە سلێمان و حاخام چوون بەرەو پیرییان و کەوتنە گفتوگۆ، پاشان تاوێک بەسەر ئێمەدا گەڕان و لێیان ڕوانین و ڕۆشتن، مامم پێی وتین، "ئەمڕۆ یان سبەی، دەبێت بچن بۆ مەخفەری پۆلیس، چونکە ئەوانەی لەگەڵیان بەشەڕ هاتوون شکایەتیان لێ کردووە."

مامە بنیامین پێشنیاری ئەوەی کرد، من نەچم لەگەڵیان و لە ماڵی پوورە فەرداو تاکو چەند ڕۆژێک خۆم بشارمەوە.

دوای ئەوەی عەزیزمان بردەوە بۆ ماڵی خۆیان، من لەوێوە چووم بۆ ماڵی پوورە فەرداو، زۆری پێ نەچوو کاسبکاران لە ناو شارەوە گەڕانەوە، باوکم داوای لێ کردم، کە دان بە خۆمدا بگرم و لە ماڵی پوورم نەیەمە دەرەوە، پوورە فەرداوم بەردەوام لە بەردەرگا وەستابوو، هەرچ کەسێک ڕووی لە گەڕەک دەکرد و بە بەردەمی ماڵی ئەواندا تێ دەپەڕی، هەواڵی لێ دەپرسی و پاشان ئەویش دەهاتە ژوورەوە و بۆ منی باس دەکرد، دوای ئەوەی هێرشبەرەکان بە برینداریێک و سەروگوێلاکی شکاوەوە بۆ ناو شار گەڕابوونەوە، ئیتر کەوتبوونە لێدانی جووە کاسبکارەکان و کەلوپەل و مێزەکانیان سووتاندبوون، دەمەو ئێوارەی ئەو ڕۆژە کاتێک پوورە فەرداو شۆربای نیسکێنی بۆ تێکردم و لەسەر نانەشانەیەک چەند نانێکی تیریی تەڕنەکراوی بۆ هێنام، گوێم لێ بوو لە بەردەمی ماڵی ئەواندا

بوو بە هاوار هاوار، بەپەلە نانەکەم بەجێ هێشت و خۆم گەیاندە قاتی سەرەوەی بالاخانەکە و لەوێوە لە نەدیویدا وەستام و لەسەر شیوەکە و بەر ماڵەکانم ڕوانی، ئەوەی لە منەوە دیار بوو، زیاتر لە چل بۆ پەنجا گەنج و منداڵ دەبوون، زۆرینەیان دار یان بەردیان لەناو دەست بوو، چەندین کەسیان بە جامانە دەموچاوی خۆیان هەڵپێچابوو، چەند پۆلیسێکیش لەوبەری شیوەکەوە وەستابوون، تاکو پۆلیسەکان هەڵگەڕان بۆ ئەوەی بەسەر پردەکەی نزیکی گەڕەکی سەرشەقامدا بپەڕنەوە، خەڵکەکە ڕژانە ناو کۆلانەکانی گەڕەکی جوولەکان، بە دار و بەرد کەوتنە لێدانی دەرگای ماڵەکان و بەردتێگرتنی پەنجەرەکان، لەو کاتەدا من داوام لە پوورم کرد، تاکو جامانەیەکم بداتێ، کاتێک بۆی هێنام، لە سەروگوێلاکمەوە ئالاندم و بەسەر دیواری ماڵەکەدا بازم دا و چووم خۆم تێکەڵی ئەو خەڵکە کرد، دڵم وەختە بوو لە قەفەزەی سنگمدا دەفڕی، هەستم پێ کرد هەموو گیانم ئارەقەی لێ دەچۆڕا، ئەوان چیان دەوت منیش لەگەڵیاندا ئەموتەوە، "کافرن، کافرن، جوولەکەی پیس و کافرن."

چەند کەسێکم لێ ناسینەوە و دەمزانی کێن و کوڕی کێن، زۆربەیان دەموچاویان بە لچکی جامانەکانیان هەڵبەستبوو، بەلام لە نێوانیاندا خەسرەوی سەردار بەگ و حەمەی حاجی سعید ئاغا و کاکەڕەشی سەرشەقامم زوو ناسییەوە، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، مەلا ئەحمەدی خانەقا بوو، پێش هەموویان کەوتبوو، مەلا ئەحمەد نە داری پێ بوو نە بەردی دەهاویشت، بەلام پێشڕەویی دەکردن و خەڵکەکەی بۆ بەردەمی کنێسەتەکە برد، تاکو گەیشتنە ئەوێ، بەدەم ڕێگاوە بەردەبارانی ماڵەکانیان دەکرد، لەو کاتەدا دەرگای کنێسەتەکە داخرابوو، تاوێک دەرگاکەیان دایە بەر دار و بەرد، پاشان بەسەر دیوارەکەیدا خڕەبەردیان فڕێ دایە ناو حەوشەی کنێسەتەکە، لەناکاو

دەرگای کنێسەتەکە کرایەوە و حاخام لەیفی لەگەڵ مامە بنیامین هاتنە بەردەرگاکە و بەرامبەر خەڵکەکە ڕاوەستان، چەند گەنجێک کەوتنە بەردتێگرتنیان، مەلا ئەحمەد پێشی لێ گرتن و خۆی چوو لەگەڵ حاخام و مامە بنیامیندا ڕاوەستا، خەڵکەکە دوای مەلا ئەحمەد کەوتن و لە چواردەوری حاخام و مامم کۆ بوونەوە، تووڕەیی ئەو خەڵکە لەوەدا نەمابوو بە کەسێکی وەکو مەلا ئەحمەد ڕێگای لێ بگیرێت، بەردەوام دارەکانی دەستیان بەرەو ڕووی حاخام بەرز دەکردەوە، چەند گەنجێک لە دوورەوە بۆ ناو حەوشەی کنێسەتەکە خەریکی بەردهاویشتن بوون، کاتێک پۆلیسەکان لە سەرەوەی کۆڵانی کنێسەکەوە پەیدا بوون، بەدەم ڕێگاوە پۆلیسێک لوولەی تفەنگەکەی کردە حەوا و دوو فیشەکی تەقاند، لە دەنگی تەقەکان چەندین کەس لە هێرشبەرەکان کەوتنە خۆدزینەوە و ڕاکردن، بەتایبەتی ئەوانەی وەکو من تەنها تەماشاکەر بوون، پۆلیسەکان ڕێگەیان لێ گرتن و ڕووی تفەنگەکانیان تێکردن، تا ئەو کاتەی چەند کەسێک بەردیان گرتە پۆلیسەکان، گوێم لە دەنگی تەقەکان بوون و لە دوورەوە بینیم دوو گەنج بە لادا کەوتن، منیش ناچار پاشەوپاش گەڕامە دواوە و بەدەم ڕێگاوە جامانەکەم لە سەروگوێلاکم کردەوە، کاتێک گەیشتمەوە بەردەمی ماڵی پوورە فەرداو، بینیم چوار پۆلیسی تر بەڕاکردن بە کەناری شیوەکەدا داگەڕان و بەرەو ناو ماڵەکانی گەڕەک و بەرە و کنێسەتەکە دەچوون.

ئەو ئێوارەیە لەبەردەم کنێسەتەکەدا گەنجێک کوژرا و هەشتی تریش بریندار بوون، بێجگە لەوەی پۆلیسەکان ٢٢ کەسیشیان لێ دەستگیر کردبوون، ئەو شەوە تاکو ڕۆژی دوایی لە تەواوی گەڕەکی جوولەکاندا چەندیین پۆلیس ئێشکچی بوون، دوای ئەو ڕۆژە، کاتێک خامێ و ئەوان بە سەروگوێلاکی شکاوەوە بۆ مەخفەری پۆلیس

چووبوون، یەک یەک لێپرسینەوەیان لەگەڵدا کرابوو، هەر وەکو بڕیارمان لەسەر دابوو، ئەوان لە وەڵامدا وتبوویان ئێمە بێئاگاین لەوەی کەسێک بە فیشەک بریندار کرابێت.

حەفتەیەک دوای ڕۆژی ڕووداوەکـان، لە کاتی نانخواردنی ئێوارەدا، باوکم باسی ئـەوەی بۆ کـردم، کە سمکۆخانی شکاک مانگێک پێش ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەی گەڕەکی جوولەکان، لە شاری شنۆ کوژراوە، هەستم بە باوکم کرد بە کوژرانی سمکۆ زۆر دڵتەنگ بوو، چونکە باوکم چەند ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە بۆ سەردانی خوشک و براکانی سەردانی شاری شنۆی کردبوو، هەروەها ئەوەی بۆ باس کردبووم چۆن لە نزیکەوە سمکۆخانی شکاکی بینیوە و ڕێزی لە باوکم گرتووە و میواندارییی کردووە.

پاشان باوکم باسەکەی گۆڕی.و لەبەرخۆیەوە ئەوەی پێ وتم، کە ئەو گەنجانەی حەفتەی پێشوو لە بەردەم کنێسەتەکەدا گیران، هەموویان سزای گرانیان بەسەردا دراوە، سێ کەسیان بە سێ ساڵ زیندانی سزا دراوە، هەروەها چەند کەسێکیشیان لە سلێمانی دوور دەخرێنەوە.

بۆ لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوە لیژنەیەکی تایبەت لە بەغدادەوە بۆ سلێمانی هاتبوون، لێژنەکە سەردانی گەڕەکی جوولەکانیان کرد و لێدوانیان لەگەڵ زۆرینەی دانیشتووانی گەڕەکدا کرد، مانگێک دوای ڕووداوەکـە، لە ماڵی عەبدوللا ئاغای سەرشەقام، مەلای مزگەوتەکانی ناو شار و حاخام و مامە بنیامین و چەندین لە کاسبکاران و هرمز یوسف شمعوون قەشەی کەنیسەی مریەم پێکەوە کۆ بوونەوە، ئەو ئێوارەیە خۆم لەوێ بووم و چا و ئاوم دەگێڕا، بێجگە لەوەی هەموو ناڕەزاییی خۆیان لەسەر ئەو ڕووداوە دەر بڕی، پێکەوە بڕیاریان دا پارە بۆ ماڵی کوژراوەکە کۆ بکەنەوە

و هاوکاریی بریندارەکان بکەن، کاتێک باس هاتە سەر باسی ئازادکردنی گیراوەکان، حاخام لە وەڵامدا وتی، 'من بۆ ئەو مەبەستە قسەم لەگەڵ مەندوبی مەلیک فەیسەڵدا کردووە، بەڵام ئایا تاکو چەند، لە بەغداد گوێ لە ئێمە دەگیرێت، لە کاتێکدا گیراوەکان بۆ گرتووخانەی کەرکووک گوێزراونەتەوە، بۆ مەعلوماتی هەمووان ئێمە لای پۆلیس دەعوامان لەسەر کەسیان تۆمار نەکردووە، بەڵکو پۆلیسەکان خۆیان بەسەریانەوە شایەت بوون!'

## ١٧

سالانێک تێپەڕین و چەندین گۆڕانکاری ڕوویان دا و من هێشتا دوای کوژرانی ڕەحیم و ڕەجمان بە ماڵ و شاری سلێمانی گەشبین نەبووم، چەند جارێک ویستم بەتەنیا و بەبێ ئەوەی کەس ئاگادار بکەمەوە سەری خۆم هەڵگرم و بڕۆم، پاشان بە ڕێکەوت مانگی دووی ساڵی ١٩٣٦ لە بەغداد لە شەریکەی تۆماس کوک بیتاقەی قیتارم بڕی، بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی لە نووسینگەکە وەرم گرت، گوایا لە ڕێگای ئەستەنبوڵەوە بە حەوت ڕۆژ دەگەمە شاری پاریس.

پێش ئەوەی بچم بۆ بەغداد و سەفەر بۆ ئەورووپا بکەم، حەکیمی کوڕم و کلیلی دوکان و ماڵم دایە دەستی کەتانی خوشکم و پێم وت، 'خوشکێ گیان بەنیازی سەفەرم، دەزانم دەڕۆم، بەڵام نازانم کەی دێمەوە.'

'چۆن؟ قەرزارم بێت ئەگەر بڕۆیت و نەگەڕێیتەوە، ئەوا قەت لێت خۆش نابم!'

کەتانی خوشکم ئەمەی بەدەم گریانەوە پێ وتم، پاشان توند دەستی لە دەستم هەڵپێکا، داوای لێ کردم پەیمانی پێ بدەم و بۆ لای بگەڕێمەوە، منیش بە ناچاری پێم وت، 'خوشکێ گیان پەیمان بێت، درەنگ یان زوو دەگەڕێمەوە.'

ئەو چەند ڕۆژە بێجگە لە حەمەجان سەلیم سەردانی کەسم نەکرد و خۆم لە بینینی ناسراو و دۆستەکانم پاراست، لەبیرم دێت حەمەجان سەلیم پێی وتم، 'قەرزاری دونیا و قیامەتم بێت ئەگەر

نەگەڕێیتەوە، یان ئەگەر بەنیازی مانەوەیت لە ئەوروپا با منیش لەگەڵت بێم.'

'باوەڕ ناکەم بەبێ ئەم شارە و دوور لە ئێوە بتوانم لە غەریبیدا ژیان بەسەر بەرم.'

حەمەجان داوای لێ کردم کامێرایەکی وێنەگرتنی بەدیاری بۆ بێنم، پێی وتم، با وەکو ئەوەی کابرای ئینگلیز بێت، مەبەستی حەمەجان سەلیم لەو کامێرایە بوو، کە ئینگلیزێک دە ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە وێنەی هەردووکمانی لە بەردەرکی سەرا پێ گرتبوو.

ڕۆژی یەکشەممە کاتژمێر شەشی سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٦ی مانگی دووی ساڵی ١٩٣٦ لە وێسگەی باکووری بەغداد سواری قیتار بووم، لەگەڵ سێ کەسی تردا لە کابینەی ژمارە هەشت بووم، تورکمانێکی دانیشتووی شاری کەرکووک و دوو ئاشووریی دانیشتووی شاری بەغداد بوون، کابرای تورکمان وتی، کە بۆ شاری ئەستەنبوڵ دەچێت و لەوێ بەدوای ژنەکەیدا دەگەڕێت، کە دە ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە ڕەدووی سەربازێکی تورک کەوتووە و بەرەو ئەستەنبوڵ ڕۆیشتوون، دوو هاوەڵەکەی ترم برا بوون و هەر زوو ئاشکرایان کرد، کە بەنیازی ئەوەن بچن بۆ ئیتالیا و لەوێوە سەردانی ڤاتیکان بکەن.

قیتارەکەمان گەیشتە تکریت و لەوێوە بۆ مووسڵ بەڕێ کەوت، تاوەکو لە مووسڵیش دەر چووین زۆر قسەمان لەگەڵ یەکترین نەکرد، کاتێک لە قامیشلی دەر چووین و لە شاری ماردین نزیک بووینەوە، یەکێک لە ئاشوورییەکان لەبەرخۆیەوە وتی، 'کاتی خۆی ئەم شارە تەواوی مەسیحی بوون، ئیتر زەبر و زۆری دەسەڵاتی تورک زۆربەی خەڵکە ئەسڵەکەیان دەربەدەر کرد.'

کابرای تورکمان دەنگی هەڵبڕی و بەتوورەییيەوە پێیوتن، 'ڕاست ناکەیت، هەمووی درۆودەلەسەیە، مەسیحیی چی و تەڕەماشی چی!'

لەو کاتەدا تورکمانەکە لە جێگاکەی خۆی ڕاست بوویەوە و بەرامبەریان ڕاوەستا و دەیویست پەلاماری ئاشوورییەکان بدات، پاشان هەڕەشەی ئەوەی لێ دەکردن لە وێستگەی غازی عەنتاب بەگرتیان دەدات، ئەوەی لەبیرم مابێت، کابرای تورکمان بە ئاشوورییەکانی دەوت، 'تاوەکو عێراق موڵکی ئێمەیە و تەواوی سەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانییە و ئێوەی مەسیحییش ژێردەستە و بگرە کۆیلەی ئێمەی موسوڵمانن، ئیتر چاوەڕوان بن ئەمڕۆ یان سبەی سوپای ئیسلام هەڵدەستێتەوە و ئینگلیزی داگیرکەر تەفروتونا دەکات.'

یەکێک لە دوو کابرا ئاشوورییەکە وتی، 'مەگەر بە زوڵم و زۆر بتوانن جارێکی تر دەسەڵات لە عێراقدا بگرنەوە دەست، ئەگین ئێوەی تورک لە ناوچەکەدا دینی ئیسلامتان کردۆتە حوجە بۆ بەهێزکردنی قەوارەی خۆتان، هەر وەکو چۆن عەرەب لەژێر ئاڵا و ناوی دیندا کردی.'

کاتێک کابرای تورکمان پەلاماری یەکێک لە ئاشوورییەکانی دا، هەر لە سەرەتاوە دیار بوو ئاشوورییەکان زاڵ بوون و تاوەکو یەکێکیانم دەگرت ئەوی تریان سواری سەری کابرای تورکمان دەبوو، زیاتر لە کاتژمێرێک بەو جۆرە شەڕ لە نێوانیاندا بەردەوام بوو، لە ئەنجامدا دوو کابرا ئاشوورییەکە زۆریان لە تورکمانەکە دا، من لە جێگاکەی خۆمدا دانیشتبووم و بێدەنگ گوێم لێ دەگرتن و لێم دەڕوانین، کابرای تورکمان لە بەرپێی ئاشوورییەکاندا کەوتبوو، لە دەم نەدەکەوت و بەردەوام جنێوی پێ دەدان، ئەوانیش ناچار بوون وازی لێ بێنن و لە جێگای خۆیان دانیشتنەوە، بە درێژاییی

ئەو ڕێگایە هاوسەفەرەکانم لە شەڕکردن و لێدوان بەردەوام بوون، کاتێک دوای سێ ڕۆژ گەیشتینە شاری ئەستەنبوڵ و قیتارەکە لە وێسگەی حەیدەر پاشا وەستا، هاوسەفەرەکانم ئەوەندە ماندوو بوون، هەرسێکیان لە پرخەی خەودا بوون، کاتێک من لە دابەزیندا بووم، یەکێک لە ئاشوورییەکان بەخەبەر هات، خێرا بەچپە داوای لێ کردم، کە کابرای تورکمان بەخەبەر نەهێنم، نەوەکو لای پۆلیس شکاتیان لێ بکات و تووشی کێشە ببن و سەفەرەکەیان دوا بکەوێت.

کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ بوو، لەگەڵ دوو کابرا ئاشوورییەکە چووین بۆ میوانخانە، ڕێکەوتی کابرای تورکمانمان نەکردەوە و ڕۆژی دوایی پێکەوە بە بەلەم بۆ بەشی ئەورووپای ئەستەنبوڵ پەڕینەوە، لەوێوە بە قیتارێکی تر بەرەو بولغاریا بەڕێ کەوتین، قیتارەکە دوو ڕۆژ بێوچان بەنێوان شاخی بەفرین و دارستاندا تێپەڕی، گەیشتینە ئەڵمانیا لە وێستگەی شاری مونشن شەوێک لەناو قیتارەکەدا نووستین، پاشان ڕۆژی دوایی قیتارمان گۆڕی بۆ لوکسەمبۆرگ و لەوێوە کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ گەیشتینە وێستگەی شاری پاریس. کاتێک دابەزین دوو هاوڕێ ئاشوورییەکەم لەناو جەنجاڵی وێسگەی پاریسدا لێ ون بوو، دیار بوو دیمەنی بیناسازیی و شێواز و جلوبەرگی خەڵک بە جۆرێک سەرسامیان کردبووم ئاگام لای خۆم و هاوڕێکانم نەمابوو.

لەناو هۆڵی وێستگەکەدا تاوێک چاوم بۆ گێڕان، پاشان کاتێک لە وێستگەی پاریس چوومە دەرەوە خۆر ئاوا بووبوو، تاکو شەو درەنگ بە شەقام و بازاڕەکانی پاریسدا گەڕام، هەستەکانم غەریب بوون بەو جیهانە نوێیە و بەردەوام هەموو شتێکم لەگەڵ بەغداد و سلێمانیدا بەراورد دەکرد، جیاوازییەکان ئەوەندە زۆر بوون و سەرسام بووم پێیان، ئاگام لە بەسەرچوونی کات نەمابوو، دوای

ئەوەی چوار میوانخانە گەڕام، هەر زوو لە دەستکەوتنی جێگا بێهیوا بووم، پاشان دوای کاتژمێر دوانزەی شەو لە چەند کەسێک پرسیاری جێگای خەو و مانەوەم کرد، دیار بوو نەمتوانی بەباشی تێیان بگەیەنم، ناچار بووم ئەو شەوە کە تەنها چوار کاتژمێری تەمەن مابوو، لە کووچەیەک و ژێر پردێکدا بخەوم، ڕۆژی دوایی بە زمانی عیبری هەموو کەسێکم دەدواند و پرسیاری بازاڕی جووەکان یان کنێسەتم لێ دەکردن، بە ڕێکەوت لە شانزەلیزەی چوومە بەردەمی کنێسەتێک و بە ئەستێرەکەی داودا ناسیمەوە، ئەو ڕۆژە لە ئەڵمانیا و چەند وڵاتێکی هەرێمی بەڵقانەوە نێزیکەی دە خێزانێک ناچار کرابوون و بۆ پاریس هەڵهاتبوون. کاتێک کەوتمە لێدوان لەگەڵیاندا و باسی خۆم بۆ کردن و پێم وتن، کە دەمەوێت بەیەکجاری لە پاریس بمێنمەوە، پیاوێکی بەتەمەن، کە لە شاری کیێف حاخامی کنێسەت بووبوو، توند یەخەی گرتم و هاواری کرد بە سەرمدا و بەتوڕییەوە پێی وتم، 'ڕۆژ بە ڕۆژ بیری نازییەت لە ئەورووپادا پەرە دەسەنێت، لە هیچ وڵاتێکدا ئێمەی جوو پارێزراو نابین و مەجبوور دەبین بۆ ئەمریکا یان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بڕۆین، ئیتر تۆش لەوێوە هاتوویت و دەتەوێت لەم دۆزەخە بمێنیتەوە؟'

ئێوارەی ڕۆژی یەکەمم لەو کنێسەتە لە کاتی نانخواردندا بە ڕێکەوت ڕووم بوو بە ڕووی ئافرەتێکی قژزەردی چاوشینەوە، خێرا دەستی تەوقەی بۆ درێژ کردم و خۆی بە مارتا ئادەم پێ ناساندم، بۆ دوو مانگ دەچوو لە پراگەوە هاتبووە پاریس و لە بێدەرامەتیدا لەو کنێسەتە دەژیا، مارتا کوڕێکی تەمەن هەشت ساڵانی پێ بوو، هەرچەند لە لای من وتی کوڕی خوشکمە، بەڵام لەیفی هەشت ساڵان مارتای بە دایکە بانگ دەکرد، ئەو شەوە پێکەوە چووین بۆ کافتریای پییێر لە شانزەلیزەی و شەرابمان خواردەوە، پاشان ڕۆژی

دووەم لە ئوتێلێکی نزیک کنێسەتەکە ژوورێکم بەکرێ گرت، پاشان مارتا و لەیفیم بردە لای خۆم، مانگێک تێپەڕی و لەگەڵ مارتا تەنها خەریکی شەرابخواردنەوە و ڕابواردن بووین، بەبیرم دێت زۆربەی کاتمان لەناو جێگادا بەسەر دەبرد، بەبێ ئەوەی تەنها بۆ جارێک چییە وشەی خۆشم ئەویێت بە یەکتری بڵێین، تەنها ئەوەندە نەبێت مارتا زوو زوو پێی دەوتم، 'لەگەڵم وەرە بۆ ئەمریکا، یان پارەی ڕۆیشتنم بۆ خەرج بکە.'

مارتا و لەیفیی کوڕی، پاریسیان بەجێ هێشت و بە قیتار بەرەو هۆڵەندا بەڕێ کەوتن، پاشان بڕیار وا بوو لە شاری ڕۆتردامەوە بە پاپۆڕ بەرە و نیویۆرک بڕۆن، دوای ڕۆیشتنی مارتا مانگێک لە پاریس مامەوە، بەڵام بەردەوام بە کووچە و کۆڵانەکانی پاریسدا بەمەستی بۆ مارتا دەگەڕام، لە ڕەوانەکردنی و دابڕانم لێی زۆر پەشیمان بووم، ویستم هەمان ڕێگا بەرەو ئەمریکا بگرمە بەر و بەدوای ئەودا بڕۆم، بەڵام وەکو گەڕیدەیەک ڕێگای وڵاتم گرتە بەر و چۆن چووبووم، ئاوایش بۆ عێراق گەڕامەوە، لە گەڕانەوەمدا زۆر سەرمەست و غەریبیی مارتام دەکرد، هەستم دەکرد عەشقی مارتا گۆڕانکاریی بەسەر خەیاڵ و ڕۆحی مندا هێنابوو، تاوەکو لە وێستگەی بەغداد لە قیتار دابەزیم لە گەڕانەوەم پەشیمان بووم.

## ١٨

تەمموزی ساڵی ١٩٣٩ بوو، پێش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، فرنسیس هات بۆ دوکانەکەم لە قەیسەریی نەقیب و پێی وتم، 'کاک عەبدولکەریمی برام لە بەغدادەوە گەڕاوەتەوە و دوانیوەڕۆ لە کەنیسەی مریەم لە گاوران چاوەڕوانت دەکات و دەیەوێت بتبینێت.'

نزیکەی ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە، لە بەغداد میوانداریی عەبدولکەریم ئەلیاسم کرد، مانگێک پێش ئەو ڕۆژەیش عەبدولکەریم بە نامەیەک ئاگاداری کردبوومەوە، کە بە سەردان دێت بۆ سلێمانی و پێکەوە لەگەڵ حاجی تۆفیقدا بەخێرهاتنی قەشەی نوێی کەنیسەی مریەمی عەزرا دەکەین، حەفتەیەک بوو قەشە عمانوئیل حداد لە کەنیسەی مریەم دەستبەکار بوو.

دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، لە ئەسحابەسپییەوە خۆم کرد بە کۆلانی گەڕەکی قەزازەکاندا، لەتاو گەرما وەختە بوو هەناسەم لەبەر دەبڕا، بۆ ئەوەی ئەو ئارەقە و تۆزی ڕێگا لە رووم نیشتبوو لە خۆم پاک بکەمەوە، خۆم کرد بە مزگەتی قەزازەکاندا، پاش ئەوەی سەرئاوێکم کرد چووم بۆ لای حەوزەکە، ڕوانیم، کوڕێکی گەنجی پرچدرێژ سەری شۆڕ کردبۆوە بۆ بەر پلووسکی ئاوەکە، دیار بوو ئەویش گەرما زۆری بۆ هێنابوو، لە پشتیەوە ڕاوەستام و تاوێک لێی ورد بوومەوە، بە سەر و هەیکەل و جلەکانیدا دیار بوو خەڵکی شار نییە، لە کاتێکدا ئەو زۆری پێ چوو، چووم لە سێبەری کەپری دارمێوەکەدا ڕاوەستام، هەردوو دەستی بەملاولای خۆیدا شۆڕ

کردبۆوە و جوولەی لە خۆی بڕی بوو، بێجگە لە خوڕەی ئاوەکە، هیچی ترت نەدەبیست، کابرایەکی پیری کورتەبالای ڕەشتاڵە، لە دەرگای هۆڵی مزگەوتەکەوە بەکۆکەکۆک هاتە دەر، دەرپێیەکی سەرخەرمانی سپیی لە پێدا و چۆغەیەکی بۆریی لەبەردا بوو، بەپەلەپەل جووتێک نەعلی کرد بە سەر پێیەوە و بەڕاکردن بە لای مندا تێپەڕی، بێ ئەوەی لێم بڕوانێت و هیچ بڵێت، دەستێکی بۆ بەرز کردمەوە، کاتێک من لە خەیاڵی ئەوەدا بووم، ئاخۆ دەبێت قەشەی نوێی کەنیسەی مریەم کێ بێت و لە کوێوە هاتبێت، دیسان کابرای پیر لە بەردەممدا قوت بوویەوە.

'سەلام برای خاس، ئەوە خێرە وا قەیریکە لێرە وێستیاوی؟'

'سەلام مامە گیان، ئینتیزاری ئەو برایە دەکەم، لە سەرشۆردن تەواو بێت و منیش دەست و دەموچاوێک بشۆم، ئەوە لەوەتەی من لێرەم، ئاوا بەو چەشنە، نە دەجوولێت و نە تەواویش دەبێت.'

'کوڕە خۆ ئێرە حومام نییە، مزگەوتە و ماڵی خوا و جێگای هەموو موسوڵمانێکە.'

چوو بەسەر کوڕە گەنجەکەوە وەستا و بەسەریدا دانەوییەوە و دەستێکی خستە سەر شانی، 'ئەرێ برا، تۆ خەریک چیت؟ ئەو پلووسکە ئاوە جێگای دەستنوێژگرتنە نەک سەروگوێلاک شۆرین.'

گەنجەکە هەڵسلەمییەوە، وەکو لە خەونێکی قووڵ ڕاپەڕیبێت، کاتێک هەستایە سەر پێ، گەنجێکی کەڵەگەتی سەروڕیشهاتوو، لووتئاوساو و بەرچاو و سەر ڕوومەتەکانی سوور دیار بوون، لچ و لێوی مۆر هەڵگەڕا بوو، بەرۆکی کراسەکەی خوێن پێوەی مەلاسەی کردبوو، کابرای پیر لە تاوان پاشەوپاش دوو هەنگاوێک چووە دواوە، 'ئەوە چییە ماڵخراو؟ چیت لێ قەومیاوە؟'

گەنجەکە دوای ئەوەی لە هەردووکمان ورد بوویەوە، بەعەرەبی

وتی، 'لێیان داوم، غەدریان لیَ کردووم!'

دیار بوو کابرای پیر لێی تێنەگەیشت، چونکە لەو کاتەدا لە منی ڕوانی و هەردوو دەستی پان کردەوە، 'ئەوە یەژێ چی؟'

'دەڵێت لێیان داوم!'

سەیری گەنجەکەم کرد، 'خەڵکی کوێیت؟'

دوای ئـەوەی بـە سـەری پەنجەکانی چـاوی خوێنتێزاو و هەڵئاوساوی هەڵگلۆفی، بە دەنگێکی تێکشکاو و گریاناوییەوە وتی، 'گەڕیدەم و لە سووریاوە هاتووم، دوێنێ شەو گەیشتمە ئێرە و لە گەڕاجێک مامەوە، لە نیوەی شەودا و لە خەودا پەلاماریان دام و چیم پێ بوو لێیان ساندم و ئیتر ئاوایان لێ کـردم، تەنانەت ئینجیلەکەشیان بردم.'

ڕووم لە کابرای پیر کرد و ویستم بەسەرهاتی کوڕە گەڕیدەکەی بۆ باس بکەم، گەنجەکە قسەکەی پێ بڕیم، 'من لە کەنیسەی مریەمی عەزرا دەگەڕێم!'

کابرای پیر هەڵی دایە و بەپەشۆکاوییەوە، 'کوڕە، با بیگەیەنینە جێیەک، یان لای دۆختۆرێک!'

'لالۆ گیان، ئەم کوڕە گەنجە مەسیحییە، غەریبە و لە سووریاوە هاتووە و لە کەنیسەکەی گەڕەکی گاوران دەگەڕێت!'

'کوڕە خوای دەکرد جوولەکە دەبوو، عەبدی خوا نییە؟'

کابرای پیر دەستی خستە سەر قۆڵی گەنجەکە و ویستی بەرە و دەرگای حەوشەی مزگەوتەکە پێش خۆی بدات، بانگم لە کابرای پیر کرد و پێم وت، 'لالە گیان، مادام ئەم غەریبە دەتوانێت بە پێی خۆی بڕوات، کەواتە ئا ئەوە کەنیسەکەیە و لێرەوە نزیکە، بیگەیەنینە ئەوێ باشترە، خۆ من هەر نیازی ئەوێم هەیە و لەگەڵ خۆمدا دەیبەم.'

'بۆ تۆیش گاوریت؟'

'نەخێر.'
'دەی لە قسوورم عەفووکە، دیارە موسوڵمانیت؟'
'نەخێر لالە گیان موسوڵمانیش نیم!'
'یەژم خۆ خوا نەکردە جوولەکەیش نەویت؟'
'بەڵێ ڕاستت فەرموو، باشی بۆ چوویت.'
'ئەرێ یەژم ئەگەر جووی چیت دایە لە مزگەوت و ماڵی خوا؟"
'وەکو خۆت ئەڵێیت، ئەگەر ئێرە ماڵی خودا بێت، ئەوە منیش وەکو تۆ و ئەو برا مەسیحییە غەریبە بەشمان پێوەیەتی.'
'کوڕە ناماقووڵیت کرد.'
'دیارە جەنابت لێرە دەمڕاستی خوایت؟'

کابرای پیر، تاوێک لێی ڕوانیم و بەتووڕەیییەوە قۆڵی چۆغەکەی هەڵکرد، 'کوڕە بێدین، ئەرێ وەڵا من لێرە مجەورم و خۆم کولفی کولم!'

بەدەوری خۆیدا ڕوانی و بەتووڕەیییەوە بەرەو دەرگای هۆڵی مزگەوتەکە چوو، لەو کاتەدا فرسەتم هێنا و چووم لەبەر پلووسکی ئاوی حەوزەکە پڕ بە چنگم چەند جارێک ئاوم کرد بە دەموچاومدا، لەناو هۆڵی مزگەوتەکەوە گوێم لە دەنگەدەنگ بوو، دیار بوو لە ژوورەوە کابرای مجەور لەگەڵ کەسێکی تردا دەدوا، باڵی گەڕیدەکەم گرت و پێکەوە لە دەرگای مزگەوتەکە چووینە دەرەوە، بە کۆڵانەکەدا لای ڕاستی دەرگای مزگەوتەکەمان گرتە بەر، تاکو لە کۆڵانەکە ڕەت بووین چەند جارێک ئاوڕم دایەوە.

کاتێک لەگەڵ گەنجە غەریبەکە گەیشتینە گەڕەکی گاوران و کۆڵانی کەنیسەکە، ڕوانیم لە بەردەمی کەنیسە چوار کەس وەستابوون، لە دوورەوە حاجی تۆفیق و حەمەئەمین زەکی و عەبدولکەریم ئەلیاسم ناسییەوە، کەسی چوارەم کابرایەکی بەتەمەنی سەروڕیش درێژ و

قاتێکی جلی سەرتاپا ڕەشی لەبەردا بوو، تەپلەیەکی مۆری لەسەردا بوو، لە دوورەوە کابرای جلڕەش لەگەڵ ئێمەی بینی بەهەڵەداوان بەرەو پیرمان هات، گەیشتە نزیکمان، بێ ئەوەی لە من بڕوانێت، بە عەرەبی لە گەنجەکەی پرسی، "ئەوە کوڕم، چی ڕووی داوە و چۆن گەیشتوویتەتە ئێرە؟"

گەنجەکە کاتێک وەڵامی قەشەی دایەوە، بەترسەوە و وەکو منداڵێک، کە لاسارییەکی کردبێت، لەژێر لێوەوە، "باوکی بەڕێزم، بۆ خزمەتی تۆ هاتووم!"

لە خەیاڵی خۆمدا وتم، 'پێ دەچێت ئەم گەڕیدەیە کوڕی ئەو پیاوە بێت؟'

عەبدولکەریم ئەلیاس و ئەوان گەیشتنە لامان و پێکەوە کوڕە گەڕیدەکەمان لەگەڵ خۆماندا بردە ناو حەوشەی کەنیسەکەوە.

بەدەم ڕێگاوە خۆم بە قەشە عەمانوئیل حداد ناساند، قەشە باسی کرد، کە چەند ساڵێک قەشەی کەنیسەی دێرەزوور بووە و ئەو گەنجە لەوێ قوتابیی خۆی بووە. دوای ئەوەی قەشە عەمانوئیل حداد لە کەنیسەی دێرەزوور لە سووریا دەڕوات، ئەو گەنجە شوێنپێی مامۆستاکەی هەڵدەگرێت و بەو جۆرە خۆی دەگەیەنێتە شاری سلێمانی، لەگەڵ گەیشتنیدا و شەوی یەکەمی مانەوەی لە گەراجی سەعید تەها کۆیی، ڕووتیان کردبۆوە و زۆریان لێ دابوو، عەبدولکەریم ئەلیاس فرەنسیسیی بەدوای خالیدی برینپێچدا نارد، دوای ئەوەی فرەنسیس گەڕیدەکەی لەگەڵ خۆیدا برد، ئێمە چوارقۆڵی لە ژووری تایبەتیی قەشە دانیشتین، دوای چاخواردنەوە عەبدولکەریم ئەلیاس وتی، 'گوزەرانی کەمایەتییەکانی وەکو مەسیحی و جوولەکە لە تەوای عێراقدا لەژێر هەڕەشەی عەرەبە شۆڤێنستەکاندایە، لەوانەیە ئێوە باشتر ئەوە بزانن، ئەو بەڵایە

گەیشتۆتە سلێمانی و شار و گوندەکانی تری کوردستان، ئەگەر ئاوا بڕوات، لە پاشەڕۆژدا، خێزانێکی جوو یان مەسیحی مەزهەب، لەم وڵاتەدا ناتوانێت بەئاسوودەیی بژی.'

ڕۆژانە هەواڵی ڕووداوەکانی ئەورووپا و جیهان دەگەیشتن، لەو چەند ڕۆژەی ڕابردوودا ئەوەندەم لەسەر زوڵم و زۆری ئەڵمانەکان بیستبوو، لەوێدا نەمزانی لەوێوە دەست پێ بکەم و کام ڕووداو بکەمە نموونەی قسەکانم.

کاتێک عەبدولکەریم ئەلیاس وتی، 'ئیتر ئینگلیز و ئەڵمان هەردووکیان وەکو یەک زاڵم و داگیرکەرن.'

بێزارییەک دایگرتم و تەواوی جەستەم گەرم داهاتبوو، چەند جارێک بەبێزارییەکەوە دەستەکانم لێک هەڵگلۆفین و چاوم پێدا گێڕان و وتم، 'لە ئەورووپا و بگرە لە تەواوی جیهاندا بەهۆی بیروبۆچوونی نازییەکانەوە بەتایبەتی بەرامبەر جووەکان، بۆ زانیاریتان بەڕێزان زیاتر ماڵوێرانییەکە بۆ جووەکانە، ئەگەر بزانن چی ڕووی داوە لە وڵاتانی ئەورووپادا، چۆن ئەڵمانەکان و گەل و گرووپە ناوچەییەکانی ئەورووپا جووەکان ڕەشەکوژ دەکەن، پێم وا بێت ئەمە سەرەتای گرژی و ئاڵۆزییەکانە و لە داهاتوودا خراپتر دەبێت و ئەوە خەریکە بەرایی ئەو ڕق و کینەیە دەگاتە ئێرەش.'

حەمەئەمین زەکی پرسیی، 'ئەری دەڵێن، ڕەشید عالی چووە بۆ ئەڵمانیا و سەردانی هیتلەری کردووە، تۆ بڵێی ئەوە ڕاست بێت؟'

حاجی تۆفیق هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی، 'بەڵێ ڕاستە، زوڵم و زۆری ئینگلیز داخێکی ئەوەندە گرانیان کردۆتە دڵی خەڵکییەوە، ئەوەتا نەتیجەکەی لە سلێمانی و تەواوی شارەکانی تری عێراق بە ڕەوشتی ئەو خەڵکەوە دەبینرێت، هەرچ کەسێک ئەبینیت سمێڵێکی هیتلەریی داناوە و گۆرانی بە باڵای هیتلەردا دەڵێت، جا ماڵوێرانییەکە

لەوەدایە هەموو چین و توێژەکانی گرتۆتەوە، تەنانەت نووسەر و ڕۆشنبیرەکانیشمان هەموو خۆیان بە قەومی ئاری دەزانن.'

حاجی تۆفیق ویستی بەردەوام بێت، عەبدولکەریم ئەلیاس قسەکەی پێ بڕی، 'بیری ناشیۆنالستیی کوردی و خۆتێکەڵکردنیان لەگەڵ عەرەبەکاندا، جا برایان عەرزتان بکەم... خەتەرەکە ئا لێرەدایە، ئەوە بە هیچ شێوەیەک لە ساڵحی خەڵکی کوردستاندا نییە، بەتایبەتی شاری سلێمانی، ئەوەی بۆ من ئاشکرا بووە، عەرەبەکان دەیانەوێت زۆرینە، کە موسوڵمانەکانن، بکەن بە گژ کەمایەتییەکانی تردا، نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت، کە دە ساڵێک پێش ئێستا چی لە مووسڵ ڕووی دا و چۆن کوردە موسوڵمانەکانیان هان دا و قەتڵوعامی مەسیحییە ئاشوورییەکانیان پێ کردن، لە ساڵانی ۱۹۳۰وە بیری ناشیۆنالستیی عەرەبی بەردەوام جوولەکان و مەسیحییەکان، ئەم دوو کەمایەتییەیان بە هێز و بڕبڕەی بیری سیاسی و ئابووریی گەلانی کوردستان زانیوە، جوولەکان و مەسیحییەکانی کوردستان و عێراق برینی سەر زمانی ئەوانن، لە هیچ جێگایەک ئەو کۆمەڵکوژییەی ئاشوورییەکانی موسڵ تۆمار نەکراوە، لە کاتێکدا باس لە کوشتنی زیاتر لە ٦٠ هەزار ئاشووری دەکرێت، عەرەبە شۆڤێنیستەکان بەردەوام پڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن و بە گوێی هاودینە کوردەکاندا دەدەن، گوایا دانیشتووانی ڕەسەنی کوردستان تەنها موسوڵمانن، هەڵبەتە ئەمەیش بە پلانە و ئەوان موسوڵمانەکانی کوردستان بە برا و هاودینی خۆیان دەزانن. بۆ لەبەریەکهەڵوەشاندنی بنەمای ئابووری و هێزی سیاسیی نەتەوەکانی کوردستان، تەنها لەبەر هۆکاری ئایین و زمان و جیاوازییان.'

'من هەواڵی ئەو ڕەشەکوژییەی ئاشوورییەکانم بیستبوو، بەڵام بێئاگا بووم لەو ژمارە زۆرەی کوژراوان کە تۆ باسی لێوە دەکەی!'

کاتێک حەمەئەمین زەکی ئەمەی وت، بۆ چەند هەناسەیەک بێدەنگی کەوتە نێوانمان، پاشان من دەستم خستە سەر ڕانی عەبدولکەریم ئەلیاس و پێم وت، 'بەڕاستی کارەساتە، بەڵام ئەوەش پەیوەندیی بە توانای ئەقڵی خەڵکی ئەم ناوچەیەوە هەیە، ئیتر ئەوە ڕەوشتی مرۆڤە و لە هەر جێگایەک دەستە و تاقمێک زۆرینە بێت بێویژدانانە غەدر لە کەمینەکانی تر دەکات!'

تاوێک هەمووومان بێدەنگ بووین، من لەو کاتەدا بیرم لە قسەکانی عەبدولکەریم ئەلیاس دەکردەوە، بیرم لەو ڕووداوانە دەکردەوە، کە لە مووسڵ ڕوویان دابوو، پاشان لەبەرخۆمەوە وتم، 'لە سەردەمانی جەنگ و گرانییە گەورەکەدا، کاتێک ئاشووری و مەسیحییە ئاوارەکان هاتنە ناوچەی مووسڵ، مەبەستم لە ئەرمەنییە ئاوارەکانە، بە هاوکاری لەگەڵ مەسیحییەکانی ئەو ناوچەیەدا پەلاماری ماڵ و موڵکی جوولەکەکانیان دا و زەویوزاریان لێ زەوت کردن، بۆ نموونە گوندەکانی عەردین و عەین شاخ و عەقلیش و تەواوی ئەو ناوچەیە، کە زیاتر لە هەزار ساڵە جوولەکەنشین بوون، ئێستا ئەرمەنی و ئاشوورییەکانی لێ نیشتەجێ بوون، ئەوەتا مسقێل خۆی ماوە و لەدەست زوڵم و زۆرداریی مەسیحییەکان ڕای کردوە و ئێستا لە سلێمانی دەژی، بڕۆن خۆتان قسەی لەگەڵدا بکەن بزانن چۆن باسی بێڕەحمیی ئەوان دەکات، ئیتر لەم ناوچەیەدا هەر سەردەمە و یەکێک دەبێتە کەڵەگا بەسەر ئەوانی ترەوە!'

'مەگەر خوا بۆ خۆی بتوانێت ئیسڵاحمان بکات!'

دوای ئەوەی حاجی تۆفیق لەبەرخۆیەوە ئەمەی وت، نامەیەکی لە گیرفانی پاڵتۆکەی دەر هێنا، لە کاتی کردنەوەی نامە قەدکراوەکەدا، وتی، 'ئەم نامەیەم لە تۆفیق وەهبییەوە بۆ هاتووە، کە حاڵی حازر لە فەلەستینە و دەڵێت ئێستا لە ئێستگەیەکی ڕادیۆ لە حەیفا پێکەوە

لەگەڵ عەبدوللا گۆران و ڕەفیق چالاک کار دەکەین، تۆفیق وەهبی باس لەوە دەکات، گوایا موفتیی قودس بە شەخسی خۆی سەردانی کردوون و سوپاسی کردوون.'

حاجی تۆفیق دوای ئەوەی سەیرێکی منی کرد، بەردەوام بوو وتی، 'هەروەها لە نامەکەیدا هاتووە، کە جووەکان ڕێژەیان تاکو دێت لە زیادبووندایە و بێڕەحمانە قەتڵوعامی برا فەلەستینییەکانمان دەکەن، بە جۆرێک ئینگلیز توانای کۆنترۆڵکردنی نەماوە، پێ دەچێت ئەوەش بە دەسیسەی ئینگلیز خۆی بێت.'

کاتێک حاجی تۆفیق ئەمەی وت، هەستم بە خۆم کرد، هەموو ئازای گیانم کەوتە سەر ئارەقە، خۆم پێ ڕا نەگیرا و بەبێزارییەکەوە قسەکانم بە حاجی تۆفیق بڕی و پێم وت، 'جا ئەو کوردە دڵسۆزانە لە فەلەستین چی دەکەن، حاڵ و گوزەرانی میللەتەکەی خۆیان زۆر خۆشە، ئایا لەم کاتەدا خەڵکە داماوەکەی خۆیان پێویستی بەوان نییە؟'

'ئیتر براگەلینە، تاکو تورک و ئەستەمبوڵ بوو، هەموومان پیاو و کۆیلەی تورکەکان بووین و ئەستەمبوڵمان بە قودسی خۆمان دەزانی، مەلا و شێخ و واعیزمان لە خزمەتی تورکەکاندا بوون، ئەوەتا ئێستا سیاسەتمەدار و خوێنەوارەکانمانماڵیان لەگەڵ عەرەبە شۆڤێنستەکاندا تێکەڵ کردووە و دوای بەرژەوەندی و داواکانی ئەوان کەوتوون، مێژوومان ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت، کە ئەم کۆیلایەتییە لە ڕوانگەی دین و مەسڵەحەتی شەخسیمانەوە سەرچاوەی گرتووە.'

حەمەئەمین زەکی دوای ئەوەی ئەمەی وت، دەستەکانی پان کردنەوە و لە قەشە عەمانوئێل حەدادی ڕوانی و لێی پرسی، 'بەڕێزت بەگوێرەی ئەوەی لە سوریا و ئێران و تورکیاش ژیاویت، ئەرێ

گوزەرانی کورد و کەمایەتییەکانی تر لەوێ چۆنە؟'

'لێرە باشتر نییە، ئەو خەڵکە دینیان کردۆتە حوجەیەک، بۆ پەلاماردان و کوشتنی یەکتری، هەرچ کەسێک هەڵدەستێت بە ناوی خوا و دینەوە خوێنی ئەوی تر حەلاڵ دەکات، بە جۆرێک ئەو خەڵکە تەفسیر بۆ کتێبە پیرۆزەکان دەکەن، وەکو ئەوەی ئەو کتێبانە تەنها بۆ هەوەسبازی و شەڕ و کوشتار نووسرابن، خوای گەورە نەرمی و ڕەحم بخاتە دڵی هەمووانەوە، تاکو لەسەر زەمینی خوا ئەمن و ئەمان بەرقەرار بێت.'

لەم کاتەدا کابرایەکی بەتەمەنی ڕیشسپی سینییەک چای هێنا، دوای ئەوەی هەریەکە و پیاڵەیەک چای لە بەردەمماندا دانا، پیاڵە بەتاڵەکانی کۆ کردەوە، تاوێک هەموو بێدەنگ بووین، دیار بوو هەریەکە و لە خەیاڵی خۆیدا بە جۆرێک قسە و بەسەرهاتەکانی لێک دەدایەوە، ئەوەی من لەو کاتەدا بیرم لێ دەکردەوە، نامەکەی تۆفیق وەهبی بوو، کە بۆ حاجی تۆفیقی نووسیبوو، چونکە ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە لە بەغداد پێکەوە لەسەر کەناری ڕووباری دیجلە عارەقمان خواردەوە، ئەو پیاوەی تەمەنێک دوژمنی سەرسەختی ئینگلیز بوو، ئەو ڕۆژە لە بەغداد دەرکم بەوە کرد، کە تۆفیق وەهبی بەتەواوی ڕاوبۆچوونی گۆڕابوو، بەتایبەتی بەرانبەر بە سیاسەتی ئینگلیز لە ناوچەکەدا و تا ڕادەیەک پەشیمان بوو لە ڕابردووی خۆی و پێی وا بوو، کە گەلی کورد لە سەردەمی ڕووخانی عوسمانییەکاندا سیاسەتێکی چەوتی پەیڕەو کرد، ئەوەتا ئێستا باجەکەی دەدەین و پێ دەچێت دەیـان نـەوە دوای ئێمەش پێوەی بناڵێنن، تۆفیق وەهبی بێکاری و بێ پلەوپایە تەواو بێزاری کردبوو، چوونیشی بۆ فەلەستین، دیارە لە بێکاری و بێزاریدا بووبێت، هەرچەندە ئەو ئێستاش خـەون بە دەسـەڵات و سوپای گـەورەی عوسمانییەوە

دەبینێت و وەکو جاران خۆی بە سەربازی عوسمانی دەزانێت و ئەوسا کەمێک سۆزیشی بۆ هیتلەر هەبوو.

تاوێک بوو هەموو بێدەنگ بووین، دیار بوو ڕا و بۆچوونەکانمان وەکو جاران لە یەکتر نێزیک نەبوون، قەشە عەمانوئیل حداد وتی، 'خوا تۆوی ئارامی و پێکەوەژیانمان لەنێواندا بچێنێت.'

هەموو پێکەوە وتمان، 'ئامین.'

کاتێک لە کەنیسەی مریەم هاتینە دەر، حاجی تۆفیق ڕووی لە من و عەبدولکەریم ئەلیاس کرد.و پێی وتین، 'ئەوە خۆ من بۆ ژین بەتەمای پیتاکی ئێوە بووم، ئەرێ براگەلینە ئێوە کەی ئەوەندە چرووک بوون، ئادەی چیتان بۆ کردم؟'

## ١٩

مانگی تەمموز و ئابی ساڵی ١٩٤١ بە ڕێژەیەکی بەرچاو زۆربەی جووەکان لە خۆپیشاندان و کۆڕ و کۆبوونەوەکانی ئەو ساڵەدا بەشدارییان کرد، بەتایبەتی ئەو خۆپیشاندانانەی لەلایەن ناشیۆنالیستە کورد و عەرەبە شۆڤێنستەکانەوە ڕێک خرابوون، لە ترسی ئەوەی بە نۆکەری ئمپریالیزم و ئیسرائیل تاوانبار نەکرێین بەشدار بووین، لەبیرم دێت لە خۆپیشاندانەکاندا هاواریان لە دژی ئینگلیز و مەلیکیەت دەکرد و ڕاستەوخۆ سۆزی خۆیان بۆ هیتلەر دەر دەبڕی.

ئەو دوو مانگە بۆ جووەکانی تـەواوی عێراق زۆر بە گران تێپەڕی، ئەوەی ڕەخنەی بگرتایە و دوورەپەرێز بووایە تووشی هەڕەشە و گرتن دەبوویەوە، بە جۆرێک، کەسێک نەبوو لە شاری سلێمانیدا بتوانیت دەردەدڵی خۆتی لەلا بکەیت، یان بوێریت ڕەخنە لە کردەوەکانی سـەرکردەی ڕاپەڕینەکان ڕەشید عالی گەیلانی بگریت، ئەوەندە ناوی لەسەر زاری خەڵکی شاردا پیرۆز کرابوو، وەکو بڵێیت ئەو پیاوە ناموبارەکە ئەسحابەیە و خوا ناردویەتی بۆ ئیسلاحی ئێمە و ئەو لەدەست دەسەڵاتی ئینگلیز ڕزگارمان دەکات.

'کابرایەکی بـاڵابـەرزی بۆرکەلە و قسەزان و دەمبەپێکەنین دیـار بـوو، کاتێک من گەیشتمە چایخانەکەی خاسە، ئەو قسەی بۆ کۆمەڵێک گەنج دەکرد، خۆ من پێشتر نە دیبووم و نە ناویم بیستبوو، بەڵام سەلامی کوێخا ئاوای وتبوو، کە ئەو پیاوە مەندوبی

ڕەشید عالی گەیلانییە، فەرماندەی گەنجانی پارتی نازییە و ناوی یونس سەبعاوییە.'

حەمەجان سەلیم کاتێک ئەمەی پێ وتم، پێکەوە لە دوکانەکەی مندا دانیشتبووین، لە وەڵامدا بە حەمەجانم وت، 'بێئاگا بووم لەوەی ئەو زاتە نا موشەڕەفە سەردانی کەرکووکی کردووە، بەڵام حەمەجان گیان، خۆ بەنهێنی بۆ سلێمانییش هاتبوو، هەروەها چاوی بە ناشیۆنالیستەکانی لای خۆیشمان کەوتبوو.'

'ئەرێ خایم بەراستە؟'

'دەی بێقەزا بێت، درۆت عەرز ناکەم!'

'یانی ئەو قسە قۆڕانەی من بە گوێی خۆم لە کەرکووک گوێم لێیان بوو، لێرەش ئەو ناماقووڵییەی بە خەڵکی ئەم شارە وتووە.'

'بەڵێ، بەڵێ، داودی چایچی خۆی لەوێ بووبوو، کوڕە دەیوت، وەکو سەرکردەیەکی نەتەوەییی گەلی کورد پێشوازییان لێ کردووە.'

'دەی یاخوا برا، سەد سەرکردەی وامان لێ بەمیرات کەوێت، باشە!'

'ئیتر چی بکەین و دەسەڵاتمان چییە، ئەگەر ئاوا بڕوات ئێمە دەبینە بزنە گەڕەکە!

'خوا گەورەیە.'

'ئەم بەیانییە بانگیان کردم بۆ سەرا!'

'بۆچی؟'

'ئیتر لەوەتەی مامە سلێمانم نەخۆشە من بوومەتە دەمڕاستی جووەکانی ئەم شارە، جا، حەمەجان گیان دەبێت بۆچی بێت؟ بە غەیری ئەوەی بەهانەمان پێ دەگێڕن و دەیانەوێت ڕووتمان بکەنەوە.'

ئەو ڕۆژە و پێش ئەوەی حەمەجان بێت بۆ لام و باسی

کەرکووکم بۆ بگێڕێتەوە، لەو ڕۆژانەدا موتەسەڕیف و دوو پۆلیس بۆ سەرا بانگیان کردم و داوای ١٠٠ لیرەی زێڕ سەرانەیان لە جووەکانی شاری سلێمانی لێ کردم، پێیان وتم، وەکو پشتگیرییەک بۆ شۆڕشەکەی ڕەشید عالی گەیلانی، عوسمانی عەزە سەرخواری ئەفسەری پۆلیس پێی وتم، 'فەرمانەکە لە جەنابی ڕەشید عالییەوە دەر چووە و دەبێت لە ماوەی حەوت ڕۆژدا ١٠٠ لیرەی ڕەشادیی بدەن.'

ئێوارەی ئەو ڕۆژە کاتێک گەڕامەوە بۆ گەڕەکی جوولەکان، پێش ئەوەی بچمەوە بۆ ماڵەوە، یان بچم سەردانی مامە سلێمانم بکەم، چووم بۆ کنێسەت و چاوم بە زۆربەی پیاوەکانی گەڕەکی جوولەکان کەوت، بەبێ وەستان و دوودڵی هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاندن، لەیفی حاخام دوای ئەوەی گوێی لێ گرتم، بە ئامادەبووانی وت، 'ئەوە تەنها بەهانەیە و ئەگەر ئەوانە دەسەڵات بگرنە دەست، ئێمەی جوو گوزەرانمان باش نابێت و ژیان دەر نابەین.'

ڕۆژی دوای ئەو ڕۆژەیش دیسان پیاوانی گەڕەک لە کنێسەت کۆ بوونەوە، تەنها باس باسی کۆکردنەوەی ئەو بڕە پارەیە بوو، مامە سلێمانم پێی وتم، 'بچۆ بۆ کنێسەت و بە پیاوەکان بڵێ با ئاڵتوونی ژنەکانیان بفرۆشن، بەڵکو لەو بەڵایە ڕزگاریان ببێت.'

پاشان ماڵەوماڵ گەڕام و داواکارییەکەی مامە سلێمانم پێ ڕاگەیاندن، هەندێکیان وتیان، ئێمە خۆمان بۆ ڕۆیشتن ئامادە کردووە و ئەو پارەیە بدەین بە ڕێبەرێک باشترە، تاکو بمان گەیەنێتە فەلەستین.

چەند کەسێکیش پێیان وتم، 'خۆ ئەگەر سوور بزانین دەخرێینە زیندان ئەو بڕە پارەیەمان نییە.'

حەفتەیەکی بەسەردا تێپەڕی، تاکو دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژەی بۆمان دەستنیشان کرابوو تەنها دوو کەس ئامادەیی خۆیان دەر بڕی، ئەوانیش وتیان دوو تا سێ ڕۆژ کاتمان پێویستە بۆ کڕینی لیرەکان.

دوای حەفتەیەک ناچار بووم دووبارە چوومەوە بۆ سەرا و داوام لە عوسمانی عەزە سەرخواری ئەفسەر کرد، تاکو چەند ڕۆژێک مۆڵەتم پێ بدات، ئەوەندەی لەبیرم مابێت، ئەو ڕۆژە بە عوسمانی ئەفسەرم وت، 'زۆربەی جووەکان لە ماڵ نین و سەفەریان کردووە، کاتێک گەڕانەوە ئەو برە لیرە زێڕە ئامادە دەکەین.'

عوسمانی ئەفسەر لە وەڵامدا پێی وتم، 'چەنتان حازرە لە سبەینێ زووتر نییە بۆم بێنە، ئەگینا پۆلیس دەنێرم و شرۆشیتاڵتان بخەنە شیوەکە و گەورە و بچووکتان ڕاپێچی زیندان دەکەم.'

لەو کاتەدا لێم هاتبووە پێشەوە و بەتووڕەییەوە لێی دەڕوانیم، بەردەوام بوو لەبەرخۆیەوە بەتووڕەییەوە وتی، 'هەمووتان چرووک و پارە پەرستن، مەگەر نەزانم ئێوەی جوولەکە پاشەڵتان چەند پیسە.'

ئەژنۆکانم ئەلەرزین و هەردوو دەستم لە پشتمدا لە یەکترین هەڵپێکابوو، نینۆکەکانم توند لە پێستی پشتی دەستم چەقاندبوو، بێدەنگ سەرم بۆ ڕاوەشاند و پاشان ناچار بووم، لەبەرخۆمەوە وتم، 'بەڵێ فەرمانتە قوربان!'

ئێوارەی ئەو ڕۆژە لە دوکانەکەی خۆم ئەو باسوخواسانەم بۆ حەمەجان سەلیم و خامێی موشێی عەتار گێڕایەوە، حەمەجان سەلیم لەبەرخۆیەوە وتی، 'عوسمانی عەزە سەرخواری قۆمیسەر!'

پاشان لێم هاتە پێشەوە و لەژێر لێوەوە و بە چپە پێی وتم، 'واز لەو خۆفرۆشە بێنە و من ئەمشەو حەق و حیسابی لەگەڵدا دەکەم.'

ئەوسا لە مەبەستی حەمەجان سەلیم تێنەگەیشتم، دەستم خستە سەر شانی و پێم وت، 'ئەرێ حەمەجان گیان، تۆ حاڵی قوونت زۆر خۆشە!'

'حەمەجان دەیەوێت ئەو بەڵایەت لە کۆڵ بکاتەوە.'

'تێناگەم!'

'ئەرێ بۆ تێناگەیت برا، ئەمشەو ئەو ناپیاوە دەکەین بە قوربانی گوللەیەک، ئەوە ئێمە چەند ڕۆژێکە سەرقاڵی ئەوەین و پالانمان بۆ دارشتووە.'

لەو کاتەدا لە حەمەجان سەلیم چوومە پێشەوە و بەبێزارییەکەوە لێم ڕوانی، 'من وام زانی جەنابتان لەوە ئاگادار نیین، حەمەجان گیان نابێت شتی ئاوا ڕوو بدات، من نامەوێت تۆ ژیانی خۆت بۆ ئێمە بخەیتە مەترسییەوە، جا ئەگەر کێشەیەکی ئاوا بە پارە چارەسەر بکرێت ئیتر چ پێویستە تۆ ئەو سەرکێشییە بە ژیانی خۆت بکەیت!'

'کوڕە برا ئەوەیش هەر بە پارە دەکرێت و هەر دەبێت خۆت حەقەکەی بدەیت، ئیتر خۆ لەم شارەدا ئەوەندە بێکاری تێدایە.'

حەمەجان سەلیم ئەمەی وت و پاشان پێکەنی و دەستی خستە سەر شانم، لەو کاتەدا خامێی موشێی عەتار لەبەرخۆیەوە وتی، 'یانی ڕۆنی خۆت دەدەینەوە لە سمێڵی خۆت.'

'جا کێ دەڵێت من ڕازیم ئێوە ببن بە دەمڕاست لە کاروباری مندا.'

'بەخوا برا، ڕازی بیت یان نا، ئەوە ئێستا یان تاوێکی تر عوسمانی عەزە سەرخواری حەیتە خۆمان خۆش.'

کاتێک حەمەجان سەلیم ئەمەی وت، خەریکی کۆکردنەوە و گرتنی دەرگای دوکانەکە بووین، پێکەوە گەیشتینە بەردەم قەیسەریی وەسمان پاشا، ماڵئاواییمان لە حەمەجان سەلیم کرد و لەگەڵ خامێی

موشێی عەتاردا بە بەردەم گوزەری ئاسنگەرەکاندا چووینە خوار، تاکو ئەو کاتە درەنگانەیش ئاسنگەرەکان خەریکی کوتانی ئاسنە سوورەوەبووەکانیان بوون، زەنگۆڵە و دەنگی بەریەککەوتنی ئاسنەکان، کاریگەریان کردبوو، کە من و خامێی موشێی عەتار تاکو لەو گوزەرە دەر چووین یەکتریمان نەدواند و گوێمان لە هەوادا بۆ هەڵخستبوون، گەیشتبووینە سەر ڕاستە جادەی سەرشەقام، خامێی موشێی عەتار لەبەرخۆیەوە پێی وتم، 'دوایی لەماڵی ئێمە میوانیت، چونکە چەند کەسێکی تایبەت لە پایتەختەوە هاتوون!'

ئەو ئێوارەیە وەکو پیشەی هەموو ڕۆژێکم، لە ڕێگاوە چووم بۆ لای مامە سلێمانم، لەناو دالانەکەدا حەکیمی کوڕم پێی وتم، 'باوکە سبەینێ لەگەڵت دێم بۆ سەر دوکان!'

کاتێک بە بالایدا هەڵم ڕوانی، بینیم کوڕەکەم بووبوو بە هەرزەکار، بەڵام تاکو ئەو ڕۆژە من هیچ پەیوەندییەکی باوکانەم لەگەڵیدا نەبوو، ئەوەی ڕاستی بێت لەدوای مردنی کانیشای دایکیەوە، نەک هەر نەم دەویست قسەی لەگەڵدا بکەم، بەڵکو حەزم نەدەکرد بیشیبینم، هەرچەندە کەتانی خوشکم زوو زوو پێی دەوتم، 'لە تۆ زیاتر دڵی بە کەس ناکرێتەوە.'

تاکو ئەو ڕۆژە کەتان و یاقووبی ئامۆزام منداڵیان نەدەبوو، منیش لە دوای مردنی کانیشای خێزانمەوە بڕیارم دابوو، کە حەکیمی کوڕم لە ماڵیان و لەلای ئەوان بێت.

لەو کاتەدا دەستم خستە سەر شانی حەکیم و پێم وت، 'ئێ باشە، سبەینێ لەگەڵ یاقووب وەرە بۆ دوکان.'

مامە سلێمانم هەر لە ڕێگاوە پرسیاری ئەوەی لێ کردم، 'ئەو سەد لیرەیەتان بۆ نازییەکان دەبر کرد؟'

'نەخێر، کەس بەدەنگمەوە نایەت، منیش مەجبوورم...'

'چۆن بەدەنگتەوە نایەن، دەی تۆ بە نیازی چیت؟'

'چووم، چووم بۆ سەرا و بەو نا عینسانەم وت چەند ڕۆژێکی ترمان مۆڵەت پێ بدات!'

مامە سلێمانم زۆر بێزار دیار بوو، لەبەرخۆیەوە وتی، 'گوزەرانی ئەو خەڵکە باش نییە، ئەوەتانێ چەند خێزانێک لەدەست زوڵم و زۆر بەسەڵتی لە بەغدادەوە هەڵهاتوون.'

لە مامە سلێمانم نەپرسی ئایا ئەوانەی لە بەغدادەوە ئاوارەی شاری سلێمانی بوون کێن؟ کەتان سفرەی ڕاخست و خەریکی نانخواردن بووین، لەبەرخۆمەوە بە یاقووبی ئامۆزام وت، 'یاقووب پێت باشە، ئەگەر لەمەڕۆ بەدواوە نەچیت بۆ دەرەوەی شار و واز لە کاری دەستگێڕی بێنیت و لەسەر دوکانەکەم دانیشیت؟ ئیشوکارەکانم زۆرن و پێیان ڕاناگەم.'

یاقووب لێی ڕوانیم و سەری بۆلەقاندم، کەتان ئەو ئێوارەیە کفتەی دروست کردبوو، وەکو پیشەی دایمی هاتبوو لە شانمەوە دانیشتبوو، ڕانی بە ڕانمەوە نووساندبوو، زوو زوو لەبەرخۆیەوە لێی دەپرسیم، 'کاکە گیان، کاکە گیان.'

کاتێک بە بەڵێ وەڵامم دەدایەوە، ئەو بە ڕوویەکی گەشەوە لێی دەڕوانیم، 'خواردنەکەت بەدڵە.'

لە کەتانم ڕوانی و پێم وت، 'ئازیزەکەم لە توانای ماڵداریی خۆت دوودڵ مەبە، تۆ هەرچییەک دروست بکەیت، من بە پڵاوی ماڵی شێخانی ناگۆڕمەوە.'

لە کاتی نانخواردندا مامە سلێمانم باسی گوزەرانی جووەکانی دانیشتووی شاری بەغدادی بۆ کردم، منیش لێم ڕوانی و لەبەرخۆمەوە وتم، 'ئیتر چی بکەین جەنگە و هەموومان لەژێر هەڕەشەداین!'

دوای نانخواردن ویستم بۆ ماڵی موشێی عەتار بڕۆم، لەناو دەرگاکەدا هەڵوێستەیەکم کرد و لە یاقووبی ئامۆزام ڕوانی، پاشان دەستم کرد بە گیرفانی بن باخەڵی چۆغەکەمدا و کلیلی دوکانەکەم دەر هێنا و بەرەو ڕووی یاقووب فڕێم دا و پێم وت، 'ئیتر خۆت خاوەن دوکانیت و لە سبەینێوە حەکیمیش لەگەڵ خۆت بەرە!'

لە بەردەرگای ماڵی موشێی عەتار ڕێکەوتی خامێ و سیمانەی سەعادەت و میوانەکانم کرد، چوار گەنجی هاوتەمەتی خۆم بوون، خامێی موشێی عەتار لەبەرخۆیەوە وتی، 'میوانەکانم برد، وتم با کنێسەکەمان ببینن!'

لەگەڵ دووان لە میوانەکان یەکترینمان ناسییەوە، خێرا یەکێک لەوان پێی وتم، کە لە بازاڕی میسوال منی بینیوە و ئەوان هاوڕێی نزیکی ڕەحمان و ڕەحیمی جوانەمەگ بوون، یەکێک لە میوانەکان کوڕێکی moوزەردی باڵابەرزی لاواز بوو، دەستی خستە سەر شانم و پێی وتم، 'پێکەوە عارەقی مراویمان خواردۆتەوە.'

پاشان دەستی بۆ ڕاگرتم، کاتێک دەستم خستبووە ناو دەستی ئەو، وتی، 'من حەسۆ میکائیلم.'

ئەو گەنجەی لە شانی حەسۆ میکائیلەوە وەستابوو، کە بە قسەی ئەو یەکترینمان لە بەغداد دیبوو، وتی، 'ساموێل کۆهین.'

دووانەکەی تر بە ناوەکانی، عەزرا و عەزەم یۆنا خۆیان پێ ناساندم، خامێی موشێی عەتار لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەم دووانە برای یەکترین.'

دوای ئەوەی یەک یەک ناوی خۆیان وت، منیش چاوم پێدا گێڕان و وتم، 'من خایم شەلەمۆم.'

بەڕێوە بووین بۆ ژوورەوە، لەبەرخۆمەوە پرسیم، 'ئەرێ دەنگوباسی بەغداد چۆنە.'

'بۆ موسوڵمانی سوننە زۆر ئارام و ئەمانە!'

حەسۆ میکائیل کاتێک ئەمەی لەبەرخۆیەوە وت لە پێش منەوە دەڕۆیشت و پێکەوە گەیشتبووینە ژووری دانیشتنەکە، دوای ئەوەی دانیشتین حەسۆ لە بنباخەڵیدا چەند کاغەزێکی پێچراوەی دەر هێنا و لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئیتر بەگوێرەی پلانی عەرەبە شۆڤێنیستەکان بێت، لەمەولا کەس لە عێراقدا ژیانی پارێزراو نابێت.'

حەسۆ میکائیل لەو کاتەدا خەریکی کردنەوەی یەکێک لە کاغەزە پێچراوەکان بوو، پاشان بەردەوام بوو وتی، 'ئەم نامانە شایەتیی ئەوە دەدەن، کە هاوشێوەی پارتی نازی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دروست بووە، ئەوەتا بزانە ڕەشید عالی گەیلانی لە کۆبوونەوەی پارتەکەیاندا چی دەڵێت، "جووەکان کۆسپن لەبەردەم بیری ناشیۆنالیستیی عەرەبیدا، بۆ ئەوەی نەتەوەیەکی عەرەبیی یەکگرتوو دروست بکرێت، پێویستە جووەکان دوور بخرێنەوە یان لەناو ببرێن!" هەڵبەتە ناماقووڵییەکانی زۆر لەوە زیاترن، بێجگە لەوەی لەم بەیانانەدا نووسراوە، یوسف ئاموون، کە خۆی لە کۆبوونەوەکاندا ئامادە بووبوو، باسی لەوە دەکرد، کە میشێل عەفلەق ناوێک لە سووریاوە میوانی کۆبوونەوەکان بووە، پاشان میشێل عەفلەق لە لێدوانێکیدا وتوویەتی، گوایا بۆ دروستبوونی یەکێتیی نیشتیمانیی عەرەبی کوردەکان لە سووریا و عێراق کۆسپێکی گەورەن. هەروەها یوسف ئاموون باسی لەوە دەکرد، کە ئەو میشێل عەفلەقە لە سوریا سەرکردەی حزب الاخاء العربی الوطنییە و لەو کۆبوونەیەدا بڕیاری ئەوە دراوە حرکة نصرة العراق دروست بکرێت، کە لە پەیڕەو و پرۆگرامدا هاوشێوەی پارتەکەی میشێل عەفلەقی سووری دەبێت.'

'ئەرێ پێم ناڵێیت یوسف ئاموون کێیە و چۆن توانیویەتی بچێتە ناو کۆبوونەوەی ئەو شۆڤێنیستانەوە؟'

دوای ئەوەی من ئەو پرسیارەم لە حەسۆ میکائیل کرد، سیمانە سەعادەت لە وەڵامدا وتی، 'گرنگ ئەوەیە ئێمە بزانین دوژمنەکانمان خەریکی چ پلانگێڕییەکن!'

دەستم خستە سەر شانی سیمانە سەعادەت و لێم پرسی، 'جا ئەو کەسە باوەڕپێکراوە؟'

'بەڵێ بەڵێ، ئێمە لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەیەک لەم عێراقەدا گوێگرێکمان هەیە!'

لە سیمانە سەعادەتم ڕوانی و پێم وت، 'جا ئەوە چ پێویست دەکات؟'

خامێ موشیی عەتار وتی، 'ئای بێقەزا بیت، چۆن، بۆ دامەزراندنی پارتێک یان ڕێکخراوێک، ئیتر هەڕەشە و پلانگێڕییەکان دژی ئێمە ئەوەمان پێ دەڵێن، کە کاتی ئەوە هاتووە ئێمەی جوو پارێزگاریی مانەوەمان لە عێراقدا بکەین.'

'ئەوەندەی من لە ئێوە تێگەیشتبم، دیارە ئێوە دەتانەوێت پارتێک دامەزرێنن، ئایا پێم نالێن لەم بارودۆخەدا چۆن پارت بە ئێمە دروست دەبێت؟'

حەسۆ میکائیل لێی ڕوانیم و لە وەڵامدا وتی، 'ئەوە ئێمە بۆ ئەم مەبەستە چەند ساڵێکە سەرقاڵین، هەڵبەتە باو و باپیرانمان پێشتر پارتێکی لەو جۆرەیان هەبووە، بۆ پارێزگاریکردن لە سەروماڵی خۆیان، ئێستا ئێمە تەنها ئەوەمان لەسەر شانە ئەو پارتە و بیری ئەوان سەرلەنوێ زیندوو بکەینەوە، جا من پێم وایە ئێستا لە هەموو کاتێک گونجاوترە، ئێمە ئەوەیش دەزانین، کە هاوڕەگەزە زایۆنیستەکان دژمان دەوەستنەوە، چونکە ئێمە دەمانەوێت لەسەر زێدی باو و باپیرانمان وەک جوو بمێنینەوە و بەرگری لە خۆمان بکەین، بەڵام بیری زایۆنیستی دژی ئەوەن و مەبەستیانە هانی

هەموو جووەکان بدەن تاوەکو بەرەو ئیسرائیل کۆچ بکەن، لە ئێستادا لێرە زایۆنیستەکان لە ئێمە دەسەڵاتیان بەهێزترە، چونکە ئەوان ئەندامیان زیاترە، بەڵام ئاشکرایە ئەوانەشی دەیانەوێت لە عێراق بمێننەوە ژمارەیان کەم نییە.'

سیمانە سەعادەت دەستی خستە سەر شانم و لەبەرخۆیەوە وتی، 'کەواتە بۆ زیندووکردنەوەی پارتی خەڵتووز.'

بەسەرسامییەوە لێم ڕوانین، 'خەڵتووز؟'

'بەڵێ خەڵتووز، لە بەغداد چاومان بە هەندێک لە ئەندامە کۆنەکان کەوت، هەرچەندە ئەوان پیر بوون و توانای هەڵسوڕاندنی کاروباریان نەماوە، بەڵام بۆ ڕاوێژکردن پێیان پێویستیمان پێیان دەبێت.'

'گرنگ بەرنامەی پارتی خەڵتووزە، کە ئێمە بتوانین کاری پێ بکەین.'

من لەو کاتەدا سەرم داخستبوو لە ڕەنگی گوڵی سەر فەرشەکەم دەڕوانی، نەمزانی کام لە دوو براکە عەزەم یان عەزرا یۆنا ئەمەی وت. حەسۆ میکائیل خۆی ڕاست کردەوە و چاوی پێدا گێڕاین و وتی، 'برایان، ئەوەی گرنگە لێرەدا باسی بکەین، کە ئێمە لە بەغدادەوە بەتایبەتی بۆ ئەو مەبەستە بۆ سلێمانی هاتووین، ئەویش ئەو خاڵەیە لە پەیڕەوی پارتی خەڵتووزدا، کە گوایا پارتێکە تەنها سەر بە جووەکانی تەواوی عێراقە و بۆ پارێزگاری لە سەروماڵی جووەکان دامەزراوە، بەڵام ئێمە لێرەدا دەمانەوێت، گۆڕانکاری لەو خاڵەدا بکەین، تاکو ڕێگا بە کوردە مەسیحی و موسوڵمانەکان بدرێت لە خەڵتووزدا ببنە ئەندام و لەو ڕێگایەوە بتوانین پێکەوە خۆمان لە پلانی عەرەبە شۆڤێنیستەکان بپارێزین.'

'جا حەسۆ ئەوەی تۆ باسی لێوە دەکەیت، ئێمە هەموومان باش

ئەوە دەزانین، بۆ ئەو مەبەستە و ئەنجامدانی ئەو کارە پێویستیمان بە خایمە.'

'ئەرێ خامێ، برام، لە بواری سیاسەتدا من زۆر کۆڵم عازیزم!'

'تۆ پەیوەندییەکانت بۆ پارتی خەڵتووز گرنگن، ئێمە دەمانەوێت لە ڕێگای کەسێکی وەکو تووە، ئەندام و هاوڕێی کورد و مەسیحی و کلدانی و ئیتر ئەندامەمان لەناو هەموو کەمەنەتەوایەتییەکانی دانیشتووی کوردستاندا هەبێت، دەمانەوێت ئاگاداریان بکەینەوە و بەڵگەیان بخەینە بەردەست، کە هەموومان لەژێر هەڕەشەی لەناوبردنداین، هەروەها ئەوەیان بۆ ڕوون بکەینەوە، کە هیچ کەسێک لە ئێمە ناتوانین بەتەنیا بەرەنگاری ئەو شەڕەنگێزییەی ئەوان ببینەوە، کە لەلایەن عەرەبە شۆڤێنیستەکانەوە پلانی بۆ داڕێژراوە.'

حەسۆ میکائیل دوای ئەوەی ئەمەی وت، تاوێک بوو بێدەنگ لێی دەڕوانیم، وەکو چاوەڕوانی وەڵامم لێ بکات، لەبەرخۆمەوە پێم وت، 'تێناگەم، ئایا من چیم پێ دەکرێت؟'

خامێی موشێی عەتار هەستایە سەر پێ و پێش ئەوەی بڕوات و لە ژوورەکە بچێتە دەرەوە، لێی ڕوانیم و پێی وتم، 'تۆ چەند هاوڕێیەکی کورد و مەسیحیی نێزیکت هەن، ئەگەر بتوانیت بانگیان بکەیت تاکو پێکەوە گفتوگۆ بکەین!'

لە دواوە بانگم لێ کرد، 'خامێ، خامێ، دەڵێم، هاوڕێی کورد و مەسیحی، ئەرێ مەبەستت لە کێیە؟'

دوو ڕۆژ بەسەر هاتنی میوانەکاندا تێپەڕیبوو، حەمەجان سەلیم بانگ کردە دوکانەکەم و ویستم لە نوێبوونەوەی پارتی خەڵتووز ئاگاداری بکەمەوە، بەڵکو بێت بۆ گەڕەکی جوولەکان و لەگەڵ

هاورێکانمدا گفتوگۆ بکات، پێش ئەوەی من ئەو باسەی لەگەڵدا بکەمەوە، ئەو پێی وتم، 'ئەوە حۆقەیەک چایی و نیو حۆقە قەند قەرزاریت!'

'بۆ بێفەڕ خۆ من باوکت نیم، تاکو دەمریت دەبێت دەستم بە قوونتەوە بێت؟'

'کوڕە بۆ خۆم نییە، بۆ حەقدەستی تۆپاندنی عوسمانی عەزە سەرخواری حەیتەیە!'

'ئەری بەڕاستە حەمەجان، ئەو حەیتە باشییە کوژراوە؟'

'دەی بۆ لە خۆت ناپرسیت بۆچی تاوەکو ئەمرۆ ئەو سەگبابە پۆلیسی نەناردووە بەشوێنتا؟'

'دەترسم جەنابت قوڕەکەمان زیاتر بۆ خەست بکەیتەوە و تێی چەقین و بە هیچ کلۆجێک لێی دەر نەچین!'

'بەخوا تۆ جەبانیت، پێم ناڵێیت سەد لیرەی زێڕ بە کێ پەیدا دەبێت؟'

'لەوەیاندا تۆ ڕاست دەکەیت، بەتایبەتی لە ڕۆژێکی وەکو ئەمرۆدا، کە زۆربەی جووەکان بەتەمای ڕۆیشتنن!'

'ڕۆیشتن، بۆ کوێ؟'

'بۆ فەلەستین، قابیلە ئەو قوڕبەسەرانە بۆ کوێی تر دەتوانن بڕۆن؟'

'بەڕاستە، دەی تۆ؟ ئەرێ خایم، خۆ خوانەخواسە تۆش بەنیاز نیت بڕۆیت؟'

'نەخێر، بۆ ڕێگری لەو کۆچە بەکۆمەڵە هەوڵێک لە ئارادایە، ئەگەر دەتەوێت هاوکارمان بیت ئەوا ئێوارە بۆ ماڵی خامێی موشێی عەتار لەگەڵم وەرە.'

ئەو ئێوارەیە پێش ئەوەی حەمەجان سەلیم بێت بۆ ماڵی ئێمە

و لەوێوە پێکەوە بۆ ماڵی موشێی عەتار بچین، چووم بۆ لای مامە سلێمانم و بەسەرهاتەکانم وەکو خۆی بۆ گێڕایەوە.

دوای ئەوەی تاوێک بێدەنگ لێی ڕوانیم، پاشان لەبەرخۆیەوە پێی وتم، 'دوو هەواڵی سەیر و سەمەرەت بۆ هێناوم!'

'ئیتر ئاوایە، کە عەرزم کردیت.'

'پەنجا ساڵێک پێش ئەمڕۆ، من لە بەغداد بووم بە ئەندامی پارتی خەڵتووز و بە هەمان شێوە هاوەڵەکانم ڕایان سپاردم، تاکو بگەڕێمەوە کوردستان و خەڵکی خۆمان هان بدەم، تاوەکو ببنە ئەندام و پیتاکیان لێ کۆ بکەمەوە، ئەوسا ئێمە مەبەستمان تەنها لە جووەکان بوو، بەڵام ئەوەی بەلامەوە سەیر و سەمەرەیە، ئەوەیە، کە ئێوە دەتانەوێت ڕەش و بۆر لە خەڵتووزدا بکەن بە ئەندام، جا من ئا لەوە تێناگەم، کەسێک بە خوێن جوولەکە نەبێت چۆن دەتوانێت لە خەڵتووزدا ببێت بە ئەندام!'

'مامە گیان ڕۆژگارەکە گۆڕاوە و ئێستا لەم هەرێمە دژی هەموو کەسێکی غەیرە عەرەب پلانی تر لەگۆڕێن، کەواتە ئێمە هەموومان یەک چارەنووس چاوەڕوانمان دەکات، ئیتر بۆچی نابێت لە پارتی خەڵتووزدا یەک بگرین و دەنگمان بکەین بە یەک، دژی دوژمنێک کە دەیەوێت لێکمان دابڕێت و تەفرەقە بخاتە بەینمانەوە.'

'ئەو لایەنە کێیە؟ کە دووژمنی هەموو لایەکمانە؟'

'عەرەبە شۆڤێنیستەکان.'

'هەست ناکەیت بۆ ئەو مەبەستە زۆر درەنگە و دەبووایە بیست سی ساڵ پێش ئەمڕۆ شێخ مەحموودی حەفید بەو کارە هەڵسایە و ئەو بەرەیەی دروست بکردایە، دەی ئێوە هەست بەو لێکترازانە ناکەن، کە لەنێوان مەسیحی و جوولەکە و موسوڵمانەکاندا دروست بووە؟'

'یانی مامە گیان تۆ پێت وایە، هیچ ئەنجامێکی نابێت؟'

'ئێوە نـەوەی نوێن و پێ دەچێت جیاواز بیر بکەنەوە، ئەوە نییە کوردێکی موسوڵمان لەپێناوی ئێمەی جوولەکەدا پۆلیسێکی هاودینی خۆی کوشتووە، من تاکو ئێستا شتی ئاوام نەبیستووە، کەواتە سۆز و موحیبەت لەنێوانماندایە. هەر وەکو وتم، ئێوە نەوەی نوێن و ئەگەر موسوڵمان بیت یان جوولەکە یان مەسیحی، ئیتر باوەڕت بە هەر دیانەتێکی تر هەبێت، ئەگەر بتەوێت ببیتە خاوەنی کیان و نیشتمانی خۆت، پێویستە لەنێوان خوا و خورمادا یەکێکیان هەڵبژێریت، ئەگین واز لە ڕستنی ئەو خەڕەکە بێنی باشترە!'

## ٢٠

بیرکردنەوە لە نوێکردنەوەی پارتی خەڵتووز هەڵەیەکی گەورە بوو، بەتایبەتی لە کوردستان، لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەدا من و هاوڕێکانم بێجگە لە سەرئێشە و لێدان و بەندکردن هیچی ترمان پێ نەبڕا، گەلێک پارەیشمان لەو پێناوەدا خەرج کرد، بەبێ ئەوەی بتوانین لە ڕێگای پارتی خەڵتووزەوە خزمەتێک پێشکەش بە خەڵکی دانیشتووی کوردستان بکەین، لە شاری سلێمانی بێجگە لە حەمەجان سەلیم، هیچ کەسێکی تر ئامادە نەبوو لە پارتی خەڵتووزدا ببێت بە ئەندام، سەرکێشیمان بە ژیانی خۆمان دەکرد و بەئاشکرا و بەنهێنی بانگەشەمان دەکرد، ویستمان خەڵکی لە پلانگێڕییەکان ئاگادار بکەینەوە، لەدوای ئەو ئێوارەیەوە کە لە نادیی فەرمانبەران شەڕ و پێکدادان لەنێوان ئێمە و چەند کەسێکدا دروست بوو، سیمانە سەعادەت چەند نووکە چەقۆیەکی بەر کەوتبوو، من لە دوو لاوە سەرم شکابوو، ئەوان زیاتر لە دە کەس دەبوون و بە ناوی پارتی هیواوە قسەیان دەکرد، لەبیرم دێت من پێم وتن، 'ئێمە نامانەوێت ئێوە ببنە لایەنگری ئێمە و پارتی خەڵتووز، ئەوەی گرنگە و پێویستە بیزانن، ناوەڕۆکی ئەو نامە و دۆکۆمێنتانەیە کە دەست ئێمە کەوتوون!'

بەڵام ئەوەی گوێمان لێی دەبوو، ئێمەیان بە بەکرێگیراو و جاسووس تاوانبار دەکرد و باسوخواسی دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل و ڕێکخستنی کیانی سەهیۆنییان دەخستە ئەستۆی ئێمە.

حەمەجان سەلیم و خامێی موشێی عەتار بۆ ئەو مەبەستە سەردانی هەولێریان کرد، پاش دوو حەفتە لە هەولێر گەڕانەوە و باسی ئەوەیان بۆ کردم، گوایا لە گەڕەکی عەینکاوە لەلایەن مەسیحییەکانەوە شکاتیان لێ کرابوو، پاشان دەستگیر کرابوون و دوو حەفتە لە بەندینخانەی هەولێر بووبوون.

لە دوای چەند ڕووداوێک، من کشابوومە دواوە و بەشداریی کۆڕ و کۆبوونەوەکانم نەدەکرد، حەمەجان و خامێ لە چەند جێگایەک لەدەست لێدان و هەڕەشەی خەڵکی هەڵهاتبوون و خۆیان شاردبۆوە.

خۆم و هاوڕێکانم زیاتر لە حەوت ساڵی تەمەنمان بۆ پارتی خەڵتووز تەرخان کرد، ساڵانێکی پڕ لە شەڕ و ڕووداو بوو، ئاسەواری ئەو کارەساتانە لەسەر ڕۆحم بەجێ مان، بەداخەوەم نەمتوانی وەکو ساڵانی پێشوو لە دەفتەری یادەوەرییەکانمدا تۆماریان بکەم، بەتایبەتی ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٤٨ ئەوەندە زۆر بوون، ئەگەر لە سەرەتای ئەو ساڵەوە دەست پێ بکەم، ئەوا مانگی یەکی ئەو ساڵە لەگەڵ حەمەجان سەلیم لە بەغداد بووین و ئێمەیش لە خۆپیشاندانەکاندا بەشدار بووین، کاتێک لە شەقامی سەعدوون بەرەو ڕووی زرێپۆشەکانی سوپا وەستابووین، لە ترساندا خێرا دەستی حەمەجان سەلیمم گرت و بەدوای خۆمدا ڕامکێشا، بەزۆر بەدوای خۆمدا کێشم کرد و بردمە ناو کۆلانێکەوە، ئێستایش نازانم بۆچی ئەوەم کرد و لەو کاتەدا چیم بە خەیاڵدا هات، پاشان پێکەوە بەرەو بازاڕی شۆڕیجە ڕۆشتین، حەمەجان سەلیم بەوە ڕازی نەبوو، بینیم بێزاری بە ڕوویەوە دیار بوو، لەبەرخۆیەوە گلەیی دەکرد و دەیوت، کە ئەوە خۆدزینەوەیە و دەبێت ئێمە شەرم لە خۆمان بکەین.

کاتێک ئێمە بەرێوە بووین گوێمان لە دەستڕێژی تفەنگەکان بوو. ئێوارەی ئەو ڕۆژە هەواڵمان پێ گەیشت، کە زیاتر لە دوو سەد کەس لە خۆپیشاندەران لەسەر شەقامی سەعدوون کوژرابوون، بە دەستی ئەو سەربازانەی بۆ دامرکاندنەوەی خۆپیشاندانەکانی ناو شاری بەغداد لە کوردستانەوە هێنرابوون.

بێجگە لە ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەی بەغداد، لە چەند شارێکی تری عێراقدا شەڕ و پێکدادان ڕووی دابوو، کە زیاتر لە پێنج سەد کەس کوژران و نزیکەی هەزار برینداری لێ کەوتەوە.

یەکڕیزی و هاودەنگیی لەنێوان خۆپیشاندەراندا نەبوو، لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر وتاری خەڵک لە یەکترین جیاواز بوون، هەرچەندە زۆربەی ڕاپەڕینەکان بە بیرۆکەی لاوانی پارتی شیوعی ڕێک خرابوون، بەڵام ئەوسا یەکێک دژی دەسەڵاتی بەریتانی و یەکێکی تر داوای ڕووخانی دەسەڵاتی پاشایەتیی دەکرد، بێجگە لە شیعە و سوننەکان، کە دژی یەکترین ڕژابوونە سەر شەقامەکان و شەڕی کۆنی ناو ماڵی عەشرەتی قورەیشیان لە بەغداد دەکرد.

دوای ئەو هەموو کوشتار و خوێنڕشتنە، سەرۆکوەزیران: ساڵح الجەبر، بۆ عومانی پایتەختی ئەردەن هەڵهات، پاشان بڕیاری مانەوەی دەسەڵاتی بەریتانیا ئیمزا کرا و سەرلەنوێ حکومەتێکی نوێ پێک هێنرایەوە.

لەبیرم دێت لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکاندا بەگەورەیی وشەی بازدان نووسرابوو، هەروەها لەژێر ئەم ناونیشانەدا نووسرابوو، گەلی عێراق ئەو ڕۆژە ڕەشانەی تێپەڕاند و ئیتر هەموو کەمە نەتەوایەتییەکان لە سایەی حکومەتێکی دیمۆکراتدا پێکەوە بەئاسوودەیی دەژین.

بۆ پێشوازیکردن لەم هەواڵە، خەڵکی بەسەر جادە و شۆستە

خوێناوییەکاندا دەستیان کردەوە بە ئاهەنگگێڕان و دەربڕینی خۆشییەکانیان.

خۆم ئەو ڕۆژە لە بازاڕی مسوال بووم، بینیم عەزرا مەناحیم دانیاڵ یەک یەک بەسەر دوکاندارەکاندا دەگەڕا و باسی ڕۆیشتن یان مانەوەی لەگەڵدا دەکردن، ئەو ڕۆژە لای یەکێک لە دوکاندارەکان سندوقێکیان بۆ هەژاران دانا، بۆ هاوکاریکردنی ئەو جووانەی پارەیان نەبوو بۆ فەلەستین بڕۆن، عەزرا مەناحیم ئەوەی بە دوکاندارەکان وت، کە ئەو وازی لە سیاسەکردن هێناوە و چەند ڕۆژێک پێش ئەو ڕۆژە وەکو ئەندام پەرلەمانی عێراق دەستی لە کار کێشاوەتەوە، تاوەکو خۆبەخشانە بۆ گەڕانەوە بۆ فەلەستین هاوکاریی جووەکانی عێراق بکات.

ڕۆژی دوایی حەمەجان هەواڵی مردنی مامە سلێمانی بۆ هێنام، لەبیرم دێت بە حەمەجانم وت، 'ئێستا خۆم بە هەتیو و باوکمردوو دەزانم!'

بۆ ساڵێک دەچوو مامە سلێمان لە جێگادا کەوتبوو، لە دەم و زمان کەتبوو، بۆ چەند ساڵێک بوو ئەو کەسایەتییەی جاران لە ژیانی مندا نەمابوو، هەستم دەکرد دەمێک بوو ماڵئاواییم لێ کردبوو، زیاتر لەگەڵ یادەوەرییەکانی ڕابردوویدا دەژیام، ئەو یادەوەرییانەی ژیانی منیان بەتەواوی گۆڕی.

دوای ئەوەی ئەو هەواڵەمان بیست، لەگەڵ حەمەجاندا لە هەوڵی گەڕانەوەدا بووین، دەمەو ئێوارەی ڕۆژی یەکشەممە حەمەجان سەلیم هات بۆ بازاڕی مسوال و پێی وتم، کە خۆم کۆ بکەمەوە و قوتبەدینی شوفێر لەسەر شەقامی شۆڕیجە چاوەڕوانمانە و تاکو شاری کەرکووکمان دەبات، لەو ڕۆژانەدا جووەکان بەترسەوە لە بازاڕی مسوال دەر دەچوون، کاتێک لەگەڵ قوتبەدینی شوفێردا لە

بەغداد دەر چووین، قوتبەدین لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەوە کەریمی عەلەکەیش خۆمان خۆش!'

به دەنگێکی بەرز و بەبێزارییەکەوە پرسیارم له قوبەدینی شوفێر کرد، 'چۆن؟ بەراستە؟'

'بەڵێ، ئەمڕۆ.'

'ئەرێ کوڕە حەمەجان، تەرمەکەی بۆ سلێمانی دەبەنەوە؟ وا باشتر نییە ئێمەیش لەگەڵیدا بین؟'

'بۆستە برام، قوتبەدین، برام بگەڕێوە، خێرا بگەڕێرەوە!'

حەمەجان ئەمەی وت و قوتبەدینی شوفێر، لای دایـە لاڕێی شەقامەکە و ئۆتومبێلەکەی ڕاوەستاند، پاشان لەبەرخۆیەوە پرسی، 'ئەرێ زەلام پێم ناڵێن ئێوە بەنیازی چین؟'

'ئاخۆ بەنیازی چین؟ دەمانەوێت لەگەڵ تەرمی ئەو پیاوەدا بۆ سلێمانی وەگەڕێین.'

کاتێک من ئەوەم وت، قوتبەدینی شوفێر پێی وتین، 'کوڕە ئەوە ئێوە باسی چی دەکەن؟ ئەگەر مەبەستان له عەبدولکەریم ئەلیاسە ئەوا خۆ ئەو پیاوە...'

حەمەجان سەلیم قسەکەی پێ بڕی، 'ئەوا چی؟ ئیتر هەرچییەک هەیە و نییە، تۆ وەگەڕێ، دەی خێرا وەگەڕێ برام.'

'ئەرێ ماڵت به قوڕ گیرێت بۆ نایەڵیت قسەکەم تەواو بکەم و وەکو عینسان له یەکتری تێبگەین؟ تەرمی ئەو پیاوە لێرە له بەغداد نێژراوە.'

حەمەجان سەلیم پرسیی، 'چۆن؟ دەی نایگەڕێننەوە بۆ سلێمانی؟'

'سلێمانیی چی! کوڕە خۆم ئەم دوانیوەڕۆیە ئاگام لێ بوو کاتێک بۆ گۆڕستانیان برد.'

'خـەمـبـارم بـەوەی تـەرمـی ئـەو پـیـاوە لـە سلێمانی بـە خاک

ناسپێردرێت، ئیتر لەوانەیە ئەوەش پەیوەندیی بەوەوە هەبووبێت، کە عەبدولکەریم ئەلیاس پیاوێکی دیندار بوو! لەوانەیە بۆ گەڕانەوەی تەرمەکەی بۆ شاری سلێمانی بڕیاری خۆی بووبێت!'

دوای ئەوەی من ئەمەم وت، هەرسێکمان بێدەنگ بووین و قوتبەدینی شوفێریش ئۆتومبێلەکەی لێخوڕی.

## ٢١

'پێویسته دەستوبرد بکەین و موشوورێکی خۆمان بخۆین، تاوەکو کات بەسەر نەچووە و ئەمڕۆمان لێ نەبووە بە سبەینێ!'

ئەو ڕۆژە ئاوام بە عەزیزی حەکیم وت، چووبووم بۆ لای تاکو باسی گوزەرانی خۆمانی بۆ بکەم، باسی ڕووداوەکانی بەغداد و شارەکانی تری عێراقی بۆ بگێڕمەوە، ئەو ڕۆژە ماڵ بە ماڵ بەسەر جووەکانی گەڕەکی جوولەکاندا گەڕام و هەواڵی ڕووداوەکانی شارەکانی تری عێراق و کوردستانم بێ پێچوپەنا بۆ گێڕانەوە، پاشان لەگەڵیاندا باسی ڕۆیشتن یان مانەوەمان کرد، ئەو ڕۆژە عەزیزی حەکیم پێی وتم، 'نازانم تۆ بۆچی بۆ لای من هاتوویت؟'

زۆر بێزار و تووڕە دیار بوو، شووشەیەکی بەتاڵی عارەقی لە بەردەمدا بوو، لەو کاتەدا خەریکی هەڵچڕینی شووشەیەکی پڕی عارەق بوو، هەوڵم دا لە چاوی بڕوانم و تێی بگەیەنم، کە پێویستە ئێمە بە هەموومان هەوڵێک بدەین بۆ ئەوەی بەر لە لێشاوی ڕقی لایەنگرانی عەرەبە شۆڤێنیستەکان بگرین، عەزیز دوای ئەوەی پەرداخێک عارەقی تێکرد و لە گۆزەیەک ئاوی بۆ زیاد کرد، بەبێ ئەوەی لێم بڕوانێت لە وەڵامدا پێی وتم، 'من تەواوی ئەو شاری سلێمانییەی دەناسم و کێشەم لەگەڵ کەسیاندا نییە، ئیتر کێ دێت و بە ناحەقی بەردەرگام پێ دەگرێت، خوا سووک و ڕیسوای بکات.'

لەو کاتەدا ئەژنۆم دادابـووە سەر قەراغی فەرشەکە، لێی نزیک

بوومەوە و دەستم خستە سەر ڕانی و پێم وت، 'کەواتە تۆ تەنها خەمی خۆتتە!'

کاتێک ئەمەی لێ بیستم، پەرداخە عارەقەکەی بە یەک جار خواردەوە و بەبێزارییەکەوە پێی وتم، 'ئێستا جەنابت بۆ چ دەوایەک بۆ لای من هاتوویت؟ ئەگەر سکت دێشێت، ئەوە قومێک لە ئاوی ئەو هاز و سیرە بدە، ئەگەر دانت دێشێت، ئەوە دەنکێک مێخەکی وشکی بخەرە سەر و تەواو، نازانم، بەڕاستی نازانم...'

تف لە بەینی لێوە وشکهەڵاتووەکەیەوە دەر پەڕی و کەوتە سەر ڕووی فەرشەکە، پاش ئەوەی هەردوو لەپی دەستی بە دەموچاویدا هێنا، ماسوولکەکانی ناوچەوانی هێنانەوە یەک و بە دەنگی بەرز پێی وتم، 'ئەگەر بۆ دەوا و چارەسەری ئەوە بۆ لای من هاتوویت، کە وەکو جوولەکەیەک لە ڕق و دڵڕەشیی ئەوانی تر بتپارێزێت، ئەوە تەنها ژەقنەمووتم لایە، ئەوەتا، ئا ئەوەتانێ، چەند دڵۆپێکی لێ بکەرە سەر زمانت و ئیتر هیچ خەمت نەبێت، بەڵام ئەگەر بڕیاری ئەوەت دا لەو زەهرە بخۆیتەوە، خێرا هەڵسە و لێرە بڕۆ با من تووشی سەرئێشە نەبم و بۆگەنەکەت بەسەر مندا بەجێ نەمێنێت، ئا ئەوەتانێ شیوەکە نێزیکە و خۆت هەڵدەرە ناو مێز و گووی شێخە ناموبارەکەکان، ئیتر بە قەولی ئەوان ڕاستەوڕاست بۆ قیامەتت دەبات.'

عەزیزی حەکیم لەو کاتەدا ئەوەندە لێم نزیک بووبووەوە بۆنی هەناسەیم دەکرد، بۆنی ڕازیانەی عارەقەکەیم دەکرد، چاوی لە چاوم بڕیبوو، توند شانی گوشیم و بەردەوام بوو، 'ئەگەر بمزانیایە خەڵکی ئەم شارە ئەوەندە نەمەکحەرامیان لێ دەر دەچێت، هەموویانم دەرمانخوارد دەکردا!'

'من تەنها بۆ ئەوە هاتووم تاکو پێکەوە بتوانین خەمێکی خۆمان و خزم و کەسوکارمان بخوێن.'

'وەکو پێم وتیت، لەم ڕۆژە ڕەشەدا باشترین دەوا تەنها نۆشینی ژەقنەمووتە!'

'ئەری مالْت بە قوڕ گیرێت، بەم ڕۆژی نیوەڕۆیە کاتی عارەقخواردنەوەیە.'

عەزیزی حەکیم بەبێ ئەوەی لێم بڕوانێت، ڕووی کرد بەلای نێرگەلەکەیەوە و بە سەری پەنجەکانی خەلْووزی سەر نێرگەلەکەی هەلْگێڕایەوە، پاشان مژێکی قوولْی لێ دا و دووکەلْەکەی لەژێر سمێلْە ڕەشوسپییەکەیەوە بەرەو ڕووی من بە هەوای ژوورەکەدا کرد، کاتێک ویستم هەناسە بدەم، سییەکانم پڕ بوون لە بۆنی ڕێحانەڕەشە.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە چووم بۆ قەیسەریی نەقیب، لەناو دەرگای خوارووی قەیسەرییەکەدا ڕووم بوو بە ڕووی حەمەجان و عەبدولمەجیدی حاجی ئەمینەوە، پێش ئەوەی چاکوچۆنییم لەگەلْدا بکات زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوەکاتی و لەژێر لێوەوە وتی، 'لەگەلْ ئەم پیاوە ئێستا لە بەغداد گەڕاینەوە!'

دوای ئەوەی تەوقەم لەگەلْ کردن، لە حەمەجانم ڕوانی و پرسیم، 'بۆ خێر بوو؟'

'کوڕە پارە و پوولْی خزمان و ئەو جووە هەژارانەمان برد، تاوەکو لە ڕێگا لێیان نەسەنن.'

'ئەوانەی بۆ فەلەستین دەڕۆن؟'

'بەلْێ.'

'دەی بە خێر بۆتان بنووسرێت!'

مەلا حەسەن قەرەداغی، کاربەدەستی فەرمانگەی ئەوقاف، خۆی ئاوای بە باپیرە خایم وتبوو، 'ئیتر بڕیارێکە و لە بەغداوە دەر چووە، ئەو بڕیارە ژمارەی نییە و لە مەلەفەکاندا جێگیر ناکرێت، لە ئەوقاف یەکێک سەرۆکاری کاروباری جووەکان دەکات و ئیتر بەو جۆرە بڕیارەکە جێبەجێ دەکرێت.'

پاشان ڕۆژنامەیەکی لە چەکمەجەی مێزی ژووری دانیشتنەکەی دەر هێنابوو، ئاماژەی بە سەردێڕێک لە لاپەڕەی سەرەکیی ڕۆژنامەکە کردبوو. کە بە بڕیاری نووری سەعیدی سەرۆک وەزیرانی عێراق جوولەکەکان هەموویان دەستبەسەرن و موڵک و ماڵیان دەستی بەسەردا دەگیرێت، هەروەها مەلا حەسەن وتبووی، 'لە سلێمانی دائیرەی ئەوقاف ڕاسپێردراوە تاوەکو حەل و فەسڵی سەروەت و ماڵی ئێوە بکات.'

ئەو ڕۆژە مەلا حەسەن قەرەداغی، لە کۆتاییی قسەکانیدا بە باپیرە خایمی وتبوو، 'ئەو ڕووداوانە بە ڕێکەوت نین و خوا خۆی ڕەزامەندیی لەسەرە.'

باپیرە خایم لەو کاتەدا هیچ وەڵامێکی نەدابۆوە و تەنها بێدەنگ لە مەلا حەسەنی ڕوانیبوو، ویستبووی پێی بڵێت، 'ئەگەر تۆی مەلا هەموو تاوانەکان بخەیتە ئەستۆی خوا، کەواتە ئەو خوایەی تۆ ناوی دێنیت زۆر لە تۆ و هاوشێوەی تۆ بێدەسەڵاتترە!'

لەو مانگەدا کنێسەتەکان بە بڕیاری ئەوقاف بۆ مەبەستی نۆژەنکردنەوە داخران، پاشان ئاسەوار و کلتووری دینی جوولەکەیان لە ڕوو داماڵین و بێدەنگ کران بە مزگەوت و مەلا و مجەوریان بۆ دەستنیشان کردن، کنێسەتەکەی گەڕەکی جوولەکانی شاری سلێمانی لە سەرەتای دروستبوونی ئەو شارەوە بنیاد نرابوو، ساڵی ١٩٥٥ دوای ئەوەی سێ ساڵ داخرابوو، نۆژەن کرایەوە و ناوی مزگەوتی شێخ عەباسی لێ نرا.

قەبرسانەکان، بە پلان کران بە شوێنی نیشتەجێبوون و خانوویان لەسەر دروست کرا، یان هەندێکیان بە بڕیاری میری بەر جادە کەوتن، ئەوسا گۆڕستانی جووەکانی شاری سلێمانی لە نێوان گەڕەکی سەرشەقام و جوولەکاندا بوو، ساڵی ١٩٥٣ جادەیەکی سی مەتر پانی بە نێواندا کێشرا و تەواوی گۆڕستانەکە لەسەر نەخشەی شارەکە سڕایەوە، ئەو بڕیارە ڕاستەوخۆ لە بەغدادەوە دەر چووبوو، بەڕێوەبەر و کارمەندانی شارەوانیی سلێمانی لێی ئاگادار نەبوون.

لە تەواوی شار و شارۆچکە و گوندەکانی کوردستاندا، زۆرینەی خەڵکی بەشدار بوون لە هەڵدانەوە و وێرانکردنی گۆڕی جووەکاندا، کەواتە زۆرینەی خەڵکی کوردستان لە جێبەجێکردنی پلانی عەرەبە شۆڤێنیستەکاندا بەشدار بوون.

باپیرە خایم لە دوالاپەڕەکانی یاداشتنامەکەیدا نووسیبووی، 'زۆرینەی خەڵکی کوردستان لە سڕینەوەی کولتوور و ئاسەوار و هەڵدانەوەی گۆڕی باووباپیرانماندا بەشدار بوون!'

# ١

ڕۆژی هەینی، ١٠ی تشرینی ساڵی ١٩٤٨ بوو، کاتژمێر شەشی سەرلەبەیانی لەیفی عەمانوێل، حاخامی کنێسەتی گەڕەکی جوولەکانی شاری سلێمانی، لەناو حەوشەی کنێسەتەکەدا کاتژمێرێک زیاتر دەبوو بەتەنیا لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەچوو، توورەکەیەکی ڕەشی بەدەستەوە بوو، دەرگای حەوشەی کنێسەتەکەی خستبووە سەر پشت، چەند جارێک لەناو دەرگاکەدا ڕاوەستا و بە ڕاست و چەپی کۆڵانی بەردەمی کنێسەتەکەیدا ڕوانی، بە درێژاییی کۆڵانەکە لەلایەن ئەو میوانانەی لە سەرتاسەری کوردستانەوە بۆ گێڕانی ئاهەنگی ساڵی نوێ هاتبوون، چادر هەڵدرابوو، لەیفی حاخام چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد وەکو ڕێبەرێک لە کاتی خۆیدا ئەو ڕۆژە جووەکان بۆ کنێسەت بانگهێشت بکات، پاش تاوێک چاوەڕوانی، گەڕایەوە ناو حەوشەکە و دەرگاکەی بەکراوەیی بەجێ هێشت، پاشان بەرەو ئەو پەیژە دارە چوو، کە بە گوێسەبانی کنێسەتەکەوە نرابوو، گەیشتە بەردەمی پەیژەکە و توورەکەکەی کردە شانی و بە پەیژەکەدا بۆ سەربان هەڵگەڕا، لە سەربانی کنێسەتەکە هەڵوێستەیەکی کرد و بە چواردەوری کنێسەتەکەدا لە گەڕەک و سەربانە گڵەکانی گەڕەکی ڕوانی، لە دوورەوە گلۆپەکانی ناو شار تاقوتەرا دەگڕان، دەنگی قەسابەکانی قەسابخانەکەی سەرشەقامی دەبیست، ئەو بەیانییە هەورێکی ڕەشی لیخن بەسەر شاردا کشابوو، بە جۆرێک لە گەڕەکی جوولەکانەوە ئەزمڕ و گۆیژەت لێ دیار نەبوو، توورەکەکەی لە

شانی داگرت و شۆفارەکەی دەر هێنا، ئەو شۆفارە ئەنتیکە، کە ساڵی جارێک ڕووناکیی دەبینی، پیرانی گەڕەکی جوولەکان دەیانوت، 'تەمەنی ئەو شۆفارە زیاتر لە سێ هەزار ساڵە!'

کاتێک لەیفی عەمانوئێل فووی بە شیڤاردا کرد، دەنگی شۆفارەکە لە ناوشارەوە دەبیسترا، ئەو دوکاندار و دەستگێڕانەی بەو بەیانییە زووە لە بازاڕ بوون، باسیان لەوە دەکرد، کە ئەو بەیانییە گوێیان لە دەنگێکی غەریب بووە، بەڵام هیچ کەسێک نەیدەزانی ئاخۆ بە دەنگی چ گیاندارێک بەراوردی بکات، ئەو دێهاتییانەی ئەو بەیانییە بەروبوومی شیرەمەنییان بۆ مەیدانی ماستەکە هێنابوو، وتبوویان لە لوورەی گیاندارێکی کێوی دەچوو.

کنێسەتی گەڕەکی جوولەکانی شاری سلێمانی سەد ساڵ زیاتر بوو بێجگە لە کۆڕ و کۆبوونەوە و خواپەرستی، ساڵانە سەری ساڵی نوێی تێدا پیرۆز دەکرا، لەدوای ساڵی ١٩٤١وە جووەکان لە سەرانسەری کوردستان و عێراقەوە ڕوویان تێ دەکرد، کنێسەتەکە قوتابخانەیەک بۆ منداڵانی تاکو تەمەنی دە ساڵان و یەشیڤایەک بۆ گەنجانی تێدا بوو، کچانیش بۆیان هەبوو لەوێ بخوێنن، پاشان تازەپێگەیشتووان بۆ درێژەدان بە خوێندن تاقوتەرا بۆ بەغداد یان بۆ مووسڵ دەچوون، ئەوانی تر لە ناوشاردا دەبوون بە شاگردی زەڕنگەر و جۆلایی و خومچی یان چەخماخسازی و دارتاشییان دەکرد.

ئەو ڕۆژە بێجگە لە جووەکانی کوردستان، بۆ گێڕانی ئاهەنگی سەری ساڵ، لە بەغداد و شارەکانی خوارووی عێراقەوە چەند خێزانێک هاتبوون، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی کۆڕ و کۆبوونەوەی جووەکان یاساغ کرابوون و کنێسەتەکانیان داخرابوون.

پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت، لەناو ماڵ و کۆڵانەکانی گەڕەکدا

گەورە و بچووک پێشوەخت بۆ ئاهەنگی ڕۆژ الحەسنا بەئاگا هاتبوون، ئەوانەی لە هەولێر و کۆیە و قەڵادزێ و ڕانییەوە هاتبوون لە کۆڵانی کنێسەت یان بەرامبەر کنێسەتەکە چادریان هەڵدابوو، جووەکانی هەڵەبجە لە بەردەم ماڵی شلومی بوون، ئەو جووانەی لە بەغداد و جێگاکانی تری عێراقەوە هاتبوون لە بەردەم ئاشەکەی هاروون و ناو ئاشەکەدا بوون، بێجگە لەوەی گەڕەک هەر ماڵە و میوانداریی خێزانێک یان دووانی کردبوو. سەرقاڵی و پەلەپەلێک بە هەموویانەوە دیار بوو، بە کۆمەڵ و بە تاک لە بەر ماڵەکان و سەربان و سەر کووچەی کۆڵانەکاندا ڕاوەستابوون، ژن و پیاو و منداڵ و پیر خۆیان گۆڕیبوو، لەگەڵ بیستنی دەنگی شۆڤاردا پۆل پۆل بەرەو کنێسەتەکە چوون، یان لە کۆڵانی کنێسەتەکەدا تێکەڵ بەوانی تر دەبوون، گەڕەکەکانی تری شار، هێشتا خامۆش و بێدەنگ بوون، ژنانی گەڕەکی جوولەکان جلی ڕەنگاوڕەنگیان پۆشیبوو، هەیاسە و لاگیرەی زیو و ئاڵتوونیان لە ڕەفتە و هەورییەکانیان دابوو، سەڵتەی قەیفە و کۆڵوانەی بریسکەداریان لەبەردا بوو، قەیرەکان کەمەربەندی زیویان بەستبوو، بۆنی سمڵ و مێخەکی ملیان تێکەڵ بە بۆنی گوواوی شیوەکە دەبوو، ئەو شیوەی، کە بە نێوان ماڵەکانیاندا تێدەپەڕی و زێرابی تەواوی شاری دەکەوتە سەر، دانیشتووانی گەڕەکی جوولەکان لەگەڵ ئەو بۆنوبەرامی پاشەڕۆیەدا لەدایک دەبوون و گەورە دەبوون، جیاواز لە میوانەکان، کە بە درێژاییی ئەو ڕۆژە پیاوان لچکی جامانەکانیان و ژنەکان سەرپۆشەکانیان لە دەم و لووتیانەوە ئاڵاندبوو، خەڵکی گەڕەک بە بۆنی شیوەکە ڕاهاتبوون و ئیدی هەستی بۆنکردنی ئەوانی نەدەشێواند.

هەموو بێدەنگ لە حاخامیان دەڕوانی و چاوەڕوان بوون دەست بە تەوراتخوێندنەوە بکات، حاخام تەوراتە گرمۆڵەکراوەکەی

کردەوە و بەناو ئامادەبوواندا گەڕا و بە دەنگی بەرز دەستی کرد بە خوێندەوەی، گەلێک بە لەبەر و هەندێکیش دەوریان لە تەوراتێک دابوو، پێکەوە بە کۆرس لەگەڵ حاخامدا دەیانوتەوە.

بۆ بەشداریکردنی ژنان حەوشەکە تەنافێکی بەنێواندا کێشرابوو، بە چەند بەتانییەکی سەوز پیاوانی لە ژنەکان جیا دەکردەوە، دەنگی یەکتریان بەئاسانی دەبیست و نزاکانیان تێکەڵ بە دەنگی حاخام و پیاوەکانی تر دەبوو، ماڵەکان چۆڵ بوون و تەواوی دانیشتووانی گەڕەک و میوانەکان لە ناو کنێسەت و ئەترافی کنێسەتەکە بوون.

کاتژمێر دەی پێش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە پاش نوێژ و نزاکردن ئاهەنگ لە گۆڕەپانی بەرامبەر کنێسەتەکە دەستی پێ کرد، دەنگی دەهۆڵ و زورنا لەناو شارەوە دەبیسترا، لەناو حەوشەی ماڵی سەعادەتدا مەنجەڵی فافۆنی گەورە خرانە سەر سێپا و ئاگریان لە ژێردا کرایەوە، لە قەسابخانەکەی خوار گەڕەکی جوولەکانەوە چوار قوڵینەی پڕ لە گۆشت بۆ ماڵی سەعادەت هێنران، لەناو حەوشەکەدا ژنان فەقیانەی کراسەکانیان لێ هەڵماڵیبوو، لە کەنارەوە فەردە برنج و سندوقی داری پڕ لە تەماتە و کوولەکە و باینجان دانرابوون، لەو کاتەدا خایم شەلومۆ بە تەشوێیەک خەریکی هەڵچڕینی تەنەکە ڕۆنەکان بوو.

لە بەرەبەیانیی ئەو ڕۆژەوە منداڵانی گەڕەکی سەرشەقام و چوارباخ لەسەر سنووری گەڕەکی جوولەکان لە دوورەوە لە ئاهەنگەکەیان دەڕوانی، ئەو ڕۆژە منداڵانی ئەو دوو گەڕەکە تێکڵاو بە یەکدی نەبوون و دووراودوور بەردەوام بەردیان دەگرتە یەکتری، بێجگە لەوەی هەردوو لایان هەرچ کەسێک لەناو گەڕەک و کۆڵانەکانی جوولەکانەوە بە دیار دەکەوت، بەردبارانیان دەکرد.

پێش نیوەڕۆ لە کنێسەتەکەوە دوو پیاو بە دوو توورەکەی سپییەوە

چوون بۆ لای منداڵەکان و نوقڵی ترشوشیرین و کورسینەعنا و کڵۆی شەکریان بەسەردا دابەش کردن، دوای ئەوەی پیاوەکان بۆ کنێسەتەکە گەڕابوونەوە، وتبوویان، گوایا زۆر لە منداڵەکان نوقڵیان لێ وەر نەگرتووە و پێیان وتبوون، 'نامانەوێت پیسە!'
چەندیین منداڵیش لە دوورەوە نوقڵەکانی دەستیان گرتبووەوە سەروگوێلاکی پیاوەکان، چەند منداڵێکیش تاکو ئێوارەی ئەو ڕۆژە نوقڵەکانیان لەناو دەستیاندا توند گرتبوو، یان لە گیرفانی شەرواڵ و ڕانک و چۆغەکانیاندا شاردبوونیانەوە.

بەیانیی ئەو ڕۆژە بیست گەنجێک لە بەردەرکی سەراوە بە هوتافکێشان بە جادەی مەلەویدا بۆ بەردەمی قەسرەکەی تۆفیق قەزاز چووبوون، ئەو گەنجانە لایەنگری بیری ناشیونالیست بوون و بە ڕەشید عالیی گەیلانی سەرسام بوون، کە لەو ڕۆژانەدا بۆ جاری دووەم بە کودەتا دەسەڵاتی گرتبووە دەست و بووبووە سەرۆک وەزیرانی عێراق.
گەنجەکان زۆرینەیان سمێڵی هاوشیوەی هیتلەریان دانابوو، ژمارەیان تاکو دەهات لە زۆربووندا بوو، چەند ئەفەندی و تەڕپۆش لەسەر یەک یەک دەچوونە سەر شۆستەی بەردەمی دوکانەکەی فەقێ ڕەشیدی قەشان و قسەیان بۆ ئامادەبووان دەکرد، چەند کەسێکیش بە زمانی کوردی و عەرەبی شیعریان خوێندەوە، کابرایەک بەهەڵەداوان بەناو خەڵکەکەدا دەڕۆیشت و هاواری دەکرد،
*"لە بیرم دێ، سولەیمانی، کە دارالموکی بابان بوو*
*نە مەحکومی عەجەم، نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو"*
پیرەپیاوێکی زەردەڵەی بەساڵاچوو، کە گورجوگۆڵ و پڕ لە وزە دیار بوو، بە دەنگێکی بەرز ئەو دوو دێڕەی دەیان جار لەسەر یەک

وتەوە، بە جۆرێک سەرنجی خەڵکەکەی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، کە هەموو بەسەرنجەوە لێیان دەڕوانی.

گەنجێک لەسەر شۆستەی بەرانبەر خەڵکەکەوە هاواری لە کابرای پیری شیعرخوێن کرد، 'کورە هەی پیری خەیاڵ پووچ، سولەیمانیی چی و بابانی چی، تۆ لە گوێی گایا نووستوویت، ئێستا سەردەم سەردەمی ڕەشیدە، ڕەشید.'

گەنجەکە دەستی هەڵبڕی و هاواری کرد، 'ڕەشید عالیی گەیلانی دوژمنی وەتەنفرۆشانی.'

خەڵکەکەیش بە کۆرس بەدوایدا وتیانەوە.

ئەو ڕۆژە ئاهەنگەکەی گەڕەکی جوولەکان و کۆڕ و کۆبوونەوەکان لە ناوشار درێژەیان کێشا، لە سەرەتاوە لە بەردەرکی سەرا ژمارەی پۆلیسەکان لە خۆپیشاندەران زیاتر بوو، خۆپیشاندەران لە کۆمەڵێک گەنج پێک هاتبوون و لە بەردەمی ئوتێلی شەعبدا وەستابوون، کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ و دوای نوێژی نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، دوای ئەوەی نوێژی مزگەوتی گەورە و خانەقا و مزگەوتەکانی تری ناو شار کۆتایی هات، خەڵکی بەکۆمەڵ بەرەو بەردەرکی سەرا هاتن و تێکلاو بە کاسبکاران بوون. چەند شاعیر و نووسەرێک قسەیان بۆ خۆپیشاندەران کرد، قسەکەرەکان نیو مەترێک بەرزتر لە خۆپیشاندەران شیعریان دەخوێندەوە، کۆمەڵێکی تر دەورەیان لە شێخ مەلا ساڵح بەرزنجی دابوو، کە ئەو کات خەتیبی مزگەوتی خانەقا بوو، شیوعییەکانیش بەجیا لەبەر سێبەری دیواری بەریدەکەدا وەستابوون و هەرچ ڕێبوارێک لەوێوە تێدەپەڕی، ڕێگەیان لێ دەگرت و قسەیان بۆ دەکرد یان پارچەیەک کاغەزیان دەدایە دەست.

ئەو ڕۆژە زۆرینە ناشیۆنالیستەکان و خاوەن بەرژەوەندییەکانی شار بوون و لە بەردەم قوتابخانەی فەیسەڵییەدا گەنجێکی ڕێکپۆش چووبووە سەر قەراغی سیاجی باخەکە و قسەی بۆ دەکردن، ئەو خەڵکەی سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە لە بەردەمی قەسرەکەی تۆفیق قەزازدا کۆ بووبوونەوە و لایەنگری بیری ناشیۆنالیستی و دژی دەسەڵاتی ئینگلیز بوون و خۆیان بە هاوخەبات و هاوبیری ڕەشید عالی گەیلانی دەژمارد لەوێدا ئامادە بوون.

هەندێک لە ناشیۆنالیستەکان هێرشیان کردە سەر شیوعییەکان و جێگاکەیان داگیر کردن و بە کۆڵان و جادەکانی شاردا ڕاویان نان، کاتێک ناشیۆنالیستەکان پەلاماری شیوعییەکانیان دا، پۆلیسەکان لە دوورەوە لێیان دەڕوانین، ئەو خەڵکەی لە بەردەمی ئوتێل شەعبدا کۆ بووبوونەوە، دوای ئەوەی چەند مەلا و نووسەرێک قسەیان بۆ کردن، پاشان بڵاوەیان لێ کرد و هەندێکیان جێگاکەیان گۆڕی و تێکڵاو بە ناشیۆنالیستەکان بوون، لە سەرەتاوە وتار و نارەزایەتییەکان دژ بە نوێکردنەوەی ئینتیدابی بەریتانییەکان لەسەر عێراق بوون. داوایان دەکرد سەربازە بەریتانییەکان لە عێراق بچنە دەرەوە، گەنجێکی ڕەقەڵەی باڵابەرزی سوورکار، لە لێدوانەکانیدا باسی گەورەیی هێزی ئەڵمانیای کرد و پاشان هاتە سەر باسی زوڵموزۆری جووەکان لە فەلەستین، باسی لەوە دەکرد، کە چۆن براکانیان لە فەلەستین ژیان بەسەر دەبەن و دژی زوڵم و زۆرداریی جووەکان شەڕ دەکەن، باسی لە شاری حەیفا دەکرد، کە گوایا خۆی چەند ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە سەردانی ئەوێی کردووە و چەند ساڵێک ماوەتەوە، باسی لە زوڵموزۆری داگیرکاریی جووەکان دەکرد، کابرا لە سەرەتاوە خۆی بە مامۆستا ڕەفیق شاباز ناساند، قاتێکی ڕەشی خەتخەتی لەبەردا و بۆینباخێکی ڕەشی لەسەر بەستبوو، قژی بە لادا خستبوو و سمێڵێکی

هیتلەریی دانابوو، ڕەفیق شاباز لە درێژەی قسەکایندا وتبووی، 'جووەکانی عێراق هەموو بەشدارن لەو داگیرکاری و تاوانانەی لە فەلەستین بەرامبەر برا موسوڵمانەکانمان دەکرێت، جووەکان بە پارە و پووڵ پشتگیریی لە زایۆنستەکان دەکەن، ئەوەتا تەواوی ئەوروپا لەو پیس و جانەوەرانە پاک دەکرێتەوە،'

لەو کاتەدا لەناو خۆپیشاندەرەکانەوە هاوار دەکرا، 'مردن بۆ جوولەکە، مردن بۆ جوولەکە!'

دوای ئەوەی زۆرینە بە کۆرس ئەوەیان وتەوە، هەندێک لەو خەڵکەی لەوێدا ئامادە بوون بڵاوەیان لێ کرد و کۆڕەکەیان بەجێ هێشت، پاشان چەند گەنجێک پێشڕەویی خۆپیشاندانەکەیان کرد و بەرەو ئەسحابەسپی و لەوێوە بە جادەی کاوەدا بۆ خانەقا بە بانگدانی، 'مردن بۆ جوولەکە،' بەڕێوە بوون.

لە ڕێگا هەرچ دوکانێکی جوویان دەهاتە پێش هەوڵی تاڵانکردن یان سووتانیان دەدا، کاتێک گەیشتنە ناو گەڕەکی جوولەکان، ژمارەیان لە دوو سەد کەس زیاتر دەبوو، بەناو گەڕەکدا بڵاو بوونەوە و هەڵیان کوتایە سەر چەند ماڵێک و دەرگا و پەنجەرەکانیان شکاندن، بێجگە لە زەرەر و زیانی ماڵی، کەسیان بەردەست نەکەوت، چونکە لەو کاتەدا هەموو دانیشتووانی گەڕەکی جوولەکان لە کنێسەت خەریکی ئاهەنگگێران بوون.

کاتێک گەیشتنە بەردەمی کنێسەتەکە، جووەکان لەوێ هێشتا سەرقاڵی ئاهەنگگێران بوون و لەسەر سفرەی نانخوارنەکەیان دانیشتبوون، لەو کاتەدا بوو بە دەنگەدەنگ و چەند پیاوێک، ژن و منداڵەکانیان بۆ ناو حەوشەی کنێسەتەکە برد، ناشیۆنالیستەکان لەگەڵ گەیشتنیاندا جووەکانیان بەردباران کرد. پاشان بەرانبەری یەک وەستابوون و هەردوو لا لە دوورەوە بەرد و داریان دەگرتە

یەکتری، لەیفی حاخام بەتەنیا بەرەو ڕووی خۆپیشاندەرەکان چوو، لە پێشیاندا وەستا و بە دەنگی بەرز هاواری لێ کردن، 'برایان، هاوشارییەکانم، دەتوانم لێتان بپرسم، ئایا ئێوە لە چی تووڕەن و کێ ئێوەی هان داوە تاکو بێن بۆ ئێرە؟'

زۆرینە فیکەیان بۆ لەیفی حاخام لێ دەدا و لە چەند لایەکەوە بەردیان تێگرت، پاشان سێ گەنج هێرشیان کردە سەری و جلەکانیان لەبەریدا دڕی، ئەو حاخامە پیرەیان دایە بەر شەق و لە بەرپێیاندا کەوتبوو، تاوەکو ئەو کاتەش حاخام هێشتا توورەکەی شۆفارەکەی لە شاندا بوو و توند هەردوو دەستی پێوە گرتبوو، کاتێک هێزی لێ بڕا، توورەکەکەی دەستی کەوتە بەر پێی گەنجەکان و شۆفارەکەی ناویان بە پێلەقە وردوخاش کرد، چەند گەنجێک پەلاماری توورەکە دڕاوەکەیان دا و پارچەی شۆڤارە شکاوەکەیان دەر هێنا، کاتێک ئەوەیان بینی، دیسان هێرشیان کردەوە سەر لەیفی حاخام و پێیان دەوت، 'وامان دەزانی توورەکەی بنهەنگڵت لیرەی ڕەشادیی تێدایە، کەچی قۆچی بزنت تێدا هەڵگرتووە.'

یەکێک لە هێرشبەرەکان ڕووی کردە جووەکان و هاواری لێ کردن، 'هاتووین تۆڵەی برا موسوڵمانە فەلەستینییەکانتان لێ بسەنین!'

یەکێکی تریان وتی، 'کە ئێوەی جوولەکە قەتڵوعامیان دەکەن و خاکەکەیان داگیر دەکەن.'

حاخام، دوای ئەوەی لەژێر دەستی چەند گەنجێکدا خۆی ڕاپسکاند و خۆی ڕاست کردەوە، بە دەنگی بەرز پێی وتن، 'ئەوانەی ئەو درۆ و بوختانانە بۆ ئێمە هەڵدەبەستن، کە گوایا بە پارە و پیتاکی ئێمە جووەکان لەسەر خاکی پیرۆزی فەلەستین شەڕ دەکەن، ئەوانە زایۆنیستەکانن، برایانم مەرج نییە هەموو جوویەک زایۆنست

بێت. ئێمە لەگەڵ ئەوەدا نین ماڵی کەس داگیر بکرێت، ڕاستە ئێمە جووین، بەڵام ئێستا خاکی ئێمە کوردستانە نەک ئیسرائیل، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوای خۆتان هەیە، ئەبەد خوا لە هیچ کتێبێکدا ئەمر بە بەندەکانی خۆی ناکات تاکو زوڵم لە یەکتری بکەن، ئەوەی ئێوەی هان داوە ئەوە خوانەناسە و دوژمنی هەموومانە، تکایە بگەڕێنەوە ناو ماڵی خۆتان و غەدرمان لێ مەکەن.'

کاتێک ناشیۆنالیستەکان لەوەدا بوو هێرش بکەنە سەر جووەکان، لەناکاو لەجێگای خۆیان وەستان و لە خوارووی گەڕەکیان ڕووانی، لەوکاتەدا زیاتر لە پەنجا پیاوی ڕیشسپیی بەساڵاچوو، لە پێدەشتی باخەکانی خوار گەڕەکی جوولەکانەوە بەرەو ناو گەڕەک و کنێسەتەکە بەڕاکردن بەڕێوە بوون، مشکیلەسەر و ڕانکوچۆغەلەبەر، ڕەنگی پێستیان سپی وەک بەفرێکی تازەی لەسەر بارییبێت، هەموو کورتەباڵا و گورجوگۆڵ بوون، لەگەڵ گەیشتنیاندا هەندێکیان بەناو خەڵکەکەدا بڵاو بوونەوە و قسەیان بۆ ناشیۆنالیستەکان دەکرد، یەکێک لە پیرەکان کابرایەکی ڕیشسپیی پشتچەماوە بوو، دەستی دایە بنباڵی لەیفی حاخام و هەڵی ساندە سەر پێ، لەیفی حاخام لێی پرسی، 'ئەرێ لالۆ گیان ئێوە چکارەن و لەکوێوە تەشریفتان هێناوە و چۆن بە فریادڕەسی ئێمەی زەبوونەوە هاتن؟'

کابرای پیر، لە وەڵامدا وتی، "وەلێ، ئێمە سۆفی خواوەندین و لە هەورامانەوە وەدەنگی نزاکانی ئێوەوە هاتگین.'

لە چەند هەناسەیەکدا خۆپیشاندەرەکان بڵاوەیان لێ کرد، پاشان لە گۆڕەپانی بەردەمی کنێسەتەکەدا حاخام بەچۆکدا هاتبوو، پارچەی شۆفارە شکاوەکەی لەناو خۆڵ و تۆزی گۆڕەپانەکەدا کۆ دەکردەوە، ژن و پیاو و هەموو دانیشتووانی گەڕەکی جوولەکان بەدەوری حاخامدا بازنەیەکیان دروست کردبوو، حاخام دەستی بە

پشتێنی یەکێک لە سۆفییەکانەوە گرت و هەستایە سەر پێ، چنگی پڕ لە پارچەی شکاوی شۆڤارەکە بوو، دەستەکانی بەرەو حەوا هەڵبڕین و بە دەنگێکی تێکشکاو و قوڕگی گریاناوییەوە هاواری کرد، 'پیاوچاکان، برایان، خوشکەکانم، ئەی نەوەی ئیسرائیل، ئەو سیمبۆلەی نزیکەی سێ هەزار ساڵ پێش ئەمڕۆ لەگەڵ خۆماندا لە خاکی پیرۆزەوە هێنابوومان و جێگای فەخر و شانازیی ئێمە بوو، ئەو شۆفارەی هەموو ساڵێک ڕۆژی الحەسنامان پێ پیرۆز دەکرد، شکێنرا، دیارە خوای نەوەی ئیسرائیل وای خواستووە و ئیتر ئەو ڕووداوە بە ڕێکەوت نییە، نزا لە خوا دەکەم لێرە و لە تەواوی سەرزەمینی خۆیدا پشتیوانی ئێمەی کەمینە و لێقەوماو بێت.'

هەموو ئامادەبووان لەو گۆڕەپانەدا بە سۆفییەکانیشەوە بە کۆرس وتیان، 'ئامین.'

## ٢

سەرەتای مانگی هەشتی ساڵی ١٩٤٧، شەش مانگ دەبوو، سابات شووی بە حەکیم کردبوو، بەڵام هێشتا غەریبی و سۆزی بۆ پێنجوێن و دایک و باوک و خوشکەکانی نەڕەویبوونەوە، ژیانی لەگەڵ حەکیمی مێردی و لە شاری سلێمانی جێگای خۆیان لە دڵی ئەودا نەگرتبوو، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە نەیدەتوانی سوارە مەولوودی دڵخوازی لە خەیاڵی خۆی دەر بکات و شێوەی لە پێش چاویدا لا نەدەچوو، شەوانە دەهاتە خەونی و یادەوەرییەکانی لەگەڵ سوارەدا بەردەوام لە خەونەکانیدا دووبارە دەبوونەوە.

سوارە مەولوود، ئەو کوڕە گەنجەی هاوتەمەنی سابات خۆی بوو، باوکی دۆست و ناسراوێکی نزیکی ئەوڕامە جووی باوکی سابات بوو، ئەو دوو ساڵەی سابات و سوارە مەولود پەیوەندییان هەبوو، زۆربەی دانیشتووانی گەڕەکی جوولەکانی پێنجوێن بەو دڵدارییە کاڵوکرچەی ئەوانیان زانیبوو، کاتێک تەڵای دایکی سابات بە ئەوڕامە جووی مێردی وتبوو، ئەوڕام بە ساباتی کچی وتبوو، 'لە خەیاڵی خۆتی دەر بکە و قەت بەتەما نەبیت شوو بە کۆمەنیست یان موسوڵمانێک بکەیت.'

کاتێک مەولوودی چەرچیی باوکی سوارە خوازبێنیی ساباتی لە ئەوڕامە جوو کردبوو، لەناو بازاڕەکەی پێنجوێن و لەسەر شۆستەی بەر دوکانەکەی ئەوڕامدا پێکەوە وەستابوون، ئەوڕامە جوو لە مەولوودی چەرچی تووڕە بووبوو، دەستیان دابووە یەخەی

یەکتری و دوکاندار و مشتەری ئەو بازاڕەیان بەسەردا ڕژابوو، ئەوڕامە جوو هاواری لە مەولوود کردبوو، 'بە چ ڕوویەکەوە داوای کچ لە من دەکەیت، خۆت و کوڕەکەت خوانەناس و کۆمەنیستن، نابووت، سواڵکەر، نانت نییە بیخۆیت!'

دوو مانگ دوای ئەو ڕۆژە، باپیرە خایم لە لای ئەوڕامە جوو خوازبێنیی ساباتی بۆ حەکیمی کوڕی کردبوو، بەبێ ئەوەی سابات ڕەزامەندیی لەسەر بێت، داواکردن و گواستنەوەی بەسەردا تێپەڕی، سابات وشەیەک چییە نەیوت، پاشان بەبووکێنی بۆ شاری سلێمانییان برد، چەند مانگێک بەسەر هاوسەرگیرییاندا تێپەڕی و هێشتا سابات ڕێگای بە حەکیم نەدابوو وەکو مێردی دەستی بەر دەستی بکەوێت، حەکیمی نەدواند و تەنانەت بۆ جارێکیش چییە لێی نەڕوانیبوو.

کاتێک ئەم هەواڵە گەیشتەوە لای دایک و باوکی سابات، حەفتەیەک پێش ڕۆژی نەورۆز و لە دەمەو ئێوارەیەکدا ئەوڕامە جوو و تەڵای دایکی گەیشتنە گەڕەکی جوولەکانی شاری سلێمانی، ئەو ئێوارەیە تاوەکو دەمەو بەیانی پێکەوە قسەیان لەگەڵ ساباتدا دەکرد، هەوڵیان دابوو سابات بەوە ڕازی بکەن واز لەو خەیاڵەی بێنێت و سوارە مەولوود لە خەیاڵی خۆی دەر بکات، بەوە ڕازی ببێت ئەو ئێستا بەش و ژنی حەکیم خایمە، بە درێژاییی ئەو شەوە سابات هیچ وەڵامێکی دایک و باوکی نەدایەوە، بەردەوام فرمێسکی دەڕشت و سەری بەسەر کۆشیدا شۆڕ کردبووەوە، ڕۆژی دوای ئەو شەوە خایم داوای لە ئەوڕامە جوو کرد، کە بۆ چەند ڕۆژێک لەگەڵ خۆیدا سابات بۆ پێنجوێن بەرێتەوە، بەڵکو لەوێ بتوانن کاریگەرییان لەسەری هەبێت، بێجگە لەوەی خایم بە خەمی تەندروستیی ساباتەوە بوو، حەکیمی کوڕیشی بەردەوام ناڕەزایی و

بێزاری لای باوکی دەر دەبڕی و گلەییی لە سابات دەکرد.

ڕۆژی دوای ئـەو شـەوە سابات لەگەڵ دایـک و باوکیدا بۆ پێنجوێن گەڕایەوە، یەکێک لە خوشکەکانی ئەوەی بە سابات وتبوو، کە سوارە مەولوود پێنجوێنی بەجێ هێشتووە و ئێستا لە شاری سلێمانی دەژی.

دوای سێ ڕۆژ ئـەوڕام ساباتی لەگەڵ خۆیدا هێنابووەوە بۆ سلێمانی و پێکەوە چووبوون بۆ قەیسەریی نەقیب، کاتێک سابات و ئەوڕامە جووی باوکی گەیشتبوونە دوکانەکەی خایم، خایم و حەکیمی کوڕی پێکەوە لەوێ بووبوون، ئەوڕام سابات لەوێ بەجێ دەهێڵێت و خۆی هەر ئەو ڕۆژە دوای کڕینی پێداویستی، بەرەو پێنجوێن دەگەڕێتەوە، ئەو ڕۆژە بۆ یەکەم جار سابات سڵاو لە حەکیم و خایمی باوکی دەکات و دەیاندوێنێت.

چەند مانگێک بەسەر ئەو ڕۆژانەدا تێپەڕیبوو، حەکیم بەردەوام گلەییی ئەوەی لە سابات دەکرد، کە بێدەنگە و دەستڕەنگین نییە لە ماڵداریدا و ناتوانێت ئەو خواردنانە دروست بکات کە حەکیم حەزی لێیان بوو، ڕۆژانە کەتانی خوشکی خایم و ژنانی خزم و دراوسێ دەهاتن و لە ماڵداریدا ڕێنماییی ساباتیان دەکرد، هەوڵیان لەگەڵ سابات دەدا تاوەکو فێری بکەن چۆن کفتە و شفتە و یاپراخ و بەتایبەتی برنج و ساوەر و شۆربا بۆ حەکیمی مێردی و خایمی خەزووری دروست بکات.

سابات لە مـاڵداریدا دەستڕەنگین نـەبوو، بـەڵام لە چنین و دروومان‌دا لێهاتوو بوو، ئەو دوانیوەڕۆیە سابات خەریکی چنینی بەڕەیەک بوو، لەو کاتەدا و لە خەیاڵیدا لەگەڵ خوشکەکانیدا دەدوا، خوشکەکانی سابات تاوەکو ئەو ڕۆژە لەسەر ماڵ بوون و شوویان نەکردبوو، هەروەها شێواز و چاوە ڕەشەکانی سوارە مەولوود لە

ڕووی بەرە ڕەنگاڵەکەدا بەردەوام دەدرەوشایەوە، ناوبەناو ئەمەی بە خۆی دەوت، 'حەکیم لە سوارە بەهەیبەتتر و دەستڕەنگینترە.'

'سابات، سابات، ئەریٚ ژنەکە تۆ لەکوێیت؟'

حەکیم لە حەوشەی ماڵەکەیاندا وەستابوو، هەردوو دەستی نابووە کەمەری و لە قاتی سەرەوەی دەڕوانی و لەپەسا بانگی لە سابات دەکرد، 'سابات، هۆ سابات.'

کاتێک سابات بەهەڵەداوان هاتە بەر هەیوانەکە و وەڵامی حەکیمی مێردی دایەوە، حەکیم بەردەوام بوو، پێی وت، 'لێقەوماوێک بە ناوی خینۆ قەدووری بە ژنێک و چوار منداڵەوە لە بەغدادەوە هەڵهاتووە و لە کنێسەت بەمۆقەت داڵدە دراون، حاخام ئەمڕۆ داوای لیٚ کردین، کە هەرکەسەو لای خۆیەوە و بەگوێرەی توانای خۆی هاریکاریی ئەو خێزانە لێقەوماوە بکات، منیش بە سلێمان خینۆم وت، کە ئەم ئێوارەیە خۆت و ماڵ و منداڵت بۆ نانخواردنی ئێوارە لە ماڵی ئێمەن.'

'ئەریٚ حەکیم، خۆت دەزانیت ئەمڕۆ ڕۆژی شەممەیە، نەختێک یاپراخی گەلامێوی دوێنیٚ شک دەبەم، خۆ خوانەخواستە بەنیاز نیم بەم ڕۆژی شەممەیە ئاگر بکەمەوە و خواردن بۆ میوان حازر بکەم.'

'بەخوا ژنەکە، ئیتر بووم بە قسەی خۆمەوە و گفتم پیٚ دان، کوڕە خوا گەورەیە و پەک ناکەوێت، ئەوە من دەچم بۆ سەرشەقام بۆ ماڵی مۆردەخای بڕێک شەراب و عارەق دێنم، وا بزانم عارەقمان نەماوە، دەڵێم سابات، دەی شەراب، خۆ وا بزانم شەرابیشمان نەماوە؟'

'نەخێر، ئەریٚ خۆ تۆ کردت بە ڕاست، توخوا حەکیم بەم ڕۆژی شەممەیە کەی کاتی میوانە!'

لەو کاتەدا خایم لە دەرگای ژێرخانەکەیانەوە هاتە دەرەوە، لەو

دەرگا دارە قوببەڕێژکراوەی دەکەوتە سەر حەوشەکە و لەوێوە دەچوویە ناو دالانی قاتی یەکەمی ئەو بالاخانەیە، دوو شفرەی پەیکەرتاشینی بەدەستەوە بوو، سەرسنگ و شەروالەکەی بە تۆز و تەلەزمی تەلاشەدار داپۆشرابوو، وەکو پێشتر گوێی لە لێدوانەکەی سابات و حەکیمی کوڕی بووبێت، سەری هەڵبڕی بۆ قاتی سەرەوە و لە ساباتی ڕوانی و وتی، 'بۆ دەستگیرۆییکردنی لێقەوماوان دەرگامان کراوەیە، ئەرێ ڕۆلە سابات خۆ گوێت لە حەکیمی مێردت بوو، دەڵێت لێیان قەوماوە و دەربەدەر بوون، خۆ ئەو قوڕبەسەرانە بەتایبەتی ئەمڕۆیان هەڵنەبژاردووە، تاوەکو تێیدا لەدەست زوڵم و زۆرداری لەسەر ماڵوحاڵی خۆیان هەڵبێن، پەک ناکەوێت ڕۆلە گیان.'

سابات بەبێزارییەکەوە سەیرێکی حەکیمی مێردی کرد و هەردوو دەستی لێ پان کردەوە، ڕووی وەر گێڕا و بێدەنگ چووە ژوورەوە.

خایم لە حەکیمی کوڕی ڕوانی و پێی وت، 'دەی کوڕم تۆ بچۆ بەلای ئیشتەوە، وا من تەواو دەبم و دەچمە سەرەوە و تێی دەگەیەنم.'

ئێوارەی ئەو ڕۆژە، سابات لەناو دەرگای چێشتخانەکەدا بێدەنگ بەپێوە وەستابوو لە کەتانی خوشکی خایمی دەڕوانی، لەو کاتەدا کەتان لە تەشتێکدا خەریکی شۆردنەوەی کەوەر و کەرەوز و تەرەتیزە بوو، کەتان لەبەرخۆیەوە وتی، 'ڕۆلە گیان، نانێکی زۆر و سەوزە و مەنجەڵێک یاپراخ، ئیتر خۆ شەممەیش نەبووایە و ئاگریشمان بکردایەتەوە هەر ئەوەندەمان پێ حازر دەکرا.'

'چی بکەین ئیتر، میوانی ناوەخت گلەیی لەسەر خۆیەتی.'

'ئەمڕۆ لە ناوشار خۆپیشاندان بووە!'

'دیسان!'

'یەعقووب وتی، خەڵک دژی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان ناڕەزاییيان دەر بڕیوە.'

'بڕیاری چی؟'

'گوایا وڵاتی فەلەستین بەسەر جوولەکە و عەرەبە موسوڵمانەکاندا دابەش دەکەن.'

'جا فەلەستین لەکوێ و خەڵکی ئەم شارە لەکوێ، ئەمان حەقیان چییە بەسەرەوە، حاڵی پاشەڵی خۆیان زۆر جوانە!'

'یەعقووب دەیوت بە هۆی ئەو بڕیارەوە، لە سەرانسەری عێراقدا دەنگی ناڕەزایی و توندوتیژی بەرامبەر بە جووەکان ڕوو لە زیادبوونە.'

'باوەڕ ناکەم خەڵکی ئەم شارە ئێمەی جوو بکەنە ئامانج! لە شارەکانی تری عێراق جووەکان سەدان ساڵە دژایەتی دەکرێن و زوڵمیان لێ دەکرێت!'

'بەخوا ئیتر چی بکەین ڕۆڵە گیان، خوا خراپتر نەیات.'

کاتێک سفرەی نانخواردنەکە ڕاخرا، خینۆ قەدووریی میوان وتی، 'بارودۆخەکە تا بێت ئاڵۆزتر دەبێت، ئیتر خۆ هیچ چارێکی ترمان نەماوە لەوە زیاتر، کە خۆمان ناونووس بکەین،ماڵمان تیا چوو تاکو سەریشمان دانەناوە.'

حەکیم بەبێ ئەوەی لە میوانەکەی بڕوانێت، دوو چڵ کەوەری خستە دووتوێی پارچەیەک نانەوە و بەدەم خواردنیەوە پرسیی، 'ئەرێ کاک خینۆ، چۆن میری هێشتی بگاتە ئەوەی شۆڤێنستەکان ئەو کارە دەرحەق بە ئێوە بکەن، چۆن و چی ڕووی دا برا؟'

'من ئەوە بیست ساڵە لە گەڕەکی تەوراتی شاری بەغداد دەژیم و دوکانەکەشم دەکەوێتە سەر حەوشەی ماڵەکەم، بەخوا من ئاگاداری هیچ نەبووم، ئەوا بوو بە پێرێ، عەرەبەکان هەڵیان کوتایە سەرمان

و ماڵ و دوکانەکەیان تالآن کردم و پاشان بە بەرچاوی خۆمانەوە ئاگریان تێ بەر دا، هەر بەوەشەوە نەوەستان و هێرشیان کردە سەر خۆم و ماڵ و منداڵم، کوڕە ئەگەر چەند خێرخوازێک نەبوونایە لەویا دەیانکوشتین.'

خایم لێی پرسی، 'دەی بۆچی شکایەتت لێ نەکردن و بەگرتت نەیان؟'

'قوربان تۆ ئاگات لە چییە، شکایەتی چی و بەگرتدانی چی، جا شکایەتم لە چەند کەس بکردایە، خوا ئاگادارە لە دوو ساڵی ڕابردوودا دوو جار شکایەتم لە چەند کەسێک کردووە، کە ئیهانەیان کردبووم و بە ڕۆژی نیوەڕۆ هاتبوونە سەر ماڵ و دوکانەکەم، بەڵام ئاخیرەن هەر خۆم مەجبوور بووم پەشیمان ببمەوە و پاشان قەرزارباریشیان کردم، ئیتر لە شاری بەغداد و بەتایبەتی لە مەخفەری پۆلیس کەس بە دەنگی ئێمەی جوولەکەوە نایەت!'

'ڕووداوەکان هەموو بە ئاراستەیەکی نادروستدا دەڕۆن، بەرەو ئاراستەیەک، کە ئێمەی جوولەکە لەگەڵی نین و هەمووومان زەرەرمەند دەبین، ئەمانە هەمووی پلانە و لەلایەن زایۆنیستەکانەوە پێشوەخت و بەردەوام کاری بۆ کراوە، بێجگە لەوەی عەرەبە شۆڤێنیستەکان بە بەرنامە تاوانەکان ئەنجام دەدەن.'

خایم لە کاتێکدا ئەمەی وت، هەموو بێدەنگ بەدەوری سفرەی نانخواردنەکەدا دانیشتبوون و چاوەڕوانیان دەکرد ئاخۆ کەی ئەو سینییەی یاپراخەکەی لەسەر هەڵڕێژرابوو دەگات، لەو کاتەدا، کەتان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و لەژێر لێوەوە، 'دەی خوا ڕەحممان پێ بکات.'

# ٣

'ماڵت بە قوڕ گیرێت مام ئەمین، ئیتر خۆ ئەوە ڕاستە، کە دەڵێن تێر ئاگای لە برسی نییە!'

کاتێک نازدار ئەمەی لەبەرخۆیەوە وت، لەگەڵ کەتاندا لە تەنیشتی یەکەوە لەژێر کەپرێکدا دانیشتوون، لە دامێنی باخەکەی ئەمینی مریەمدا چوار دار چەقێنرابوون و بە چەند چڵەدارێکیش ڕاست و چەپ لە سەرەوە پێکەوە بەسترابوون، دوو حەسیری کۆنی دڕاوی بەسەردا گیرابوو، کرێکارەکان شەش ژن و دوو کوڕی گەنج بوون، لەو کاتەدا ژنەکان لە کار تەواو بووبوون و چاوەڕوانی ئەمینی مریەمی خاوەنی باخەکەیان دەکرد، دوو کوڕە گەنجەکەش سەوزە ڕنراوەکەیان خستنبووە دووتوێی شەڵتەیەکەوە و لە پشتی کەرێکیان نابوو، لەوەدا بوون بۆ بەر بەلەدییەکەی ناو شار بەڕێ کەون، کرێکارەکان ڕۆژی پێنجشەممان چاوەڕوانی خاوەن کاریان دەکرد، تاکو بێت و کرێی کارەکەیان پێ بدات، دوو کوڕە گەنجەکە بە کەر و بارەوە ڕۆیشتن، دوای ئەوە زیاتر لە دوو کاتژمێر ژنەکان لە ژێر کەپرەکەدا چاوەڕوان بوون، نازدار و کەتان بە جیا و دوور لە ژنەکانی تر پێکەوە دانیشتبوون. نازدار لەبەرخۆیەوە وتی، 'خوا بەخێرت نەهێنێتەوە مام ئەمین، دە وەرە و حەق و حیسابمان پێ بدە با فریای بازاڕ بکەوم کیلۆیەک برنج بۆ ئەو هەتیوانە بکڕم.'

نازدار ئەو کات وەکو کەتان بە سێ منداڵەوە لە ماڵی ئەمینی مریەمی باخەواندا ژوورێکی بە کرێ گرتبوو، خۆی ئاوای بۆ کەتان

گێڕابۆوە، کە دوای مردنی خولە پیرانی مێردی، لە دێی ئاروزەری ناوچەی شارباژێڕەوە لەگەڵ منداڵەکانیدا هاتبووە شاری سلێمانی و لە ماڵی خانمی سەعەی سەمەموون ژوورێکی بە کرێ گرتبوو، کاتێک لەوێ کرێی ژوورەکەی لەسەر گران دەکەن، مام ئەمینی خاوەن کارەکەی ژوورێکی بە کرێ دەداتێ، پێشتر نازدار لە دێی قۆخەمامۆی سەر بە شاری ئارمردەی کوردستانی ڕۆژهەڵات ژیابوو، دایکی دوو کوڕ و کچێک بوو، نۆبەرەکەی ناوی ڕەسوڵ بوو، هاوتەمەن و هاودەنگی سالاری کوڕی کەتان بوو، ئەویش وەکو کەتان لەسەر کار و لەناو گەڕەک و ژنانی دەرودراوسێدا خۆی بە غەریب دەزانی، نازدار بە قسەکانیدا دیار بوو، کە خەڵکی ڕۆژهەڵاتە و لە گەڕەک و سەر کارەکەی بە ژنە ئێرانییەکە ناسراو بوو.

لەژێر کەپری باخەکەی مام ئەمیندا نازدار باسی ئەوەی بۆ کەتان دەگێڕایەوە، کە بەنیازە ژن بۆ ڕەسوڵی کوڕی بێنێت، کاتێک کەتان لێی پرسی، 'جا بە چی ژنی بۆ دەهێنیت، تۆ پارەی شیربایی و زەماوەندت لەکوێ بوو؟'

'کوڕە، ئامینی کچمی بۆ دەیەم بە شوو.'

'چۆن؟'

'یانی، ژن بە ژن!'

'ئەمە کەی بەتەمان؟'

'بەخوا ئیتر قسەمان لێ کردووە و بزانین کەی خوا بۆمان ڕێک دەخات.'

'خوشکی خۆم، نازدار گیان، پەلەی لێ مەکە و ئامینی کچت هێشتا زۆر منداڵە!'

'دەزانم خوشکێ، قوڕ بە سەرم، دەڵێم با ژن بۆ ئەو هەتیوەم

بێنم بەشکێکم بۆ خۆی بێقرە دانیشێت.'

'لەگەڵ کێ ژن بە ژنی بۆ دەکەیت؟ کەسی نێزیک و خزمی خۆتن؟'

'کوڕە، ناشکوری نەبێت لای خوا، قوڕبەسەرێکی وەکو من لەم ولاتە خزم و کەسم لەکوێ بوو، ڕەسوڵ خۆی دۆزیوێتییەوە و ئا ئەوەتا لەولا ماڵی خۆمانەوەن، دەڵێن خوشک و برایەکی تەنیان. ئەوانیش وەکو ئێمە لێقەوماون.'

'ئێ، ئێ خێری پێوە بێت.'

'چی بکەم خوشکی خۆم، ئەوە عەلیی کوڕم دوو حەفتە دەبێت بووە بە شاگردی نانەواخانە، بەخوا ئەوەی عەلی حەفتەی یەکەم بەشاگردی پەیای کردبوو، لە دەستی دەر هێناین و هەر نەمزانی چۆن تەفروتووناى کرد، ئیتر دەڵێم با ژنی بۆ بێنم و بەڵکو ئەمە خوایە خوو بداتە کار و کاسپی!'

'نازدار گیان، خۆزگە کاتی خۆی ئەو منداڵانەت دەنارده بەر خوێندن، ئێستا ئەوانیش وەکو سالاری من بۆ خۆیان دەبوونە خوێنەوار.'

'کوڕە خوێندنی چی، قوڕ بە سەر باوکیان، بەخوا کاتێک هاتمە ئەم شارە تاوەکو چەند ساڵێکیش خێر و سەدەقەی دەرودراوسێ نەبووایە نانمان نەبوو بیخۆین و منداڵەکانم لەبرسان دەمردن.'

'دەزانم نازدار گیان، خۆم دەردی بێپیاویم زۆر چەشتووە.'

'ماڵی ئەمینی مریەم ئاوەدان بێت و خوا خێری بنووسێ، ئەو تەنیا ژوورەی پێ دام.'

دوای ئەوەی نازادر ئەمەی وت، کەتان تاوێک بێدەنگ ڕووی لێ وەر گێڕا، بەبێ ئەوەی بیەڵێت هەستی پێ بکات، چەند دڵۆپە فرمێسکێک بەسەر ڕوومەتەکانیدا هاتنە خوار، دیار بوو نازداریش

لەو کاتەدا لەناو خەیاڵەکانی خۆیدا نوقم بووبوو، کەتان ئاوڕی لێ دایەوە و ویستی بە نازدار بڵێت، 'نازدار، ئەو خانووەی ئەمینی مریەم، کە ئێستا پێنج خێزانی تێدا دەژی، ئەوەماڵومڵکی باوکی من بووە و ئێستا ئێمە خۆمان لێی بێبەری بووین و من وەکو کرێچی تێیدام!'

لەو کاتەدا نازدار سەری داخستبوو، بێدەنگ لە بەر پێیەکانی خۆی دەڕوانی و بە لچکی فەقیانەکەی چاوی وشک دەکردەوە، پاشان کەتان دەستی خستە سەر ڕانی و لەبەرخۆیەوە پێی وت، 'خوشکێ گیان، با بڕۆینەوە، وا خەریکە تاریک دادێ و تازە مام ئەمین و عەبدوڵلای کوڕی نایەن.'

کرێکارەکان توولەڕێگای قەراغی جۆگەلەی تەنیشتی باخەکەیان گرتە بەر و بەرەو ماڵەوە کەوتنە ڕێ، لە سەروو باخەکانی بۆگەنەوە کاتێک ویستیان لە یەک جیا ببنەوە و کەتان و نازدار بەرەو گەڕەکی جوولەکان و ئەوانی تریش بۆ چوارباخ بڕۆن، مام ئەمین لە دوورەوە بانگی لێ کردن، نازادر و کەتان پێش ژنەکانی تر گەیشتنە لای و دوای ئەوەی سڵاویان لە یەکتری کرد، هەر یەکەیان شەش پەنجایی مافی کاری ئەو حەفتەیەی وەر گرت.

پاشان کەتان و نازدار وەکو پیشەی هەموو ڕۆژێکیان، دوای تەواوبوون لە کاری باخەوانی، چەند خڕەبەردێکیان لە دەوروبەری باخەکان کۆ کردەوە و بەڕێگاوە بەردەکانیان لەناو لەپی دەستیان توند دەکرد، وەکو باوەڕیان بە هەستی بەرکەوتنیان نەبێت، یان دوودڵ بن لەوەی ئاخۆ بەردەکان هێشتا لەناو دەستیاندا ماون و لێیان نەکەوتووە، زوو زوو لەناو لەپی دەستی خۆیان دەڕوانی، لە باخەکانی بۆگەنەوە و بە گردی مام هەباسدا و بەتەنیشت باخی گەورەدا تێدەپەڕین، تاوەکو دەگەیشتەوە سەر چەمی جوولەکان

و خۆیان دەکرد بە کۆلانەکانی گەڕەکدا، هەردووکیان زوو زوو دەوەستان و بە چواردەوری خۆیاندا دەیانڕوانی و تاوتاویش رایان دەکرد، بەترسەوە و زوو زوو چاویان بۆ مندالانی گەڕەکی چوارباخ دەگێڕا، ئەو مندالانەی ڕۆژانە لەسەر ڕێگایاندا دەوەستان و بەردبارانیان دەکردن، کەتان و نازدار بەردیان نەدەگرتەوە مندالەکان، هەرچەندە زوو زوو دەستیان لێ بەرز دەکردنەوە، بەلام بەردەکانیان لەناو دەستیاندا دەهێشتەوە، جارێکیان کەتان لەبەرخۆیەوە بە نازداری وتبوو، 'نا نا، تێیان مەگرە، نەکەی مالخراپ، دەی ئەگەر یەکێکیان پێکرا، ها، ها، دەی ئەوسا چی بکەین و قوڕی کوێ بکەین بە سەرماندا!'

هەموو جارێک ناچار بوون لە دەستیان ڕابکەن و خێرا خۆیان بگەیەننەوە ناو کۆلانەکانی گەڕەکی جوولەکان.

## ٤

دوانیـوەڕۆی ڕۆژی پێنجشەممە، ڕێکەوتی ٣٠ی١٠ی ساڵی ١٩٥٨بوو، سالار قاتێک جلی ڕانکوچۆغەی لەبەر کردبوو، مشکییەکی بە ڕاست و چەپدا لە سەریەوە پێچابوو، لەبری ئەو کلاوەی کەتانی دایکی بۆی چنیبوو، کیپا کۆنەکەی باوکی بەدزیی دایکییەوە دەر هێنا و لەسەری کرد و مشکییەکەی بەسەردا بەست، ئەو کیپایەی یەعقووبی باوکی ئەستێرەیەکی داودیی بە دەزووی شین لەسەر چنیبوو، کاتێک دایکی پێی وت، 'ئەیەڕۆ سالار ئەو کلاوەت بۆچی لەسەر کردووە، دەی ناترسیت خەڵک بتبینێت؟'

سالار لەو کاتەدا بە مووکێشێک تاڵی موووەکانی بەینی برۆکانی دەر دەهێنا، بێ ئەوەی ئاوڕ لە دایکی بداتەوە، 'نا، نا، دایکە خەمت نەبێت، خەڵکی ئەم شارە توانای بیرکردنەوەیان کەم بڕ دەکات و زۆر زوو شتیان لەبیر دەچێتەوە!'

'ئەری کوڕە گیان، ئەوە خۆ پێنج بۆ شەش ساڵ پێش ئێستا بوو، خۆ ئەو خەڵکە کەروێشک نین تاوەکو ئەوەندە زوو شتیان لەبیر بچێتەوە.'

'ئەوە بۆ ساڵێکیش دەچێت یەکێکم نەبینیوە لەم شارەدا تەنها کەلیمەیەک چییە لەو بارەوە بڵێت، یان نووسەرێک لە ڕۆژنامەیەک یان گۆڤارێکدا بچووکترین ئاماژەی پێ بدات، هەر وەکو هیچ ڕووی نەدابێت، ئیتر ئەمانە ئەگەر لە توخمی کەروێشک نەبن دەبێت چی بن، کابرا تۆ لە شارەکەتدا لە کۆی حەوت گەڕەک گەڕەکێک چۆڵ

کرا، سەدان کەس لە دانیشتووانی یەکێک لە گەڕەکەکانت سەڵت و ڕووت بەزۆر شاربەدەر کران، بەبێ ئەوەی کەسێک لەم شارەدا پێی دڵگران بووبێت یان بەئاشکرا ناڕەزایی خۆی دەر بڕیبێت!'

'کوڕە چۆن ڕۆڵە گیان، بەخوا خەڵکی ئەو چوارباخ و سەرشەقامە بەدوایاندا گریابوون.'

'ئێ بزانە لەو کاتەدا تەنها جێگای بەزەیی بوون، باپیرە خایم بۆی گێڕامەوە، کە کاتێک لەم گەڕەکەدا جووەکان ڕاگوێزران و سواری لۆری کران، ئەو ڕۆژە ڕۆژنامەی ژین لە لاپەڕەی یەکەمیدا شیعرێکی عەبدوڵلا گۆرانی بڵاو کردبۆوە، شیعرەکە باسی گوڵ و دڵ و شیر و تیری کردبوو، لاپەڕەی دووەم ئەحمەد هەردی و ئیتر فڵان و فیسار نووسەر لەسەر عەشق و ئەوین نووسیبوویان، خوا نەکات ئەو ڕووداوانە کاریگەریی لە یەکێک لەو نووسەرانە کردبێت، ئیتر بڕوانە، ئەوەیە ماڵوێرانی و کارەسات، ئەگەر ئەوانە چاوساغ و ڕێبەری میلەتی کورد بکەن!'

'توخوا سالار گیان واز لەو بەیت و بالۆرانە بهێنە، با تووشی سەرئێشە نەبین!'

'چۆن دایکە گیان ئەوانە ڕاستین و پێویستە بوترێن، ئەگەر کەسێکی وەکو ئەو شاعیرە نیشتمانپەروەرانە هەست بە ئازاری میلەتەکەی خۆی نەکات، ئیتر خۆ ئێمەی جوو بەتەمای مەلاکانیش نین لە وتارێکی هەینیاندا ئاماژە بەو زوڵمە بکەن.'

'جا سالار گیان شاعیرەکانیش هەموویان مەلا نین؟'

'نا نا، چۆن؟ هەندێکیان مێزەرەکانیان فڕێ داوە و ئێستا چاکەت و پانتۆڵ لەبەر دەکەن!'

'کوڕی خۆم، ئەوان موسڵمانن، چیان یاوە بەسەر ئێمەوە، بگرە لەوانەیە پێشیان ناخۆش بێت، بەڵام دەسەڵاتیان نەبێت و نەوێرن!'

'دایه گیان تۆ ڕاست دەکەیت، پێ دەچێت هەر ئەوەش هۆکار بێت!'

کاتێک ئەمان لە گەرمەی دەمەتەقێدا بوون، باپیرە خایم لەگەڵ سارا و مەحموودی کوڕەزایدا بە قاڵدرمەکاندا هاتبوونە سەرەوە، بێ ئەوەی سالار و دایکی ئاگایان لێی بێت، باپیرە خایم دەرگای ژوورەکەی کردەوە و لە سالاری ڕوانی و لەبەرخۆیەوە وتی، 'کوڕێ گیان، ئامادەیت بڕۆین؟'

کەتان لە خایمی برای ڕوانی، 'کاکە، ئا بزانە سالار چیی لە ژێر ئەو مشکییەوە لەسەر کردووە؟ دەستم بە دامانت با تووشی دەردیسەریمان نەکات!'

باپیرە خایم دەستی خستە سەر شانی سالار و لە کڵاوەکەی ڕوانی، لە کاتێکدا سالار نەزانانە مشکییەکەی بەسەردا بەستبوو، دەستی برد و مشکی و کڵاوەکەی لە سەری سالار کردەوە، 'ئەرێ برا مشکی چۆن وا دەبەسترێت؟'

چووە بەردەمی سالار و وەستا، دوای ئەوەی تاوێک بەبێدەنگی لە کڵاوەکەی ڕوانی، لەو کاتەدا حەکیم و ساراش هاتبوونە شانی باپیرە خایمەوە و سەرنجیان لە کڵاوەکە دەدا، بێ ئەوەی هیچ بڵێت کڵاوەکەی کردەوە سەری سالار و مشکییەکەی بۆ بەست، پاشان دەستی هێنا بە یەخەی چۆغەکەیدا و قۆپچەی چۆغەکەی بۆ داخست.

کاتێک مەحموود و باپیرە خایم لەپێش سالار و ساراوە لە دەرگای حەوشەکە چوونە دەرەوە، سارا دەستی هێنا بە پشتیدا و لەژێر لێوەوە بە سالاری وت، 'سالار گیان زۆرت لێ جوانە.'

باپیرە خایم بۆ ئەو ڕۆژە جیبێکی بە کرێ گرتبوو، بۆ پێشوازیکردنی موستەفا بارزانی، بەنیاز بوون بچن بۆ سەر چەمی

قلیاسان و دەروازەی شار، کە بڕیار وا بوو ئەو ڕۆژە سەردانی سلێمانی بکات.

کاتێک فەرەج هەورامیی سایەق لە گەڕەکی جوولەکانەوە بۆ سەرشەقام و بۆ بەردەمی باخی گشتی شار جێبەکەی لێدەخوڕی، ئەمبەر و ئەوبەر جادەکان پڕ بوون لە منداڵ و گەنج و پیر و زۆربەیان جلی کوردیی نوێیان پۆشیبوو، فەرەج هەورامی لەبەرخۆیەوە دەستی کرد بە شانامەوتن بەسەر مستەفا بارزانیدا و جارجار شیعرێکی قانعی شاعیری دەخوێندەوە، بێجگە لەوە منداڵان پۆل پۆل دەڕۆیشتن و بەکۆرس سروودیان دەخوێند.

کاتێک گەیشتنە دووڕیانەکەی بەکرەجۆ، زۆربەی خەڵکی شار لەوێ بوون، منداڵانی قوتابخانەکان بە ڕیز ئەمبەر و ئەوبەری جادەکەیان گرتبوو، ئیتر هەر گرووپە و لە ئاوازێک دەیخوێند، کاتێک لە جێبەکە دابەزین، سارا لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەوە چییە دەڵێی نەورۆزە!'

خەڵکەکە دەیانوت، موستەفا بارزانی گەیشتۆتە چەمچەماڵ.

پێش خۆرئاوابوون، کاتێک زۆربەی منداڵەکان ماندوو بووبوون و هەندێک لە خەڵکەکە لەو دەشتودەرە دانیشتبوون، لە دوورەوە بوو بە هۆڕینلێدان، کاتێک بەرایی سەیارەکان گەیشتنە لای ئەمان، خەڵکەکە ڕێگەیان لە سەیارەکان گرت، هەزاران کەس و سەدان سەیارە لەوێدا تێکەڵ بە یەکتری بوون، کاتێک پۆلیسەکان بڵاوەیان بە خەڵکەکە کرد و سەیارەکان بە بەردەمی ئەماندا تێپەڕین، سالار لە باپیرە خایمی پرسی، 'باپیرە، کامیان موستەفا بارزانی بوو؟'

'من بینیم!' کاتێک باپیرە خایم ئەمەی وت، بێدەنگ بۆ لای جێبەکەی فەرەج هەورامی بەڕێوە بوون.

فەرەج هەورامی بەدوای کاروانی سەیارەکانی موستەفا بارزانیدا

جێبەکەی لێخوڕی، خەڵکەکەش بە پێ لە بەینی سەیارەکانەوە بەڕێوە بوون و گەورە و بچووک بەتەنیا و بەکۆمەڵ هاواریان دەکرد و سروودیان دەخوێند، فەرەج هەورامی باڵی لە پەنجەرەی جێبەکەیەوە دەر هێنابوو، هێواش بەدوای ئەو خەڵکەدا بۆ ناو شار لێی دەخوڕی، کاتێک گەیشتنەوە بەردەمی قەسرەکەی تۆفیق قەزاز، دابەزین و باپیرە خایم ڕوبعێکی کردە دەستی فەرەج هەورامییەوە و سوپاسی کرد، لەبەرخۆیەوە وتی، 'دەڵێن چی بچین نانوکەبابێک بخۆین؟'

پێش ئەوەی لا بدەن بۆ بەر بەلەدییەکە، تێکڵاوی کۆمەڵێک منداڵی تەمەن هەشت بۆ نۆ ساڵان بوون و ئەوانیش لە شانی منداڵەکانەوە دەڕۆیشتن، منداڵەکان بەکۆرس سروودی ئەی ڕەقیبیان دەخوێند، حەکیم و باپیرە خایم لایان دایە سەر شۆشتەکە و سالار و سارا دەستی یەکیان گرت و بە دەنگی بەرز لەگەڵ منداڵەکاندا چەند دێڕێکیان وتنەوە:

"ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین
سەیریکە خوێناوییە ڕابردوومان
ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەی خوسرەوین
دینمان ئاینمانە نیشتمان"

کاتێک مەحموود و باپیرە خایم ئاوڕیان لێ دانەوە، سالار و سارا دەستیان لێک بەر دا و منداڵەکانیان بەجێ هێشت، پاشان لایان دا بۆ بەر بەلەدییەکە و لەوێوە بەرەو گوزەری قەسابەکان چوون، کاتێک خۆیان کرد بە کەبابخانەکەی نیزامە شەلدا و چوون لەسەر مێزێک دانیشتن، باپیرە خایم هەڵسا و چوو بۆ لای وەستا نیزام و داوای لێ کرد چوار نەفەر کەبابیان بۆ دروست بکات، وەستا

نیزام بەدەم لێدانی شیشە کەبابەکانەوە پرسیی، 'ئەرێ وەکو بزانن موستەفا بارزانی گەیشت؟'

پێش ئەوەی باپیرە خایم وەڵامی بداتەوە، گەنجێک هاتە ناو کەبابخانەکە، دیار بوو سەرنجی باپیرە خایمی ڕاکێشابوو، چونکە بەسەرنجەوە لە گەنجەکەی دەڕوانی و پاشان بەرەو پیری چوو، لەبەرخۆیەوە وەڵامی نیزامی کەبابچیی دایەوە، 'بەڵێ گەیشتووە!'

باپیرە خایم دوای ئەوەی چۆنی و چاکیی لەگەڵ گەنجەکەدا کرد، پێکەوە هاتن و لە تەنیشتی مێزەکەی سالار و سارا و مەحموودەوە وەستان و لەبەرخۆیەوە وتی، 'کوڕگەل گیان، سارا ڕۆڵە، ئەمە میرزا حەسەنە.'

'ئەوە سەبەب چییە ئاوا خۆتان گۆڕیوە، بەتەمای چین؟'

کاتێک میرزا حەسەن قەرەداغی ئەمەی وت، کورسییەکی لەولا مێزەکەی ئەوانەوە هێنا و پێکەوە دانیشتن، سالار لە وەڵامدا وتی، 'قوربان، لە پێشوازیی موستەفا بارزانی بووین.'

'نەیشمان بینی!' سارا لەژێر لێوەوە ئەمەی وت، باپیرە خایم دەستی خستە سەر شانی میرزا حەسەن و ڕووی کردە نیزامی کەبابچی، 'وەستا نیزام، بزانە میرزا چی دەخوات.'

'کەباب، کەباب، حەیاتم، جا قابیلە لای نیزام لە کەباب زیاتر چیمان دەست دەکەوێت؟'

'ئەرێ میرزا گیان، وەکو بزانیت مەلا موستەفا چەند ڕۆژ لێرە دەمێنێتەوە؟'

'ئەوەندەی من زانیاریم هەبێت، سێ ڕۆژ لێرە دەبێت، ئێستا بەڕێزی لە ماڵی شێخ لەتیف دابەزیوە.'

'خۆزگە دەمان بینی.'

'جا کاک سلێمان، دوای ئەوەی کەبابەکەمان خوارد دەچین بۆ

ماڵی شێخ لەتیف.'

مەحموود لەو کاتەدا بەسەرسامییەوە لە باپیرە خایمی ڕوانی و لەبەرخۆیەوە وتی، 'کاک سلێمان؟'

تاوێک بەبێدەنگی سالار و ساراش لە باپیرەیان ڕوانی و ئەویش چاوێکی لێ داگرتن و دەستی خستە سەر دەستی مەحموود و لەبەرخۆیەوە وتی، 'دەڵێم میرزا ئەگەر بچین بۆ ماڵی شێخ لەتیف، چاومان بە موستەفا بارزانی دەکەوێت!'

'کورە بەخوا کاک سلێمان ئەوەی پێی هەبێت و بتوانێت بڕوات ئێستا لەوێیە، ئێستا خۆم لەوێ بووم، تف هەڵدە ناکەوێتە سەر ئەرز، جا ئیتر پیاو نەچێت باشترە، جا برا ئەو زاتە سبەی و دوو سبەیش لێرەیە، ئێستا لەبەر شێخ و ئاغاکان بەر ئێمەی مسکێن ناکەوێت، هەر ڕێگاشمان نابێت بچینە ژوورەوە.'

تاوێک بێدەنگی دایگرتبوون، سەر مێزەکەیان دوو قاپی پڕ لە کەوەر و قاپێک تەماتەی قاژکراو دانرابوو، بێجگە لەو پێنج قاپەی هەریەکە و چوار شیش کەبابی لەسەر بوو. کەبابخانەکە دوو مێزی تری هاوشێوەی ئەو مێزەی ئەوانی تێدا بوو، لە سووچێکەوە دەستشۆرێک و وێنەیەکی عەبدولکەریم قاسم بەسەر دەستشۆرەکەوە بەخواری هەڵواسرابوو، کوڕێکی منداڵکاری سوورکار لە تەنیشتی وەستاکەیەوە لەسەر مێزێک خەریکی پیازجنین بوو، وەستا نیزامی کەبابچی کابرایەکی کورتەباڵای ڕەقەڵەی سەر ڕووتاوە و سمێڵڕەش بوو، دوو ساڵ بوو لە کەرکووکەوە هاتبووە سلێمانی و ئەو کەبابخانەیەی دانابوو، خەڵکی ئەو گوزەرە پێیان دەوت کەبابخانەی حەیاتم، دوای ئەوەی نانیان خوارد و بۆ ماڵەوە گەڕانەوە، سارا لە باپیرە خایمی پرسیی، 'باپیرە، لەلای خەڵکی بێگانە ناوت سلێمانە؟'

باپیره خایم وەکو گوێی لە پرسیارەکەی سارا نەبووبێت، قۆڵی لە قۆڵی سالاری خوشکەزای هەڵپێکابوو، بێدەنگ دەڕۆیشت و لە دووری دەڕوانی.

سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوای ئەو ڕۆژە باپیرە خایم لەناو مزگەوتی گەورەدا و لەبەردەم دەرگای قەبری شێخ مەحموودا کاتژمێرێک دەبوو وەستابوو، ئەوانەی لەو ڕیزەدا بۆ پێشوازیی موستەفا بارزانی وەستابوون، بێجگە لە باپیرە خایم، هەموویان مەلای مزگەوتەکانی ناو شاری سلێمانیٔ بوون، بە جۆرێک لە خەیاڵی خۆیدا نوقم بووبوو، نەی دەتوانی بەئاسانی گوێبیستی قسەوباسی مەلاکانی چواردەوری بێت، لە خەیاڵی خۆیدا لە خۆئامادەکردندا بوو، بیری لەوە دەکردەوە، ئەگەر لێرە بۆی ڕێک نەکەوت قسەی لەگەڵدا بکات، ئەوا باشترە لە بەغداد سەردانی بکات، یان ئەگەر لەوێدا دەرفەتی بۆ ڕێک کەوت چیی پێ بڵێت، سەری داخستبوو و لە بەرپێی خۆی دەڕوانی و بێئاگا بوو لەوەی لە چواردەوری چی ڕوو دەدات، کاتێک چواردەوری تەواو قەرەباڵغ بووبوو، مەلاکەی لای شانی چەپی دەستی تەوقەی بۆ کەسێک درێژ کرد، باپیرە خایم کاتێک سەری هەڵبڕی، بینیی کابرایەک چاکەت و پانتۆڵی لەبەردایە و لە بەرامبەری وەستاوە و سەری هەڵبڕیوە و لێی دەڕوانێت، شڵەژا و خێرا دەستی برد و تەوقەی لەگەڵدا کرد و وتی، 'قوربان.'

قسەکەی بڕی و لە لای ڕاست و چەپی خۆی ڕوانی و خۆی لێ نزیک کردەوە و بەهێواشی پێی وت، 'ئەزبەنی، من خایم شەلەمۆم، کاتێک بەڕێزت لە سلێمانی بوویت، تەشریفت هێنایە ماڵمان. جووەکانی ئەم شارە لێمان قەوماوە و زۆربەمان دەربەدەر و ئاوارەی وڵاتان بووین، نیسبەتێکی کەممان لە کوردستان ماوین و ئیتر...'

لەو کاتەدا قسەکەی پێ بڕی و دەستی باپیرە خایمی توند ڕاوەشاند، کاتێک دەستی لە دەستی بەر دا لێی ڕوانی و پێی وت، 'مەعلووماتم هەیە!'

## ٥

حەمەجان سەلیم دەمانچەکەی بە پارەی خایمی هاوڕێی کڕیبوو، ئێوارانی ڕۆژی پێنجشەممە لە نادیی ئەزمڕ لەگەڵ هاوڕێکانیدا لەسەر مێزی خواردنەوە دادەنیشت و زوو زوو دەیوت، 'من بە سەر و ماڵ لەگەڵ شۆڕش و پارتیدام!'

پاشان شەو درەنگانێک لەگەڵ هاوڕێکانیدا لە نادیی ئەزمڕەوە بەرەو گەڕەکی چوارباخ بە پێ دەگەڕانەوە، بەدەم ڕێگاوە هەر ڕێبوارێکیان تووش دەبوو، بانگیان دەکرد و گاڵتەیان پێ دەکرد.

دوای ئەوەی ئەو شەوە هاوڕێکانی یەک یەک بۆ ماڵی خۆیان بەڕێ کرد، بەسەرخۆشی بەرەو گەڕەکی جوولەکان کەوتە ڕێ. ساڵانێک بوو لەدوای ئەو ڕۆژەوەی هاوڕێکانی لەو گەڕەکە ڕۆشتبوون ڕێگای نەکەوتبووە ئەوێ.

کاتژمێرێک دەبوو لەسەر شیوەکە و لە تەنیشت دیواری حەوشەکەی ماڵی سەعادەتدا ڕاوەستابوو، بەردەوام و لە دوورەوە گوێی لە دەنگی چەند کەسێک بوو لەودیو ماڵی سەعادەتەوە لەگەڵ یەکتریندا دەدوان، لە گەڕاجی بەردەمی کنێسەتەکەدا بوون، گەڕاجی ئەو پاس و جیپانەی بۆ شارەزوور و گەرمیان سەرنشینیان دەگواستەوە، دیواری ماڵی سەعادەت هێشتا بۆنی چیمەنتۆ تەڕەکەی لێ دەهات، خانووەکە لە مانگی چواری ساڵی ١٩٥٢وە چۆڵ کرابوو، لەو ڕۆژەوەی خێزانی سەعادەت ناچار بوون بەرەو سنووری ئێران و لەوێوە بەسەڵتی بۆ تاران کۆچ بکەن، خانووەکە وەکو کنێسەتەکە

و دووکانی جووەکان بوون بە موڵکی ئەوقاف، دوای ئەوەی لە نێوان دوو کارمەندی ئەوقافدا کێشەی لەسەر دروست بوو، بەچۆڵی مایەوە، خانووەکە یەکێک بوو لە ماڵە گەورەکانی گەڕەکی جوولەکان و بە چواردەوریدا باخێکی بەرفراوان هەبوو، ساڵی ١٩٥٢ لە فەرمانگەی ئەوقاف وتبوویان خانووەکە بە موسوڵمانێک فرۆشراوە، مەلا خەلیلی فەیلی یەکێک بوو لەو کارمەندانەی ئەوقاف و بازرگانی بە ماڵی جووەکانەوە دەکرد و بەنیاز بوو خانووەکەی سەعادەت بۆ خۆی هەڵگرێتەوە، کەسی دووەم عەلی مارف چوارتایی بوو، کە بەنهێنی بۆ پێنج ساڵ دەچوو خانووەکەی سەعادەتی فرۆشتبوو بە خزمێکی خۆی و پارەکەیشی لێ وەر گرتبوو، لە بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی ئەوقافدا نووسرابوو، ماڵ و موڵکی جووەکان بۆ فەلەستینییە هەڵاتووەکان دەبێت، یان وەکو پاداشت بە کاربەدەستانی میری بدرێن، ساڵی ١٩٥٢ خانووەکەی سەعادەت لە وەزارەتی ئەوقافەوە بە سلێمان عەربەتیی مجەوری مزگەوتی مەحوی فرۆشرابوو.

بیستی مانگی هەشتی ساڵی ١٩٥٢ بوو، بەیانیی زوو پێش خۆرکەوتن، لە گەڕەکی سەرشەقام، دوو کەسی نەناسراو سلێمان عەربەتیی مجەوریان بە چەقۆ کوشت، دوای کوشتنی ئەو، خانووەکەی سەعادەت بەچۆڵی مایەوە، سلێمان عەربەتیی مجەور ١٢ دیناری بە کاربەدەستی خەزێنەی وەزارەتی ئەوقاف دابوو، لە کاتێکدا سلێمانی مجەور لای دراوسێکانی باسی لەوە کردبوو، کە بە بڕی ٧٠ دینار ئەو خانووەی کڕیوە و تاپۆکەی لەسەر خۆیەتی، مانگی پێنجی ساڵی ١٩٥٢ سیمانەی کوڕی سەعادەت، پێش ئەوەی بەرەو ئێران هەڵبێت، ویستبووی خانووەکەی بفرۆشێت، بەڵام لە تاپۆی سلێمانی داوای ڕەزامەندیی فەرمانگەی ئەوقافیان لێ کردبوو، کاتێک لەگەڵ کڕیاری خانووەکەدا سەردانی ئەوقافیان کردبوو، عەلی مارف چوارتایی پێی

وتبوو، 'ئەوە بڕیارە، ئێوە بۆتان نییە لەم شارەدا خۆتان بە خاوەنی چلێک پووش بزانن!'

سیمانە لە وەڵامدا پێی دەڵێت، 'بەئاسانی دەستبەرداری موڵک و ماڵی خۆمان نابین!'

'ئیتر ئەوە بڕیارێکە و لە بەغدادەوە دراوە و ئێمە هیچ دەسەڵاتێکمان نییە، بەخوا برا ئێوەش هیچتان پێ ناکرێت!'

دوای ئـەوەی لەسەر کوشتنی سلێمانی مجەور، عەلی مارف چوارتایی دەستگیر کرا، پاشان مەلا خەلیلی فەیلی لە چەمچەماڵەوە بۆ سلێمانی گوێزایەوە و چووە ناو خانووەکەی سەعادەت و ئاوەدانی کردەوە.

ئەو ڕۆژە کاتێک حەمەجان سەلیم بەبێ ئەوەی لە دەرگا بدات، چووە ناو حەوشەکە، مەلا خەلیلی فەیلی لە بەردەم تەنکییەکی ئاودا خەریکی دەستشۆردن بوو، بەبێ ئەوەی ئاگاداری بکاتەوە لوولەی دەمانچەکەی لەسەر سەری ڕاگرت و پێش ئەوەی بڕیاری تەقاندنی بدات لەبەرخۆیەوە پێی وت، 'هەی شیوعیی بێفەڕ!'

مەلا خەلیلی فەیلی پێش ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، حەمەجان سەلیم پەنجەی لەسەر پەلەپیتکەی دەمانچەکەی داگرت و خوێنی مەلا خەلیلی فەیلیی تێکەڵ بە ئاوی بەر بەلووعەی تەنکییەکە کرد.

## ٦

سابات، لەسەر قەنەفەیەکی درێژکۆلەی سینەفەری لە هۆڵەکەدا دانیشتبوو، سەری بەسەر قولاپ و شلیلەکەی دەستیدا شۆڕ کردبۆوە و چەندین گلۆڵە شلیلەی ڕەنگاوڕەنگیش لەسەر کۆش و لە چواردەور بوو، سارا بەرانبەر ساباتی دایکی لە سووچێکی هەمان قەنەفە بەچوارمشقی دانیشتبوو، دەفتەرێکی دەستنووسی لەناو دەست بوو بۆ ساباتی دایکی دەخوێندەوە، بەردەوام هێواش و ڕستە بە ڕستە واتاکانی بۆ دایکی شی دەکردەوە، جار جار هەڵوێستەی دەکرد و لە دایکی دەڕوانی و دیسان ناوی شوێن و ڕووداوەکانی بۆ باس دەکرد.

سارا ئەو دەفتەرەی بەدزییەوە لە سندوقەکەی باپیرە خایمدا دەر هێنابوو، دەستنووسی ڕۆمانێکی هاوڕێیەکی باپیرە خایم بوو، کە چەندین ساڵ بوو نووسیبووی و هێشتا بە چاپی نەگەیاندبوو، دابووی بە خایم تاکو بۆی بخوێنێتەوە و هەڵەچنیی بۆ بکات، ئەو دەم سارا لە پۆلی چواری ئامادەیی بوو، سارا کچێکی باریکەلەی قەڵەمی دەموچاوی ڕێک و قژی ڕەش و لوول بوو، چاوی بایەمی و ڕەنگی ڕەش و قاوەیی تێکەڵ و تارماییەکی ڕەساسییش بەسەر بیلبیلەکانی چاویدا ڕژابوو، دەنگێکی ناسک و بەردەوام پێکەنینێکی شەرمنانە لەسەر لێوی بوو، خوێنی گەرمی لاوێتی بە دەمارەکانیدا شەپۆلیان دەدا و گورجوگۆڵییەکیان بە جەستەی بەخشیبوو.

'دەڵێم، سارا گیان، دەترسم لە ئەنجامدا تەنها دڵشکاویت بۆ

بمێنێتەوە و نەگەیت بە مەرامی خۆت؟'

سابات کاتێک ئەمەی لەبەرخۆیەوە وت، سارا لە گەرمەی خوێندنەوەدا بوو، هەڵوێستەکی کرد و بەسەرسامییەوە لە دایکی ڕوانی، 'وام زانی تۆ باوەڕێکی یەقینت بە خۆشەویستییەکەی من و سالار هەیە و هەردەم پشتگیریمان دەکەیت!'

سابات، بێ ئەوەی لە سارا بڕوانێت، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و لەبەرخۆیەوە وتی، 'بریا من هەموو شتێکم بەدەست بووایە، لەگەڵ ئەوەشدا منیش بیروباوەڕی سالارم لا قبووڵ نییە، بەینی خۆمان بێت و لای کەس لە دەمت دەر نەچێت، باوکت دەیەوێت بە هەر شێوەیەک بووە لێرە بڕوات و بۆ ئیسرائیل بگەڕێینەوە!'

'چی؟ بۆ کوێ بگەڕێینەوە؟ بەڕاستە دایە؟ وەکو دوێنێ و بەغەریبی ڕێگامان کەوتبێتە ئەم شارە، ئێمە سەد پشتمان لەم وڵاتەدا ژیاوە، ئایا ئێوە ئەوە دەزانن؟ ئەوە بۆ سێ هەزار ساڵ دەچێت ئێمە لەم وڵاتەداین، بۆ زانیاریت من زیاتر خۆم بە کورد دەزانم وەک لە زایۆنیستێک!'

'هەمووی خۆهەڵخەڵەتاندنە، ئێمە لەم وڵاتەدا هیچ ئازادییەکمان نییە، تاکەی خۆمان بشارینەوە و لەسەر تەسکەرەکانمان ناو و ناونیشانی هەڵە نووسرابێت، یان نووسرابێت کە ئێمە ئیسلامین.'

'من تێناگەم مەبەستی ئێوە لەو قسانە چییە، بیروباوەڕی چی و شتی چی؟'

'خۆتم لێ گێل مەکە، یان باپیرەت و سالار مێشکی تۆشیان تێک داوە، دەی نازانیت لەسەر چی سالار دایم ناکۆکە و لەگەڵ باوکت و مەحموودی براتدا شەڕییەتی؟'

'ئاخ دایە خۆزگە ئێوە تۆزێک بەسەر بیرکردنەوەی خۆتاندا دەچوونەوە!'

'بەخوا جوانە دەی ئەوە بێئەقڵی نییە بۆ سالار پشتی لە دینی خۆی کردووە و بووە بە کۆمەنیست؟'

'دایە، سالار هۆشیارە و ئیتر ناتوانێت کوێرانە ئەو بیروباوەڕەی باووباپیرانی قبووڵ بێت، باوەڕ ناکەم ئەو حاشا لە شەجەرە و باووباپیرانی خۆی بکات، بەڵام ئەو دەڵێت ئێمە پێش ئەوەی هەڵگری هەر دیانەت یان پرەنسیپێک بین کوردستانیین.'

'جا ئێمە کەی کوردین؟ کوڕە بەخوا ئێوە، باوەڕتان هەبێت یان نەبێت، خۆشیتان بێت و تاڵیتان بێت هەر جوولەکەن، ئیتر ئەو کەریتییەتان لە چییە؟'

'تۆ ڕاست دەکەیت، ئێمە لە دایک و باوکێکی جوولەکەمەزهەب لەدایک بووین، هەڵبەتە ئەوە ئیختیاری خۆمان نەبووە، بەڵام ئێستا ئێمە ئازادین، کە ڕەخنەمان لەو دینە هەبێت یان ئەگەر تەواو ڕەفزیشی بکەین، تۆ ئەگەر ئەو کتێبەی لای باپیرە خایمە، بیخوێنیتەوە، باش تێ دەگەیت!'

'کام کتێب؟'

'*زایۆنست*، کتێبێکی سەوزی بچووکە.'

'ئێ، جا ئەو کتێبە چییەتی، لەبیرم دێت، کاتی خۆی باوکم چەند جارێک بۆی خوێندینەوە.'

'ئاخر ئەوە بوو، کە وای لەو خەڵکە کرد، کە وڵات و ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ بێڵن و بچن بۆ ئیسرائیل، دەزانی پێش ساڵی ١٩٤٠ زیاتر لە پەنجا هەزار خێزان لە سەرانسەری کوردستاندا هەبوون، ئێستا ئێمە و چەند ماڵێکی تر ماوینەتەوە.'

'تۆ پێت وایە هەموویان بە خواستی خۆیان کۆچیان کرد، کوڕە بەخوا عەرەبی شۆڤێنست ئەقڵی کوردەکەشیان تێک دابوو، خۆ ناتوانین ئینکاری لەوە بکەین، کە زۆرینەی کورد هەڵگری هەمان

بیر و باوەڕی ئەو عەرەبانەن.'

'کەواتە سالار ڕاست دەکات، پێویستە میللەتی کورد ئەو بەرگە کۆنەپەرستییە لەبەری خۆی داماڵێت و بیری سۆشیالستی و یەکسانی بکات بە بەری خۆیدا، ئا ئەوەیە، کە سالار خەباتی بۆ دەکات.'

'تکات لێ دەکەم سارا، واز لەو قسە بێمانایانە بێنە با خوا ئەوەندەی تر غەزەبمان لێ نەگرێت، کوا گەیشتیتە کوێ؟ بزانم جوامێر چی لێ بەسەر هات؟'

سارا، هێشتا بەبێزارییەوە لە دایکی دەڕوانی، بەدوودڵییەکەوە سەری بەسەر دەفتەرەکەی دەستیدا شۆڕ کردەوە،

"جوامێر دوای کپبوونەوەی ئەوان، بە زەردەخەنەیەکی بزرکاوییی تفتەوە وتی: داخم ناچێ! زۆر دەترسم بەشی زۆری مێژووش ئاوا نووسرابێتەوە؟ باوەڕم پێ بکەن چەند ئەو کەسانەی ئیمپریالیزم بە ناوی گەورە و نوێنەری ئەم وڵات و گەلەوە هێناونییە کایەوە و بەڕاستی گەورەی ئەم وڵات و گەلەن و پەیوەندییان لەگەڵیاندا هەیە، منیش ئەوەندە سەرکردەی ئەو خۆپیشاندانە خوێنینە بووم و هەر ئەوەندەش پەیوەندیم لەگەڵیاندا بووە."

'ناوی چییە ئەو حقایەتە؟'

لە کاتێکدا سابات ئەمەی پرسی، سارا لە گەرمەی خوێندنەوەدا بوو، هەڵوێستەیەکی کرد و لە دایکی ڕوانی، 'حقایەتی چی دایکە، ڕۆمانە ڕۆمان، ناونیشانەکەی... *ژانی گەل*'

'ڕۆمان چییە؟ ئم، وتت چی؟ ژانی چی؟'

'ژانی گەل!'

'کام گەل؟'

'دەردی باپیرەم هەموو جارێک دەیڵێت، ژانی کوردە موالییەکان!'

'کێ نووسیویەتی؟'

'ئیبراهیم ئەحمەد'

'ئێ، دەی ئەمجا؟'

سارا پەنجەیەکی لەنێوان لاپەڕەکانی دەستنووسەکەدا ڕاگرتبوو، تاوێک بوو لە بەرگەکەی دەڕوانی، پاش خوێندنەوەی ناونیشانەکەی و ناوی نووسەرەکەی، کە لەسەر بەرگەکەی بە خەتێکی تۆخ نووسرابوون، دەستنووسەکەی والآ کردەوە و بەردەوام بوو،

"گوێگرەکانی وەکو باوەڕ بە گوێی خۆیان نەکەن، بەسەرسامییەوە تەماشای یەکتریان دەکرد. جوامێریش لەسەر قسەگێڕانەوەی خۆی ڕۆیشت: ڕاستییەکەی ئەمەیە کە کاتێ من بریندار کرام، لای کتێبخانەی گشتییەوە بووم، نەک لای قولەی پۆلیسی... وە وەکو بڵاو کرایەوە، بەڵام ئەوە ڕاستە کە من لە پێش خۆپیشاندەرەکانەوە بووم ئەویش تەنیا هەر لەبەر ئەوە بوو کە لەدوای هەمووانەوە بووم. بەدبەختی و چارەڕەشی وای سازاند کە من لەو کاتەدا کارێکی زۆر پەلە و گرنگم هەبێ و ناچار بم لە ماڵ بێمە دەرێ..."

لە کاتێکدا سارا لە خوێندنەوە وەستابوو، بێدەنگ لە دایکی دەڕوانی، لێوەکانی هێنابوونەوە یەک و دەستێکی بەرەو ڕووی دایکی پان کردەوە و ویستی دیسان باسی سالار بکات، لەو کاتەدا سابات لەبەرخۆیەوە وتی، *ژانی گەل، ژانی گەل*... ئێ ئێ بەردەوام بە.'

سارا سەرێکی لە دایکی ڕاوەشاند و سەری بەسەر پەڕەی دەستنووسەکەدا داهێشت،

"وە کە لە ماڵ هاتمە دەرێ، مەردووی گردی سەیوان چەند خۆپیشاندانی پارتیی لەبیر بووە، منیش ئەوەندە! بۆ ئەوەی بەپەلە بگەمە ئەو شوێنەی بۆی دەچووم، پێویست بوو بە بەردەرکی سەرادا تێپەڕم، کە نزیکترین ڕێگا بوو. کە دیم مەلەمای لێ بڕاوە، مەلی لێ دەر

ناچێت، بەڕاکردن گەڕامەوە تا وەکو لە لایەکی کەوە خۆم بگەیەنمە شوێنەکە. بۆ بێوڵەتیی من لەو کاتەدا لە سەربانی سەراوە مەیدانەکە درایە بەر دەستڕێژی شەستیر، خەڵکەکە بەناچاری کشانەوە ناو کۆڵانەکان و کەوتنە هەڵاتن."

'ئێستا دەزانم بۆچی باوکم و مەحموودە فەنی ڕقیان لە سالار هەڵگرتووە، بەڵام تێناگەم تۆ بۆ؟'

'توخوا سارا واز لەو مەسەلەیە بێنە و ئەوەندە پچڕ پچڕ ئەو حقایەتەم بۆ مەخوێنەرەوە!'

سارا چاوی پڕ بووبوون لە فرمێسک و لەوەدا بوون بڕژێنە سەر ڕومەتەکانی، تۆنی دەنگی گۆڕابوو، بەبێزارییەکەوە لە خوێندنەوە بەردەوام بوو،

"ئینجا جەنابم کە لەگەڵیان نەبووم و لە دوای هەمووانیشەوە بووم، کەوتمە پێش هەمووانەوە و بەم جۆرە ئاوەژووە بووم بە پێشڕەوی خۆپیشاندانەکە و یەکێ لە سەرکردە ناودارەکانی بزووتنەوە! وە هەر لەبەر ئەم سەرکردایەتییە درۆینەش بوو کە پاش چەند هەفتەیەک بە برینداری و شەلەشەل، لەگەڵ ٤١ کەسی ترا بردیانم بۆ بەردەمی عورفی و ژەندرمە پیاوکوژەکان هاتن بۆ شایەتی..."

سارا، لە کاتێکدا سەری بەسەر دەستنووسەکەدا شۆڕ کردبۆوە، شێوازی دانیشتنەکەی گۆڕی و بە بێئارامییەکەوە چەند جارێک هەستایە سەر پێ، دیسان لە جێگای خۆی دانیشتەوە، هەناسەی توند بووبوو، ئازارێکی کوتوپڕ سەرسنگی داگرت، دیسان لەناکاو ڕاپەڕی و خۆی کەمێک ڕاست کردەوە، لە خوێندنەوە وەستا و دەفتەرەکەی داخست و هێواش لەسەر کۆشی دای نا و هەردوو دەستی بە سنگیەوە گرت، سەری بەسەر سنگیدا شۆڕ کردبۆوە و ماسوولکەکانی دەموچاوی گرژ بووبوون، لە کاتێکدا لە عەزرەتدا ڕانەکانی کۆ کردنەوە و هەڵی کێشان

بەرەو سەر لێواری قەنەفەکە، دەستنووسی ڕۆمانی *ژانی گەل* کەوتە سەر زەوی، برۆکانی هێنانەوە یەک و چاوی توند نووقاند، دیار بوو ساباتی دایکی بەدەم شلیلەچنینەوە لەناو خەیاڵی خۆیدا بەدیار دیمەنی ڕووداوەکانی ڕۆمانی (*ژانی گەل*)ەوە نوقم بووبوو، هەر بۆیە لەو کاتەدا ئاگای لای سارا نەمابوو، تا ئەو کاتەی سارا لەتاو ئازار خۆی لەسەر قەنەفەکە پێ ڕا نەگیراو لەناکاو بەر بۆوە و کەوتە سەر ئەرزی هۆڵەکە، وەک گیاندارێکی پێکراو هەردوو دەستی توند بە سنگیەوە گرتبوون و لەپەسا تەپاوتلی دەکرد.

سابات لە عەزرەتدا لە جێگای خۆی ڕاپەڕی و شیش و گلۆڵەی شلیلەکانی بە چواردەوری سارادا پژاند و بە دەنگێکی بەرز، 'سارا، سارا گیانماڵوێران خۆم، مەحموود، ڕۆڵە مەحموود.'

لە کاتێکدا سابات بەرەو دەرگای هۆڵەکە چوو، لەناو دەرگاکەوە بەو قاڵدرمانەدا هەڵی ڕوانی، کە بەرانبەر دەرگای هۆڵەکە بوون و بەرەو قاتی سەرەوە دەکشا، قاتی سەرەوەی ماڵەکەیان تەنها دالانێک و دوو ژووری بۆ سارا و مەحموود لێ بوو، دیسان چەند جارێک بانگی لە مەحموود کرد، گەڕایەوە لای سارا و دانەوییەوە بەسەریدا و لە تەنیشتیەوە دانیشت و باوەشی پێدا کرد، پاش ئەوەی خستییە سەر پشت، هەردوو دەستی لە بنباڵەکانی توند کرد و بۆ سەر ڕانی خۆی ڕایکێشا، پاشان دەستێکی بە ڕوومەتی ساردیەوە گرت و دەستەکەی تریشی لەپەسا و هێواش لەسەر بۆ خوار بە سەر سنگ و نێوان مەمکە قوتەکانییدا دەهێنان و لە ڕوخساری تێکچووی سارای دەڕوانی، بەدەم گریان و هەنسکدانەوە، 'مەحموود، ڕۆڵە مەحموود فریا کەوە، سارا گیان، خوایە چی بکەم.'

لەو دەمەدا مەحموود هێواش هێواش بە قاڵدرمەکاندا هاتە خوار، قاتوبیجامەی خەتخەتی لەبەردا بوو، وەکو تازە لە خەو ڕابووبێت،

لەبەرخۆیەوە و بەبێزارییەکەوە وتی، 'چییە، دیسان بەزمەکەیە!'

مەحموود لە قوتابخانەی ئامادەیی سلێمانی، قوتابیی پۆلی شەشەمی وێژەیی بوو، بۆ مەبەستی خوێندن و خوێندنەوە بەردەوام لە ژوورەکەی خۆی بوو، هەر لە سەرەتاوە گوێی لە هاوار و بانگی دایکی بوو، بەڵام سارا و سابات ڕۆژانە ئەوەندەیان گێچەڵ بە مەحموود دەکرد تەواو لێیان بێزار بووبوو، بێجگە لەوەی ڕۆژی چەندین جار دەیان نارد بۆ گوڵەبەڕۆژە و قەزوان و بنێشت کڕین.

## ٧

سێ ڕۆژ بوو سارا لە نەخۆشخانەی جمهوری کەوتبوو، ڕەنگی هاتبۆوە بە بەردا و ماسوولکە و دەماری ڕومەتی خوێنیان تێ زابوونەوە، دەیتوانی لەسەر جێگاکەی هەڵسێت و ئازاری سەرسنگی و تەنگەنەفەسییەکەی نەمابوو.

دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە سالار بۆ یەکەمین جار سەردانی کرد، سارا لە ژوورێکدا لەگەڵ چوار ئافرەتی نەخۆشی تردابوو، لەو کاتەدا لەسەر جێگاکەی وەک پیشەی دایمی چوارمشقی قنج دانیشتبوو، قژە ڕەش و لوولەکەی بەسەر شانیدا بەر دابووەوە، بە جۆرێک بووبووە چوارچێوەیەک بۆ ڕوخساری، ئەو ڕەنگە سپییەی جل و جێگاکەی کارێکیان کردبوو وەکو ئەوەی سارا بۆ کێشانی پۆترێتێک خۆی نماییش کردبێت، سالار چەپکێک گوڵی ئەرخەوانیی پێ بوو، بە هەردوو دەستی چەپکە گوڵەکەی لە پێش خۆیەوە و بەسەر سنگیەوە گرتبوو، بێ ئەوەی لە چواردەوری بڕوانێت، هەر لە هاتنەژوورەوەیدا لە دوورەوە چاوی لە سارا بڕی و بەرەو لای جێگاکەی چوو، سارا کاتێک سالاری بینی، بەپەلەپرووزکێ زیاتر خۆی ڕاست کردەوە و دەستێکی بە سەروقژیدا هێنا و بەشەرمێکەوە لەژێر لێوەوە وتی، 'سالار گیان، ئەوە چۆن بوو؟'

لە کاتێکدا سارا ئەوەی وت، سالار گەیشتبووە بەردەمی و گوڵەکەی بەرانبەری ڕاگرت و پێی وت، 'سارا گیان بمبوورە درەنگ

هاتم، فەرموو.'
'ئەرخەوان؟'
'بەڵێ ئەرخەوان، بەتایبەتی چووم بۆ گردی سەیوان، تا...'
'هەتیو، ئەرخەوانی چی و سەیوانی چی، خۆ من بەتەمای مردن نیم لەم تەمەنەیا! کەچی تۆ لە قەبرسانەوە گوڵت بۆ هێناوم.'
'نا، نا، وتم با بە دەستی بەتاڵ نەیەم، جارێکیش گوێم لێت بوو چەند بەسۆزەوە باسی جوانیی ئەرخەوانەکانی گردی سەیوانت دەکرد.'
'دەستت خۆش بێت، بەس بۆ وا درەنگ هاتیت، هەتیو دوای سێ ڕۆژ، دەزانیت چەند چاوەڕوانت بووم؟'
'دەبێت بمبووریت، باوەڕ بکە لەو ڕۆژەوەی تۆ لێرەیت، من ئاگام لە دنیا نەماوە، ئەوە سێ ڕۆژە بۆ بەردەمی ئەم نەخۆشخانەیە دێم، بەڵام دوودڵ دەبووم لە هاتنەژوورەوەم، هەروەها ئەو دوو جارەی دایکم سەردانی کردیت ویستم لەگەڵی بێم، بەڵام خۆت دەزانیت، نەمدەویست دیسان تووشم ببێت بە تووشی باوکت و مەحموودی براتەوە، خۆ ئەوان ئەم ماوەیە چاویان بە من هەڵنایەت!'
'دەی ئێستا چی دەکەیت ئەفەنی، ئەوە دوانیوەڕۆیە، هاکا ئەوان هاتن!'
'نا، نایەن.'
'چووزانیت نایەن؟'
سالار سەرێکی داخست و بە دەستێکی لاملی خوراند، لای قاچی ساراوە لەسەر جێگاکەی دانیشت و بە دەنگێکی نزم، وەکو ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بدوێت، 'وتم، ئەوان...'
قسەکەی تەواو نەکرد و لەو کاتەدا سەری هەڵبڕی و زیاتر لە سارا نێزیک بوویەوە و بەردەوام بوو وتی، 'سارا، ئەوان ئەمڕۆ نایەن،

چونکه...'

'بۆ نایەن؟ ئەوە من ئیزن دراوم و لە بەیانییەوە سێ جار زەنگیان بۆ ماڵەوە لێ داوە، وتیان پێ دەچێت ئەو ژمارە تەلەفۆنە هێڵەکەی بچڕابێت، چەند جارێکیش تەئکیدم لە ژمارەکە کردەوە، خۆ ئەوەندە گران نییە، دەی ژمارە تەلەفۆنەکەمان ٨٤ نییە؟'

'تۆ ئەوەندە خۆت نارەحەت مەکە.'

'تێناگەم، دەی دایکم و ئەوان لەکوێن؟'

'چوون بۆ کۆیە، چوون ماڵئاوایی لە ماڵی پوورە سەلما و خانێ بکەن.'

'دەی بۆچی بەنیازی کوێن؟ خۆ ناگوێزنەوە؟'

'نەخێر، بەڵێ، بەڵێ دەگوێزنەوە، بەڵام بەیەکجاری بۆ دەرەوەی وڵات.'

'بەراستە سالار، یانی تریفە و گوڵەباخی هارێم جارێکی تر نابینمەوە؟'

سالار لەو کاتەدا زیاتر لە سارا هاتە پێش و دەستێکی خستە سەر دەستی سارا و بە چپە پێی وت، 'دەڕۆن بۆ ئیسرائیل.'

'وەی خوایە ئەوە چییە، ئەو خەڵکە شێت بوون، دەڵێیت لەوێ هەنگوین ڕژاوە.'

'ئەوە مەسەلەیەکی ترە و ئێستا کاتی نییە!'

'یانی ئەمڕۆ نایەنەوە؟ دەی من چی بکەم لێرە؟ خۆ کلیلی ماڵەوەشم پێ نییە!'

'ئەگەر بە من ڕازی بیت ئەوا، نازانم، دەڵێم بە سەیارەکەم دەتبەمەوە ماڵی خۆمان.'

سارا بە هەردوو دەستی توند دەستێکی سالاری گرت و لە چاوی ڕوانی و بەنازێکەوە وتی، 'من هەردەم بە تۆ ڕازی بووم ئازیزەکەم، سالار گیان، ئەبەد لە خۆشەویستیم بۆ تۆ دوودڵ نەبووم، بەڵام هەتیو،

ئاگات لە دەمت بێت، جارێکا ئێمە لەکوێمانە، ماڵی خۆتانی چی و شتی چی!'

'بۆ نا سارا گیان، خۆ دنیا کاول نابێت!'

'نا، نەخێر سالار گیان، با لەوە زیاتر پەیوەندیی نێوان تۆ و باوکم و مەحموود تێک نەچێت و خۆشەیستییەکەی ئێمەش بە دەردی ئەوەی لەیل و مەجنوونی لێ نەیەت، تا ئێوارە چاوەڕوانیان دەکەم، ئەو سستەرەی سەرپەرشتیی ئەم بەشە دەکات پێی وتم، کە حەتمەن دەرم ناکەنە سەر جادە.'

'تکایە سارا، ئینکاریم لەگەڵدا مەکە و با بڕۆینەوە بۆ ماڵی خۆمان، تۆ تا ئێستاش پێت نەناوەتە ناو جێبەکەمەوە، دەزانیت؟'

لە کاتێکدا سارا ویستی وەڵامی سالار بداتەوە، سالار هەستا بەرەو دەرگای هۆڵەکە بڕوات، بەدەم ڕێگاوە ئاوڕێکی لە سارا دایەوە و پێی وت، 'تۆ خۆت ئامادە بکە.'

زۆری پێ نەچوو سالار لەگەڵ سستەرێکی کورتەباڵای قژکورتی گەنمرەنگدا گەڕایەوە، کاتێک پێکەوە لەگەڵ سالاردا گەیشتنە بەردەمی جێگاکەی سارا، سستەرەکە ڕووی لە سارا کرد و پێی وت، 'سارا خان، دەڕۆیت؟'

'بەڵێ ڕووناک خان، سوپاس بۆ ئەو هەموو خزمەت و دڵسۆزییەت.'

## ٨

درەنگانی ئێوارەی ئەو ڕۆژە، سابات و حەکیم لەگەڵ باپیرە خایم و مەحموودا، لە شاری کۆیە گەڕانەوە، بێزاری و هیلاکیی ڕێگا بە ڕوویانەوە دەبینرا، سابات لەبەرخۆیەوە بەردەوام دۆعا و نزای دەکرد، حەکیم لە ڕێگا وتبووی، 'تاوەکو سەروماڵمان تیا نەچووە، باشتر وایە فریای خۆمان بکەوین و بۆ ئیسرائیل بگەڕێینەوە.'

باپیرە خایم لە وەڵامدا بە حەکیمی کوڕی وتبوو، 'تۆ پێویستە ئەو خەیاڵە لە مێشکی خۆت دەر بکەیت، ئێمە هەتاوەکو بەو خەیاڵەوە بژین و بە درێژاییی ژیانمان خەون بە ئیسرائیلەوە ببینین، ئیتر نەوە لە دوای نەوە لێرە خۆمان بە غەریب دەزانین و لەبیرمان دەچێتەوە کە ئێمە کوردستانین، بەو جۆرە هیچ سەوز ناکەین لە ژیانماندا.'

لەدوای ئەمەوە ئیتر بە درێژاییی ئەو ڕێگایە یەکتریان نەدواند و هەرچواریان لە خەیاڵی خۆیاندا نوقم بووبوون.

کاتێک گەیشتبوونەوە ماڵەوە و دوای نانخواردن و چاخواردنی ئێوارە، باپیرە خایم داوای ئەوەی لە مەحموود کردبوو، بۆ خوێندن بیر لە چوونی بۆ بەغداد نەکاتەوە، چونکە تا ئەو دەمەش مەحموود دەیویست دوای دەرچوونی لە ئامادەیی بچێت بۆ ئەکادێمیای هونەر لە بەغداد و لەوێ هونەری شێوەکاری بخوێنێت، ئەو شێواز و فۆرمی هونەرەی مەحموود تێیدا بەهرەمەند بوو، هەروەها لە پێنج ساڵییەوە ڕۆژانە سەرقاڵی بوو، بەردەوام سکێچی دەکرد و نیگاری دەکێشا، لەو کاتەدا باپیرە خایم بەو خەیاڵەی مەحموود ڕازی

نەبوو، بەردەوام هەوڵی لەگەڵ مەحموود دەدا، کە ڕای بگۆڕێت و ببێت بە پزیشک یان مامۆستا باشترە، ئەوەشی بە مەحموود دەوت، بەغداد و شارەکانی تری عێراق بۆ کوردێکی جوولەکە گونجاو نین، نەک تەنها بۆ خوێندن و مانەوە تێیاندا، بەڵکو بۆ سەردانیش ڕێگات تێیان نەکەوێت باشترە، هەروەها باپیرە خایم بە مەحموودی دەوت، 'هەوڵی ئەوە بدە ببیتە معەلم، ئەگەر دەتەوێت پاشەڕۆژ خزمەتێک بە میللەتەکەت بکەیت!'

حەکیم بەردەوام بەتەوسێکەوە لە خایمی باوکی دەڕوانی و سەری لێ با دەدا و لەژێر لێوەوە دەیوت، 'کورە باوکە ڕجات لێ دەکەم، خوێندنی چی و پاشەڕۆژی چی، واز لەو کورە بێنە!'

سابات ئەو ڕۆژە گوزەرانی باش نەبوو، لە دە ساڵی رابردوودا خەم و پەژارەی لەدەستدان و دابڕانی کەسانی نێزیکی تەواو کاریان تێ کردبوو، ئەوە ئەمڕۆ دیسان لە سەلما و خانێ مێردی و مناڵەکانیان ماڵئاواییی کرد، بۆ سابات ئەوان لە جێگای کەسوکاری بوون، ماڵئاوایییەک بۆ ئەبەد هیوایەکی تێدا بەدی نەکرێت جارێکی تر چاویان بەیەک بکەوێتەوە، بێجگە لە ماندوێتیی ڕێگا، نەیدەتوانی لەسەر پێکانی بۆستێت و بەردەوام سەری گێژی دەخوارد، لە هۆڵەکە لەسەر کورسییەک دانیشتبوو سەری بەپشتدا خستبوو، دەستەسرێکی سپیی قەدکراوی تەڕی لەسەر ناوچەوانی دانابوو، دەستەکانی لەسەر سنگیدا لەیەک هەڵپێکابوون و بێدەنگ چاوەکانی لێک نابوو، چەندین شەو بوو لە ترسی دێوەزمەی نێو خەونەکانی نەی دەوێرا بچێتە ناو جێگاوە، بەتایبەتی ئەو خەونەی بەردەوام دووبارە دەبوویەوە، هەنووکە لەو خەونەیدا خۆی بە دەستی خۆی کفنێکی لە جاوی سپی بۆ منداڵەکانی دەدووری، سابات لەلای کەس ئەو خەونەی باس نەدەکرد، هەرچەندە هەموو شەوێک یان

سەرلەبەیانیان حەکیم لێی دەپرسی، 'ئەرێ ژنەکە موشکیلەت چییە؟ بۆ ئارامت لا هەڵگیراوە و شەو تا بەیانی ئێشک دەگریت؟'

سابات بەیانیان بەلووعەی ئاوەکەی بەر دەدایەوە و بەدیاریەوە چەند نزایەکی دەخوێند، بەو نیازەی خەونەکەی نەیەتە دی و کاریگەریی خراپی لەسەر منداڵەکانی نەبێت.

لە ساڵی ١٩٥١ وە و لەو ڕۆژەوەی دایک و باوک و دوو خوشکەکەی ماڵ و حاڵیان لە شاری پێنجوێن بەجێ هێشت و بەرەو وڵاتی ئیسرائیل سەفەریان کرد، ئەودەم مەحموود سێ ساڵان و سارا تەنها تەمەنی ساڵێک دەبوو، ئێستا مەحموود و سارا هەرزەکارن و شێواز و ڕوخساری کەسوکاری نەنکیان لەبیر نەماوە، تەنانەت ئەگەر ئێستا یەکتری ببینن تەواو بە بەیەک غەریب کەوتوون، سابات بەردەوام ژیانی سەردەمی لاوێتیی بۆ منداڵەکانی دەگێڕایەوە، زوو زوو لەبەرخۆیەوە دەیوت، 'ئای لەوسای شاری پێنجوێن، چەند دڵگیر و خۆش بوو!'

باوکی سابات نەک تەنها لە شاری پێنجوێن، بەڵکو تا شاری مەریوان و تەنانەت لە ناوچەی شاربازێڕیش زۆر بەناوبانگ بوو، ئەورامی باوکی بە ئەوڕامە جوو ناسرابوو، سابات پەشیمان نەبوو لەگەڵ کەسوکاریدا بۆ ئیسرائیل نەچووبوو، هەوڵی دەدا حەکیمی مێردی خۆش بوێت و سارا و مەحموود هەموو ئەو بۆشاییەیان لە دڵی ئەودا پڕ کردبۆوە، ئەوەی ڕۆژانە زیاتر ساباتی بێزار دەکرد و بەردەوام بیری لێ دەکردەوە پاشەڕۆژی منداڵەکانی بوو، هەرچەندە باپیرە خایم و حەکیم پێنج ساڵێک لەوەوبەر بە بەرتیل و هاوکاریی دۆستانیان ناو و دیانەتەکەیان لەسەر ناسنامەکانیان گۆڕیبوو، هەروەها لە گەڕەکی جوولەکانەوە بۆ گەڕەکی سابوونکەران گوێزابوویانەوە، ئەو چەند مانگەی دواییش لە خەیاڵی ئەوەدا بوون

دوکانەکەیان لە قەیسەریی نەقیب بفرۆشن و لە کووچە و بازاڕێکی تردا سەرلەنوێ دەست پێ بکەنەوە، لە فرۆشتنی دوکانەکەیاندا باپیرە خایم ڕێگر بوو، ئەو شەوەی حەکیم بۆ جاری یەکەم باسی فرۆشتنی دوکانەکەی لەگەڵ باوکیدا کرد، باپیرە خایم بە حەکیمی کوڕی وت، 'دەزانیت حەکیم ساڵی ١٩٠٠ باوکم یەکەم کەس بووە، لەگەڵ دروستکردنی ئەو قەیسەریی نەقیبەدا دوکانی تێدا بە کرێ گرت، ئەوە بە تۆوە سێ نەوە لەسەر ئەو کولانە گورگە ژیاوە.'

باپیرە خایم ترسی ئـەوەی هەبوو حەکیمی کـوڕی چـاو لە خزمانیان بکات و لە خەیاڵی ئەوەدا بێت پێشوەخت سەروەت و ماڵی بفرۆشێت و پاشان بۆ ئیسرائیل سەفەر بکات، ئینجا باپیرە خایم ئەمەی بە حەکیم وت، 'سلێمانی شاری ئێمەیە، وڵاتی کوردستان جێگای باووباپیرانمانە نەک ئیسرائیل، ئێمە پێش دروستبوونی شاری سلێمانییش لە قەڵاچوالان بووین و بە ڕەنجی شانی خۆمان ژیاوین، ئەوە بۆ زیاتر لە سێسەد ساڵ دەچێت ئێمە ڕەنج دەدەین و شێخ و دەرەبەگ بە چاوی کەم و سووکایەتیپێکردنەوە سەیری ئێمە دەکەن و سەرانەمان لێ دەسەنن، باپیرە گـەورەم خۆی لە قـەڵاچـوالان لـەدایک بـووە و لە دروستکردنی شـاری سلێمانیدا ڕاوێژکار بووە، خۆی یەکەم بەردی بناغەی گەڕەکی جوولەکانی داناوە، بە پارە و بیری ئەو بازاڕ و ئابووریی شار دروست کراوە و بووژاوەتەوە، ئێستا ئەوان ئێمە بە دەرەکی و غەریب لەقەڵەم دەدەن و بەرەو ئیسرائیل یەک یەک و بە کۆمەڵ دەرمان دەپەڕێنن، ئەوسا کاتێک فڕۆکەکانی ئینگلیز شاریان بۆردومان کرد، کردیانە وێرانە و دار و بەردی ئەم شاری سلێمانییە خوێنی لێ دەچۆڕا، لە کاتی بۆردومانەکەدا من لە بەغداد بووم، بەڵام دوای ئەوەی بۆ سلێمانی گەڕامەوە، لە ئەنجامی بێدەسەڵاتی و بێزاریمدا، ویستم

خۆم بگەیەنمە لای شێخ مەحموودی حەفید و پێی بڵێم، جەنابی شێخ دەستم بە دامانت و دەستەکانت ماچ دەکەم، خەیاڵت لای میلەتەکەت بێت و واز لە غەزاکردن بێنە و لەبەر خاتری دەستەبەرکردنی بەهەشت بۆ شەخسی خۆت، ماڵی کوردان لەوە زیاتر وێران مەکە. نازانم بۆ ئەو دەمە ئەوەندە ترسنۆک بووم و بۆ لای جەنابی شێخ نەچووم.'

لە کاتێکدا باپیرە خایم ئەو قسانەی دەکرد، حەکیم و مەحموود بەسەرسامییەوە لێیان دەڕوانی و بەسەرنجەوە گوێبیستی بوون، سابات خۆی خستبووە سەر لا و چاوەکانی پڕ بووبوون لە فرمێسک.

لەو دەمەدا لە دەرگای حەوشە درا، مەحموود هەستایە سەر پێ و چوو سووچێکی پەردەکەی لا دا، ئەو پەردانەی شەو و ڕۆژ دادرابوونەوە، ئەوە بۆ چوار ساڵ دەچوو خۆر ئەوەندە لە دیوی دەرەوەی پەردەکانی دابوو دەمێ بوو ڕەنگیان پەڕیبوو، بەڵام لەبەر ئەستووریی پەردەکان بە دیوی هۆڵەکەدا هێشتا ڕەنگێکی سەوزی تۆخیان دەنواند.

'سالارە.'

مەحموود کاتێک ئەمەی وت، پەردەکەی دادایەوە و لە دەرگای هۆڵەکەوە بەرەو دەرگای حەوشەکە چوو، سابات بەناڵەناڵ ڕاست بوویەوە و تۆزێک خۆی قنج کردەوە، باپیرە خایم و حەکیم بێدەنگ لە دەرگای هۆڵەکەیان دەڕوانی، کاتێک مەحموود دەرگای حەوشەی لە سالار کردەوە، بە سالاردا هەڵیڕوانی و بێ ئەوەی هیچ بڵێت و تەنانەت فەرموویشی لێ بکات پشتی تێ کرد و پێش ئەو چووەوە ژوورێ، سالار لەژێر لێوەوە وتی، 'کەرپیاو.'

سالار کاتێک گەیشتە هۆڵی دانیشتنەکە، باپیرە خایم لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا ڕاوەسابوو، بە ڕوویەکی خۆشەوە سەیری

سالاری خوشکەزای کرد و دەستی بەرەو ڕووی درێژ کرد، 'سالار گیان، کوڕی خۆم، بەخێر بێیت، ئەوە خێر بوو، دەی خوشکم چۆنە خۆ شوکور ناساخ نییە؟'

'دایکم باشە باپیرە گیان، ئەوە لە قەزازەکان بووم، وتم نێزیکم و با بچم بەسەرپێیی سەردانێکیان بکەم.'

تا ئەو کاتەی سالار وەڵامی باپیرە خایمی دایەوە، دەستیان هەر لەناو دەستی یەکدا بوو، ئینجا باپیرە خایم سالاری بەرەو لای خۆی ڕاکێشا و لە تەنیشت خۆیەوە دای نا، لەو کاتەدا حەکیم بەلالووتێکەوە بێ ئەوەی لە سالار بڕوانێت، 'بەخێر بێیت.'

سابات بە دەنگێکی تێکشکاوەوە، ڕووی لە سالار کرد، 'سالار گیان، بمبوورە بەساقە، دوور بێت لە گیانی تۆ و ئازیزانت زۆر ناساخم، یاخوا بەخێر بێیت، دەی دایە کەتان چۆنە؟'

'خوا چاکت بۆ بکات سابات خان، دایکم باشە، تەنها ئەوە نەبێت کە بەدەست ئازاری پەنجەکانی دەستییەوە هیلاکە، ئەویش هەمووومان دەزانین هۆکارەکەی ئەوەیە ساڵانێکە سەوزەی پێ ڕنیون و زۆر ماندووی کردوون.'

مەحموود لەولای سالارەوە خۆی ترنجاندبووە سووچی قەنەفەکە و لەپەسا هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا.

'دەی لەگەڵ خوێندنەکەتدا چۆنیت؟'

'باشم، زۆر باشم باپیرە گیان، ئیدی ساڵی داهاتوو دوایین ساڵمە، ئەگەر بەخت یارم بێت شەهادەی موعلیمی وەر دەگرم.'

'پیشەیەکی چەند بێوێنەیە کوڕی خۆم. سالار گیان، یانی دەبیتە موعەلیم و دەرسودەور بە منداڵان دەڵێیتەوە؟'

'بەڵێ، وانەی زمانی کوردییان پێ دەڵێمەوە!'

'سالار، ئیتر تۆ پەکت ناکەوێت.'

سالار بێئارامییەک بە ڕووییەوە دیار بوو، زوو زوو ڕووی لە باپیرە خایم وەر دەگێڕا و لە ساباتی دەڕوانی، پاش ئەوەی خۆی کۆ کردەوە، بە دەنگێکی گڕ و بەشەرمێکەوە وەکو ئەوەی لەبەرخۆیەوە بدوێت، 'دەڵێم سابات خان، ئەوە سارا لە خەستەخانە دەر چووە و لە ماڵی ئێمەیە!'

'چۆن، بەڕاستە سالار، دوختۆرە ناسک بە خۆمی وت پێویستە حەفتەیەک بمێنێتەوە، یانی چی ئاوا زوو ئێزنیان داوە؟'

'بەڵێ، ئەم بەیانییە ئێزنیان دابوو، ئەمڕۆ لە خەستەخانەوە چەند جارێک تەلەفۆنیان بۆ ئێرە کردبوو، بە سارایان وتبوو گوایا هێڵی تەلەفۆنتان بچڕاوە، ئایا وایە سابات خان؟'

'نازانم سالار گیان، خۆ من لە ئێوارەوە چاوەڕوانی تەلەفۆنی سەلما و خانێم، بڕیار وا بوو کەی گەیشتنە بەغداد ئاگادارمان بکەنەوە، تۆ بڵێت وا بێت؟'

سالار هەردوو دەستی لە بەینی ڕانەکانیدا توند لێک گیر کردبوون و لەپەسا لێکی هەڵدەسوین، چەند دڵۆپە عارەقێک بە لاجانەکانیدا هاتنە خوار، کراسە سپییە ئوتووکراوەکەی سێ قۆپچەی سەرەوەی لێ ترازاندبوو، گەندەمووی سەرسنگی لە ئارەقەدا بە پێستیەوە نوسابوون، دوو هێڵی کەوانەیی سەرەوژوور، ئاسەواری ئارەقەی وشکەوەبوو بە کراس و بنباڵەکانیەوە دیار بوو.

لەو دەمەدا مەحموود هەستا و چوو بۆ هۆڵەکە، تەلەفۆنەکەیان لە هۆڵەکە لەسەر تەپلەکێکی دار دانرابوو، پاش ئەوەی هەڵی گرت و چەند هەناسەیەک نای بە گوێیەوە، داینایەوە و لە گەڕانەوەیدا لەناو دەرگای هۆڵەکەدا هەڵوێستەیەکی کرد و وتی، 'نووزەی لێوە نایەت، دەی خوا بیبڕێت، ئەوە دوو مانگە ڕامان کێشاوە، ڕۆژێک نەبوو بەتەواوی خەتمان هەبێت!'

باپیرە خایم لە مەحموودی ڕوانی و پێی وت، ’ئێ ڕۆڵە گیان ئیدی میرییە، بە کەیفی خۆی یاری بەو خەڵکە دەکات، ئیتر کێ دەسەڵاتی هەیە!‘

’وەی بەداخەوە، دەبێت سەلما و خانێ چەند تەلەفۆنیان کردبێت!‘

’دەی دەسەڵاتمان نییە ژنەکە، ئیتر خەتمان نییە و بڕایەوە، ئادەی ڕۆڵە مەحموود، بزانە لە یەکێک لەو ماڵە دراوسێیانەوە... بزانە کامیان خەتی تەلەفۆنیان هەیە، تەلەفۆنێک بۆ تەکسی بکە و بچۆ بەدوای ئەو خوشکەتا.‘

’کورە بەخوا باوکە وا بزانم لە هەموو ئەم گەڕەکی سابوونکەرانەدا دوو کەس تەلەفۆنیان نییە.‘

باپیرە خایم ڕووی کردە حەکیمی کوڕی و دەستی پان کردنەوە و پێی وت، ’ئەرێ کوڕی خۆم تەکسی چی و شتی چی، خۆ سارا لە ماڵی غەیرە نییە، هەروەها شوکور سالار سەیارەی خۆی پێیە، ئەگەر ئێوە بەو ڕازی بن، ئەوە ئێستا دەچین بەدوایدا و دەیهێنینەوە.‘

’من لە خزمەتتاندام.‘

’تۆ بڵێی سارا سییەکانی نەخۆش بن و پێویستی بە چارەسەری زیاتر هەبێت، ئەگەر وا بێت باشترە ئەم هاوینە سەردانێکی سەر دوختۆری شاری بەغدای پێ بکەین!‘

سالار بەهەڵەشییەکەوە ڕووی لە باپیرە خایم کرد و وتی، ’دەی بۆ لێرە ئەو دەوایە دەست ناکەوێت؟‘

’نا، نا کوڕی خۆم بەغداد باشترە.‘

پاش تاوێک بێدەنگی و لێکڕوانین، باپیرە خایم بەردەوام بوو و وتی، ’دەڵێم ڕۆڵە، سالار، بۆ ئەم هاوینە بە جێبەکەی تۆ نەچین بۆ بەغداد و سارا بۆ لای دوختۆر نەبەین؟‘

’بۆ نا، بەسەر چاو باپیرە گیان، من لە خزمەتتاندام.‘

لەو کاتەدا مەحموود وەک ورچ بە هۆڵەکەدا بێئارام لە ڕاستەوە دەچوو بۆ چەپ، لەبەرخۆیەوە وتی، 'کوڕە ئەو خەڕەکە شکاوە، بەخوا تا کەرکووکیشتان ناگەیەنێت!'

'ئەرێ باوە، بەغدای چی و سەر دوختۆری چی، بەو قرچەقرچی گەرمایە ئەو کچە ڕۆح دەر نابات و لەو ڕێگایەش دەخنکێت.'

لەناکاو سابات بە دەنگێکی بەرز و تێکشکاوەوە، برۆکانی هێنابوونەوە یەک و دەستێکی حەوا دا و فرمێسک لە چاویدا پەنگیان خواردبۆوە و لەوەدا بوون بڕژێنە سەر ڕومەتی، ڕووی لە حەکیمی مێردی کرد و وتی، 'بە هەر کلۆجێک بووە دەبێت بیگەیەنینە لای دوختۆرێکی باش، جا ئیتر بۆ تا هاوین بۆستین، خێرا و زۆر خێرا دەبێت چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە، بەخوا جوانە، ئەوە ئەو کچە دە ساڵ زیاترە بەو دەردەوە دەناڵێنێت، خۆش باوک و برا، بەخێر نەیەنەوە یاخوا، ئێوە دەبووایە دەمێک لەمەو پێش چارەیەکتان بۆ ئەو کچە بەستەزمانە بدۆزیایەتەوە.'

سابات پاش ئەوەی ئەو قسانەی کرد، لێوی توند لێک هەڵپێکان و ماسوولکەکانی دەموچاوی گرژ کرد، وەکو بیەوێت زیاتر بدوێت یان چاوەڕوانی وەڵامێک بکات، بێدەنگ چاوی داچرپیبوون و لە حەکیمی مێردی دەڕوانی، لەپڕ خۆی پێ ڕانەگیرا و دایە پرمەی گریان و سەری بەسەر کۆشیدا شۆڕ کردەوە، سابات زۆر بەکەساسییەوە دەگریا و بەتەواوی دەنگی گریانی لێ هەڵبڕی.

هەموو بەبێدەنگی لە ساباتیان دەڕوانی، بێدەنگییەک هۆڵەکەی داگرت، پاش ئەوەی سابات گریانەکەی هێواش کردەوە، تەنها گوێت لە لووشکەلووشکی بوو، ئینجا خۆی لەسەر کورسییەکەی گرمۆڵە کرد و تەواو بێدەنگ بوو، هەر وەکو لە هۆش خۆی چووبێت. پاشان سالار ئەو بێدەنگییەی شکاند و لە ناکاوێکدا هەستایە سەر

پێ و وتی، 'خاڵە گیان، من دەبێت بڕۆم، جا نازانم هیچ ئەمرێک یان کارێکتان بە من هەیە؟'

'باشە کوڕی خۆم، دەڵێم سەیارەکەت لەم نێزیکانە ڕاگرتووە؟'

'لە گەڕاجی سەعید تەها کۆیی.'

'وتـم، خۆم لەگەڵت بهاتمایە و سەرێکیشم لە کەتان دەدا و لەوێشەوە سارام لەگەڵ خۆمدا دەهێنایەوە.'

'زۆر باشە، من دەچم جێبەکەم دێنم و پێویست ناکات تۆ لێرەوە بە پێ بۆ ئەسحابەسپی بچیت.'

'باشە کوڕی خۆم، دەی دەستوبردی لێ بکە با درەنگ نەکەوین، تا سەگ و گورگەکانی میری بە جادە و کۆڵانەکاندا بڵاو نەبوونەتەوە، با تووشمان نەبێت بە تووشیانەوە و تووشی گێچەڵێکمان نەکەن.'

سـالار، چەند هەنگاوێکی نا .و چـووە نـاو دەرگـای هۆڵەکە و هەڵوێستەیەکی کرد و ئاوڕێکی دایەوە،

'دەی جارێکا بە خواتان دەسپێرم، دانیشن بەخێر.'

حەکیم و مەحموود سەریان داخستبوو، هەر وەک گوێیان لە سالار نەبووبێت و نووزەیان لێوە نەهات، سابات ڕاچەڵەکی و وەک تازە لە خەونێکی قووڵ ڕاپەڕیبێت، بەهەڵەشییەکەوە خۆی کۆ کردەوە و سەیرێکی سالاری کرد و هیچی نەوت، باپیرە خایم لە شانی سالارەوە ڕێی کرد و لەناو دەرگای حەوشەکەدا دەستێکی خستە سەر شانی سالار و بەچپەیەکەوە پێی وت، 'کوڕی خۆم، خۆت دڵگران مەکە و تۆ هیچ زەمبێکت نییە، تاکو حەکیمە فەنی و خولە کەر دەنگت لێ دابڕن، تۆ و سـارا جاحێڵن و پێگەیشتوون و حەقی خۆتانە، حەکیم ئەوە نازانێت ئەگەر کچەکەی دڵی نەچووایەتە سەر تۆ، حەتمەن چاوبڕکێ و دڵداریی لەگەڵ کوڕێکی تردا دەکرد، جا ئەو دڵخوازەی سارا هەر تۆ بیت باشتر.'

سالار سەری داخستبوو، لە پەسا دەستی لە یەک هەڵدەگلۆفین و ئەژنۆی دەلەرزین و لە بەرپێی خۆی دەڕوانی، باپیرە خایم بەردەوام بوو و وتی، 'دەی بە غاردانێک بڕۆ و گورج وەگەڕێ، ئەوە من چاوەڕوانتم.'

سالار هیچی نەوت، بە یەک هەنگاو سێ پێپلیکانەکەی بەردەمی دەرگاکەی بڕی و بێ ئەوەی ئاوڕ لە دواوە بداتەوە، خێرا بەڕاکردن خۆی گەیاندە ئەوسەری کۆڵانەکە و لە سووچی حەمامی موفتیدا لە چاو ون بوو، باپیرە خایم هێشتا لەناو دەرگاکەدا وەستابوو، پاش ئەوەی سالار لە چاو ون بوو، تاوێک بوو دەستی لێک هەڵپێکابوون و چەند جارێک بە ڕاست و چەپی کۆڵانەکەدا ڕوانی، پانیی کۆڵانەکە حەوت مەترێک دەبوو، لەو کاتەدا شار بێدەنگ و کۆڵان دەنگی کەسی لێوە نەدەهات، هەورێکی بۆر و لیخن لەدوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەوە بێجووڵە بە ئاسمانی شارەوە نووسابوو، بە درێژاییی ئەو کۆڵانە یەک گڵۆپی زەردەڵە دەگڕا، ئەویش بە پێش دەرگای حەمامی موفتییەوە بوو، زیاتر ئەو کۆڵانە بە ڕووناکی دارگڵۆپە بڵندەکانی سەر شەقامی سەرەکیی سابوونکەران ڕووناک دەبۆوە.

سالار تاوەکو گەیشتە سەر شەقامی سەرەکیی سابوونکەرانیش، هەر ڕای دەکرد، جەستەی نیشتبووە سەر ئارەقەیەکی گەرم و هەناسەی لێ بڕابوو، کاتێک لە پێش دەڕابەی دوکانێکی داخراودا هەڵوێستەیەکی کرد، وەکو دەیان کیلۆمەتری بە ڕاکرن بڕیبێت، خۆی لەسەر پێیەکانی بۆ ڕاگیر نەدەکرا و لەسەر سەکۆی بەردەمی دوکانێکدا دانیشت، کزەبایەکی سارد لە شاخی گۆیژەوە دەهات و ئارەقەی گەرمی جەستەی وشک دەکردەوە، هەستی دەکرد دڵی لە قەفەزەی سنگیدا وەختەبوو بفڕێت و بەردەوام خوێنێکی گەرم لە دڵیەوە بەرەو کۆی ئەندامەکانی لەشی شەپۆلی دەدا، هەموو ئازای

گیانی دەلەرزی و دانەکانی تەق تەق دەیاندا بەیەکدا، بە دەنگێکی لەرزۆک و گڕ، لەبەرخۆیەوە وتی، 'چی بکەم، ئێستا من چی بکەم، سارا گیان وتم با پێیان نەڵێین و جارێکا کەس پێمان نەزانێت، با کەس... ئیتر کەس نەزانێت دڵخوازی یەکین.'

سالار لە قووڵایی خەیاڵیدا نوقم بووبوو، ئەو زیاتر خەمی دڵی پاپیرە خایمی بوو، حەکیم و سابات لە ژیانی ئەودا لە جێگای دایک و باوکی دووەم بوون، هەروەها مەحموود هاوتەمەن و هاوڕێی ژیانی بوو، سالار هەردەم ئەوانەی لەپێش چاو بوو، بەڵام ئەو لەنێوان خۆشەویستیی بۆ سارا و ڕاگرتنی ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ ئەواندا هەیبوو، گیری خواردبوو، هەرچەندە تاکو ئەودەم خۆی یەکلایی نەکردبۆوە، ئایا بەنیازی چییە و داواکاریی ئەو لە ژیان چییە، لە خۆشەویستیی بۆ سارا بێگومان بوو، بەڵکو بوونی بە ئەندام و بەشداریکردنی لە چالاکییەکانی قوتابیان و لاواندا تەواو ڕێڕەوی خەیاڵەکانی ئەویان گۆڕیبوو، کاتێک سالار لەم خەیاڵانەدا بوو، سەیارەیەک لە خواری شەقامی سابوونکەرانەوە پەیدا بوو، بە بەردەمیدا تێپەڕی و خێرا بۆ کۆلانی حەمامی موفتی لای دا، سالار هەستا و دەستێکی بە سەروقژیدا هێنا و چرچیی پانتۆڵە تەسکە شارستۆنییەکەی ڕاست کردەوە، هەر وەک چۆن باپیرە خایم داوای لێ کردبوو، دیسان گوڕی دایە بەر خۆی و بە جادەی سابوونکەراندا بەڕاکردن بەرەو خوار داگەڕا، کاتێک خۆی کرد بە کۆڵانی قەزازەکاندا، دوو گەنج لە سەرسووچی ئەو کۆڵانە و سەر سەکۆی بەردەمی دوکانی خومچییەکەدا وەستابوون، بە دەنگێکی بەرز و بەکۆرس قاویان کرد، 'ئەوەتا، ئەوەتا، خۆیەتی، خۆیەتی، بیگرن با ڕانەکات.'

سالار بێ ئەوەی گوێیان پێ بدات و تەنانەت ئاوڕیشیان لێ

بداتەوە، هەنگاوەکانی خێراتر کردن و لێیان دوور کەوتەوە، گوێی لێ بوو لە دوایەوە دوو کەسەکە قاقایان لێ دەدا و پێدەکەنین.

کاتێک گەیشتە ناو گەراجی سەعید تەها کویی، جێبە کورتەکەی ئەو تەنیا سەیارە بوو کە لەو گەراجە وەستابوو، کاتێک سالار لە دەرگای گەراجەکە هاتە دەر، دوو پیاوی کوڵەباڵ لە شان لە بەردەمی جێبەکەیدا پەیدا بوون، ئەوەندە لە نەدیوی و کوتوپڕ هاتنە پێش جێبەکەی سالار فریای ئیستۆپکردن نەکەوت و دەستی شکاندەوە و چووە سەر سەکۆی بەردەمی دوکانێک، هەردوو دەستی توند بە سوکانەکەوە گرتبوو، لە ترساندا گیانی دەلەرزی و هەناسەی لە سەرسنگیدا پەنگی خواردبوو، دوو کابرا کوڵەباڵ لەبەرەکە هاتبوونە لای ڕاست و چەپی جێبەکە، هەردووکیان بە کۆڵەمست بەربوونە لێدانی جامی لای ڕاست چەپ و هاواریان لە سالار دەکرد، 'هەڵمان گرە، پیاوی خاس بە برا، بۆ خاتر خوا هەڵمان گرە.'

لەو کاتەدا ژن و پیاوێکیش لە بەردەمی ئوتێل مەحوییەوە بەڕاکردن بەرەو لای جێبەکەی سالار دەهاتن، پیاوێکی کەڵەگەتی بەژن زەڕاف و ژنێکی کورتەباڵای گرگنە بوون، هەردووکیان بەدەم ڕاکردنەوە بانگیان دەکرد، پاشان هاتنە سەر شۆستەی نێزیکی جێبەکەی سالار وەستان، سالار بێ ئەوەی گوێیان پێ بدات و تەنانەت لێشیان بڕوانێت، بەتووڕەییەوە گێڕی گۆڕی و پاشەوپاش گەڕایە دواوە، جێبەکەی لەسەر سەکۆکە داگرت و لەناو دەرگای گەڕاجەکەدا وەستا، کاتێک گێڕی گۆڕی و ویستی بڕوات، دوو کابرا کوڵەباڵ لەشانەکە و ژن و پیاوەکە لەسەر شەقامەکە بە ڕیز وەستان و لەبەر ڕووناکیی لایتی جێبەکەدا هەرچواریان دەستیان لە حەوادا و بانگیان لە سالار دەکرد، سالار دەستی لەسەر هۆڕن

دانا و پێی لە بەنزین داگرت و بەرەو ڕوویان جێبەکەی لێخوڕی، هەرچواریان لە تاوان لەبیریان چووەوە ڕاکەنە سەر سەکۆی ڕاست و چەپی شەقامەکە و ناچار بوون بەسەر شەقامی ئەسحابەسپیدا لەپێش جێبەکەی سالارەوە ڕاکەن، کاتێک ئەوان بەرەو شەقامی سالم لە پێش جێبەکەی سالارەوە ڕایان دەکرد، ناوبەناو ئاوڕیان دەدایەوە و بانگیان لە سالار دەکرد، 'کوڕە بۆ خاتر خوا هەڵمان گرە... کوڕە ماڵخراو هەڵمان گرە.'

سالار فرسەتی هێنا و پێچێکی بە جێبەکەی دا و گەڕایەوە، پاشان بەرەو ڕووی بەردەرکی سەرا لێی خوڕی و خۆی لەدەستیان ڕزگار کرد، سالار لە بەردەم ئوتێلی شەعبەوە و لە بەردەرکی سەراوە بە شەقامی سابوونکەراندا هەڵگەڕا، بێجگە لەوەی لە بەردەرگای سەرادا دوو پۆلیس لە شانی یەکەوە وەستابوون و لەگەڵ یەک دەدوان، ئەو شەوە کەست بە ڕووی ئەو شەقام و کۆڵانانەوە نەدەبینی، کاتێک سالار گەیشتە سەر کۆڵانی حەمامی موفتی و دەستی شکاندەوە و جێبەکەی بۆ ناو کۆڵانەکە لێخوڕی، لەو کاتەدا بارانێکی بەلێزمە دەباری، فلچەی جامی پێشی جێبەکەی سالار فریای ماڵینی ئەو هەموو ئاوی بارانە لەسەر ڕووی جامەکە نەدەکەوت، گرمە و ناڵەناڵی هەور و دادانی هەورەبرووسکە بە جۆرێک بوو، لە ترساندا دەستی لە سوکانەکەی بەر دا و لەناو کۆڵانەکەدا تاوێک وەستا، پاشان دەستی توند بە گوێیەوە گرت، بەملاولای خۆیدا ڕوانی و لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەرێ ئەو تۆفانە چییە؟'

هێواش بە بەردەمی دەرگای حەمامی موفتیدا لێی خوڕی و لە بەردەمی ماڵی سارای دڵخوازیدا جێبەکەی ڕاوەستاند، لایتی جێبەکەی تاکو ئەوسەری کۆڵانەکەی ڕووناک کردبۆوە، کاتێک

لە بەردەمی دەرگاکەدا وەستا و دەرگای جێبەکەی کردەوە، ڕەشەباکەی ئەوەندە بەهێز بوو لە دوور و نێزیک دەنگی چینکۆ و دار دەهات، لەو کاتەدا کارەبای گەڕەک خامۆش بووبوو، لە کۆتاییی کۆلانەکە چرایەکی زەرد لە پەنجەرەی بالاخانەیەکەوە بە بەرزییەوە دەگرا، سالار بەدەم لەرزین و ترسەوە لە جێبەکەی دابەزی و چەند جارێک لەپی دەستی بە ڕووی دەرگا تەختەکەدا کێشا، پاشان گەڕایەوە تەنیشتی جێبەکەی و تاوێک بە ماڵەکەدا لە سەر بۆ خوار هەڵی ڕوانی، پەنجەرەکان ڕووناکییان تێدا بەدی نەدەکرا، پەردەی هۆڵی دانیشتنەکە دادرابوویەوە و تاریک دیار بوو، پاشان بە نووکی پێی چەند جارێک لە دەرگاکەی هەڵدا، لەبەر بارانەکەدا وەستابوو، بیری لەوە دەکردەوە، کە پێ دەچێت بە زۆری حەکیم و مەحموود بۆ ماڵی ئەوان بەدوای سارادا چووبن.

پاشان چوو لەناو جێبەکەیدا بێدەنگ دانیشت، ڕەشەباکە بەو کۆلانەدا بارانی بەلێزمەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا و بە ڕووی شووشەی جێبەکەدا دەیڕشت، پانتۆڵ و کراسەکەی تەڕ بوون و بەردەوام جەستەی لە سەرمادا دەلەرزی، بێزاری و جەنجاڵیی ناو خەیاڵەکانی ئەوەندەیان ماندوو کردبوو، هەستی بە جەستەی تەڕ و تەزیوی نەدەکرد.

لە خەیاڵی خۆیدا لە خۆئامادەکردندا بوو، تاکو بگەڕێتەوە ماڵەوە و بچێتە بەردەمی حەکیم و مەحموود و پێیان بڵێت، 'بەڵێ من سارام خۆش دەوێت و پەشیمانم لەوەی دەستم خستە نێو دەستی ئێوە و گفتم پێ دان ئیتر توخنی ماڵی ئێوە و سارا نەکەوم.'

هەرچەندە هەوڵی دا، نەیتوانی لە خەیاڵی خۆیدا بڕیاری ئەوە بدات، تاوەکو بتوانێت بەرەو ڕووی حەکیم و مەحموود ببێتەوە، یان نەیدەویست لە پێشچاوی باپیرە خایمدا ئەوە بە حەکیم و مەحموود

بڵێت، سالار ئەوەندەی ڕێز و خۆشەویستی بۆ باپیرە خایم هەبوو، نەیدەویست لە پێشچاوی ئەودا بەو جۆرە ڕەقی بنوێنێت، چونکە لە سالانی ڕابردوودا باپیرە خایم جێگای باوکی بۆ ئەو پڕ کردبوویەوە، سالار لە زمانی سارا و مەحموودەوە خایمی بە باپیرە بانگ دەکرد، لەو کاتەوەی یەعقووبی باوکی کە ئامۆزای باپیرە خایم بوو، لە بەینی بازیان و دێلێژەدا جەردە هاتبوونە سەر ڕێگای و کوشتبوویان و پاشان کەلوپەل و پارەکەیان بردبوو، جووتیارەکانی گوندی دێلێژە خۆیان بە دەستی خۆیان یەعقووبیان داگرتبوو، کاتێک بەسەربڕاوی و بەسەروخواری بە پەلی دارێکدا هەڵیان واسیبوو، یەکێک لە جووتیارەکان بە باپیرە خایمی وتبوو، 'لاشەی ئەوەندە ساردوسڕ بوو، هەرچیی خوێن لە ئازای گیانیدا بوو داچۆڕابوو.'

پاشان جووتیارەکان یەعقووبیان بردبووە مزگەوتەکەی دێلێژە و لەوێ لە مەیتخانەکە دایان نابوو، ئەو ڕۆژە ڕێکەوتی مانگی تەممووزی کردبوو، مەلای مزگەوتەکە و خەڵکی دێی دێلێژە لەبەر بۆگەنی لاشەکەی هەر ئەو ڕۆژە دوای شۆرین و کفنکردن، لەگۆڕیان نابوو..

دوای سێ مانگ گەڕان و سۆراغکردن، باپیرە خایم دەچێتە گوندی دێلێژە، کاتێک لەگەڵ مەیتشۆرەکەدا دەدوێت، دەزانێت ئەوە یەعقووبی ئامۆزا و زاوایەتی، کاتێک باپیرە خایم لەگەڵ مەلای دێی دێلێژەدا بۆ سەر گۆڕی یەعقووب دەچێت، ئەمەی بە خەیاڵدا دێت و بە خۆی دەڵێت، 'ئێستا من تەرمی یاقووب بۆ کوێ بەرمەوە، دوای ئەوەی قەبرسانی جوولەکەکانی شاری سلێمانی بەر شالاوی هەڵدانەوە و تێکدان کەوتووە، باوەڕ ناکەم گۆڕ نەبێت بە دەستی کفندزەکانی شار چەند جارێک هەڵنەدرابێتەوە!'

باپیرە خایم بڕیار دەدات دەستکاریی قەبرەکەی یەعقووب نەکات، ڕازی دەبێت بەوەی یەعقووبێکی جوولەکەمەزهەب لە گۆڕستانی

موسوڵمانانددا بنێژرێت، لەلای خەڵکی دێی دیلێژەش باسی هیچ ناکات، پێش ئەوەی لەو گوندە بڕوات، مجەوری مزگەوتەکە بانگ دەکات و دینارێکی لوولکراوی دەخاتە دەست و داوای لێ دەکات، کە دوو تاشەبەردی بەرز بۆ کێلی گۆڕی ئەو پیاوە کوژراوە دابنێت.

یەعقووب لە تەمەنی حەڤدەساڵییەوە لەگەڵ کەتانی خوشکی باپیرە خایمدا هاوسەرگیرییان کردبوو، پاشان دوای زیاتر لە بیست ساڵ، یەعقووب و کەتان کوڕێکیان دەبێت و باپیرە خایم خۆی ناوی سالاری لێ دەنێت.

بە درێژاییی ئەو شەوە ڕەشەبا و باران و تۆفان بەردەوام بوو، کاتێک سالار لە گەڕەکی سابوونکەرانەوە بەرەو بەردەرکی سەرا دەڕوات، کۆڵان و شەقامەکان پڕ بووبوون لە ئاوی باران، سالار بەئەستەم ڕاستە شەقامەکانی لە شۆستەکانی ڕاست و چەپ بۆ جیا دەکرایەوە، بێزاری و ماندوێتی بە ڕەنگییەوە دیار بوو، کاتێک گەیشتەوە گەڕەکی جوولەکان، لە دەنگی لافاوی چەمەکەی پێش ماڵیاندا بەئەستەم گوێی لە دەنگی مەکینەی جێبەکەی بوو، لەو کاتەدا لە گەڕەکی جوولەکانیش کارەبا بڕابوو، هێشتا باران بەخوڕ دەباری و ڕەشەبا سەمای بە دار و درەختەکان دەکرد، گرمەی هەور و زریکەی هەورەتریشقە بەسەر شاردا هاواریان دەکرد.

سالار لە جێبەکەی دابەزی و بەڕاکردن خۆی گەیاندە نێو حەوشەی ماڵی ئەمینی مریەم، ئەو خانووە بێجگە لە ماڵی سالار، سێ ماڵی تری تێدا بوو، خانووبەرەیەکی دووقات و لە خشتی سوور دروست کرابوو، هەر وەک سەرجەم خانووەکانی تری گەڕەکی جوولەکان، پەنجەرەی سەر و خواری بالاخانەکە بە چرا و لۆکز ڕووناک کرابوونەوە، سالار لەگەڵ کەتانی دایکیدا لە ژوور و هەیوانێکی قاتی سەرەوەدا دەژیان، کاتێک سالار بە قاڵدرمەکاندا ویستی بۆ قاتی سەرەوە بچێت، ڕەشەبا

چەند جارێک بە ڕاست و چەپدا خستی و وەختەبوو بۆ ناو حەوشەکە بەر بێتەوە، کاتێک گەیشتە بەر هەیوان و نێو دەرگای ژوورەکەیان، لەبەر ڕووناکیی چرای هەیوانەکەدا لە جلە تەڕەکانی ڕوانی، پاشان دەرگای ژوورەکەی کردەوە و بینیی سارا و کەتانی دایکی سالار بە شانی یەکەوە بەرامبەر دەرگاکە دانیشتبوون، کەتان دەستی لەسەر کۆش و لەناو دەستی سارا دانابوو، دیار بوو چاوەڕوانی سالاریان دەکرد، هەردووکیان لەگەڵ گرمەی هەورەتریشقەکاندا زیاتر خۆیان کۆ دەکردەوە، سارا لە تاواندا دەلەرزی و کەتانیش لەبەرخۆیەوە بەردەوام نزای دەکرد، سالار لەناو دەرگاکەوە لێی ڕوانین و پێی وتن، 'وام زانی میوانمان هەیە، دەی باپیرە خایم و ئەوان نەهاتن؟'

دایکی دوای ئەوەی دەستی لەناو دەستی سارا دەر هێنا، هەستایە سەر پێ و بەرانبەر سالار وەستا، هەردوو دەستی لێ پان کردەوە و بەبێزارییەکەوە، 'خایمی چی و ئەوانی چی، کەی ئەمشەو کاتی دێنی و چوونە سەر مالانە، ئەرێ ڕۆڵە تۆ بەم تۆفانە لەکوێ بوویت، دەزانیت تۆ لە کەیەوە ڕۆیشتوویت، ماڵتم بە قوڕ گرت.'

سارا زەردەیەکی هێنایە سەر لێوی و بەنازێکەوە، 'دایکم و ئەوانت بینی، دەی سالار گیان، پێت وتن من لێرەم؟'

'چۆن؟ بەڵێ... ئا، ئا پێم وتن.'

## ٩

هەفتەیەک دوای شەوی تۆفانەکە، سالار و سارا پێکەوە بۆ کەنیسەی مریەم لە گەڕەکی گاوران چوون، ئەودەم قەشە یوسف پەری لەوێ بوو، سالار کاتێک قەشە یوسف پەریی بینی، ڕووی گەشایەوە و بەدەم پێکەنینەوە بەرەو ڕووی چوو، باوەشیان بە یەکتریدا کرد، کاتێک سالار دەستی لە شان و ملی قەشە یوسف کردەوە، ئاوڕی لە سارا دایەوە و وتی، 'سارا، ئەوە قەشە یوسفە، هاوڕێ و خۆشەویستی باپیرە خایمە.'

'تەنها هاوڕێ، خایم هەردەم لە جێگای برایەکم بووە.'

دوای ئەوەی قەشە یوسف ئەوەی وت، پاشان تاوێک بێدەنگی لێ کرد و لەژێر لێوەوە دەستی کرد بە نزاخوێندن.

قەشە یوسف، پیاوێکی بالآبەرز و بەژنباریک بوو، تەمەنی سی ساڵێک دەبوو، ڕیش و سمێڵێکی قەڵەمیی ڕەش و قژێکی کورت، چاوەکانی ڕەشی قەترانی و گەش، سەرتاپا کۆستۆمێکی قەشەی کلدانیی ڕەشی پۆشیبوو، دوای ئەوەی قەشە یوسف ئەمەی وت، باڵی بەرەو ڕووی سارا پان کردنەوە، 'سارا خان، کچی حەکیمی بازرگان، دڵم زیاتر دەکرێتەوە ئەگەر بڵێم، سارا کوڕەزای خایمی برا و هاودەنگم.'

سارا بەرانبەری قەشە یوسف وەستابوو، چاوی داچڕیبوون و بەسەرسامییەوە لێی دەڕوانی، کاتێک ناوی باوکی و باپیرەی برد، زیاتر بەسەرنجەوە لە چاوە ڕەشەکانی قەشە یوسفی ڕوانی،

وەکو قسەکانی ئەو هیوایەکیان بە دڵی سارا بەخشیبێت، پاشان سارا بەرەو ڕووی چوو، دەستی ڕاستی قەشە یوسفی گرت و توند گوشی و ماچێکی پشتی دەستی کرد، قەشە یوسف دەستی لە دەستی سارا دەر هێنا و هەردوو دەستی خستنە سەر شانەکانی و لە خۆی نێزیک کردەوە و ماچێکی سەری کرد و پێی وت، 'کچی خۆم، هەست بە ئازاری ئەو دڵە شکاوەت دەکەم، هەر وەک چۆن بەردەوام من لەگەڵ ئازارەکانی ئێوەدا ژیاوم و دەژیم، خوا ئاگاداری هەموو شتێکە، خوا ئاگاداری پاکی و ناپاکیی بەندەکانی خۆیەتی، داواکارم لە خوا بە کەسوکارت شادت بکاتەوە.'

سارا، بێدەنگ بەرانبەر قەشە یوسف وەستابوو، چاوی پڕ بوون لە فرمێسک و بەردەوام ئازای گیانی دەلەرزی، لەو کاتەدا سالار بەماتەمینییەکەوە لە سارای دەڕوانی، قەشە یوسف داوای لێ کردن بچنە ژووری دانیشتینی خۆی و لەوێ پێکەوە چا بخۆنەوە و درێژە بە قسەکانیان بدەن.

پاش ئەوەی بە ڕاڕەوی کەنیسەکەدا بەڕێوە بوون، سارا بەردەوام بەملاولایدا لە ژوور و باخی کەنیسەکەی دەڕوانی، بەڵام سالار لە منداڵییەوە چەندین جار هاتبووە ئەو کەنیسەیە و دیمەنەکان بەلایەوە غەریب نەبوون، دواجار لەگەڵ باپیرە خایمدا بۆ لای قەشە یوسف پەری هاتبوو، کە پێکەوە باسی ڕۆیشتن یان مانەوەیان کردبوو، لە کاتێکدا ئەوان تاکە خێزانی جوو بوون لەناو شاری سلێمانیدا مابوونەوە، ئەو ڕۆژە قەشە یوسف پەری ڕێنمایی باپیرە خایمی کردبوو، کە بەڵکو بگوێزنەوە و لە جوولەکانەوە بێنە گەڕەکی گاوران بژین.

کاتێک سالار لەگەڵ قەشە یوسفدا لە باس و یادکردنەوەی باپیرە خایمدا بوون، گەیشتبوونە ژوورێکی تەختەڕێژکراو و بە

چواردەوریدا کتێبخانە بوو، دوای ئەوەی هەردووکیان لە شانی یەکەوە و لەسەر دوو کورسی دانیشتن، قەشە یوسف پەری ، لەسەر مێزەکەی خۆی لە سوراحییەک دوو پەرداخ ئاوی بۆ تێکردن، پاشان کورسییەکی هەڵگرت و هێنای بەرانبەریان دای نا و لەسەری دانیشت، دەستی کرد بە گێڕانەوەی یادگارییەکانی خۆی لەگەڵ باپیرە خایمدا، 'خایم، هەردەم یەکێکە لە پیاوچاکەکانی ئەم شارە و لەگەڵ ئەوەشدا نیشتمانپەروەرێکی بێوێنەیە، پەیوەندیی من و خایم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتانەی لە سیمینێر سەرقاڵی خوێندن بووم، کاتێک لەم ژوورەدا، قەشە عمانوئیل حداد خایمی بە من ناساند، تازە بۆ سەردان و پشوو لە سیمینێری موسڵەوە گەڕابوومەوە، بێجگە لەوە لە باوکم و کەریمی عەلەکەی ڕەحمەتی و چەندین ژن و پیاوی تری مەسیحیم بیستووە، کە خایم لە ساڵانی سەردەمی شێخ مەحموودا و پاشان ساڵانی سەردەمی داگیرکەرانی ئینگلیزیشدا بەردەوام پەیوەندیی لەگەڵ سەرجەم مەسیحییەکانی سلێمانیدا هەبووە، لە خۆشی و ناخۆشیدا هاوخەم و پشتوپەنای یەکتری بوون. ئەوسا من لاوێکی تەمەن دوازدە ساڵان بووم، ئەو ڕۆژانەم باش لەبیرە، کاتێک لە سەرانسەری عێراقدا جوولەکەکانیان قڕ دەکرد، بەتایبەتی ساڵی ١٩٤١ و ئەو ڕۆژانەی ماڵ و موڵکی جووەکانیان فەرهوود کرد، لە بەغداد زیاتر لە هەزار کەسیان لێ قەتڵوعام کردن، بەبیرم دێت لەو ڕۆژانەدا چوار ماڵی جوولەکە بەنهێنی لەم کەنیسەیە دەژیان، وا بزانم لە شاری کەرکووکەوە ڕایان کردبوو، خایم هێنابوونی بۆ ئێرە و قەشە عمانوئیل حداد جێگای کردبوونەوە و پەنای دابوون، ئەو لێقەوماوانە دوو کوڕی هاوتەمەنی منیان هەبوو، لە ڕاستیدا نازانم ئەوان چەند لێرە مانەوە و پاشان چییان لێ بەسەر هات، ئێستاش ناوەکانیانم لەبیر ماوە،

دانیاڵ و ئادەمیان ناو بوو، ئەو ماوەیە لەگەڵ ئەو دوو کوڕەدا تەواو هاوڕێ و هاودەنگی یەکتری بووین، جا سالار، کچی خۆم سارا خان، ئەوە نموونەیەکی بچووکە لەو تەمەنە درێژەی ئێمە پێکەوە لەم شارەدا بەسەرمان بردووە، ئیتر هەڵگری هەر دیانەتێک بووبێتین، دایم ئێمە لەم شارەدا وەکو دۆست و هاوڕێ پشتوپەنای یەکتری بووین.

ئەو ساڵانەی من لە شاری موسڵ بووم، هەموو هەفتەیەک سەردانی ئەم کەنیسەیەی دەکرد و لەگەڵ قەشە جبرائیل ماریدا باسی گوزەرانی جوولەکە و مەسیحییەکانیان دەکرد، هەرچەندە خایمی باپیرەتان بە تەمەن زۆر لە من گەورەترە، بەڵام هەردەم هاوڕێ و هاودەنگی یەکتری بووین، بێجگە لەوەی ئەو پیاوە زۆرینەی گەنجی ئەم شارەی فێری نیشتمانپەروەری کردووە، لێتان ناشارمەوە بەندەش یەکێک بووم لە قوتابیانی ئەو، سالار مەبەستم لە شۆڕشی پارتییە و با ڕێبازە کۆمۆنیستییەکەی باپیرەت و تۆی لێ بەدوور بێت.'

سالار، لە جێگای خۆیەوە، 'بەڵێ قوربان، زۆر باش لە مەبەستی جەنابت تێ دەگەم.'

قەشە یوسف لە قسەکانی بەردەوام بوو و وتی، 'هەڵبەتە هەر پارت و گرووپێک بەردێک بنێتە سەر ئەو وشکەکەڵەکەی ئێمە پێکەوە کوردستانی پێ بونیاد دەنێین، من ئامادەم ڕێزی لێ بگرم و پشتیوانی بم و شانازییشی پێوە بکەم، چونکە من دڵنیام لەوەی جوولەکە بێت یان مەسیحی یان هەڵگری هەر دین و دیانەتێکی تریش بێت، بێ نیشتمان و بێ سەربەستی نەتەوەییمان جێگامان لێژە و ژێرپێمان قوڕ و چڵپاوە، ئەوە چەندین ساڵە بە سیاسەتی عەرەبی شۆڤێنستی ڕاوی کوردانی جوولەکە دەکەن و هەموویان

بۆ وڵاتی غەریبی دەربەدەر کردن، بۆ ئەم وڵاتە نیشتیمانی باووباپیرانی ئەوان نەبوو؟ من دڵنیام ئەوە پلانە و ڕۆژێکیش دێت ئێمەی مەسیحییش بە هەمان دەردی جووەکان دەبەن، جا لەبەر ئەوە، سالار کوڕی خۆم، گرنگە ئێمە هەردەم دژی فیکری عەرەبە شۆڤێنستەکان بوەستینەوە، کە خۆیان لە بەرگی ئیسلامدا گۆڕیوە و بە ناوی دین و پەرەپێدانی ئەو دینەوە خەریکی بڵاوکردنەوەی عەقڵ و زمانی عەرەبی و بەرفراوانکردنی نیشتیمانی عەرەبین، لە ڕاستیدا ئەوان دینێکی ئیلاهییان داگیر کردووە و بەکاری دەهێنن لە پێناوی بەرژەوەندیی نەتەوەپەرستیی خۆیاندا، خوا خۆی گەورە و سەروەرە و ئاگاداری هەموو شتێکە، سالار، سارا کچی خۆم... ئێوە بەرەو هەر جێگایەک بڕۆن و لە هەر جێگایەک بگیرسێنەوە ئەوەتان لەبیر نەچێت، کە ئێوە خەڵکی ئەم شارەن و کوردستان نیشتمانی ئێوەیە، سبەینێ ئێوە لە بەرامبەر گوزەرانی نەوەی داهاتووتاندا بەرپرسیارن، منیش هەردەم دوعای بەخێرتان بۆ دەکەم، بێجگە لەوەی ئێمە دۆست و ناسراوی یەکترین، ئێوە عەبدی خودان و زوڵمتان لێ کراوە!'

چەند هەناسەیەک بوو قەشە یوسف بێدەنگ بووبوو، چەند جارێک لەژێر لێوەوە لەگەڵ خۆیدا دەدوا و بە دەستی ڕاستی بەرەو ناوچەوانی و پاشان شانی چەپ و ڕاستی برد و دەستی لێک هەڵپێکان، خۆی بەسەر سنگیدا نووشتاندەوە و چاوی توند نووقاند، سالار خۆی لێ بردبووە پێش و بێدەنگ لە قەشە یوسفی دەڕوانی، وەکو ئەوەی بیەوێت شتێک بڵێت و بەڵام نەی دەویست قەشە یوسف لەو چوونەخەڵوەتەی داببڕێت، سارا پاڵی دابوویەوە و چاوی زرت و تەڕ فرمێسکیان لێ دەچۆڕا و لە کتێبخانەکەی قەشە یوسفی دەڕوانی، سالار تاوێک لە سارای ڕوانی و لەبەرخۆیەوە

وتی، 'قوربان ویستم ئەوەت عەرز بکەم، ئەگەر بتوانیت هاوکاریمان بکەیت و سۆراغێکی کەسوکاری سارامان بۆ بکەیت.'

'سالار، ئێوە بچنەوە ماڵی خۆتان و ئاگاداری خۆتان بن، من دۆست و هاوڕێکانم ئاگادار دەکەمەوە، نەک تەنها لە سلێمانی، بەڵکو هەواڵ بۆ شارەکانی تری عێراقیش دەنێرم، بەڵکو بە زووترین کات مەعلووماتمان دەست بکەوێت.'

## ١٠

'لە حەوسەڵەمدا نەماوە و هەرچۆنێک بووە سەری خۆم هەڵدەگرم و لەم کاولبووە دەڕۆم!'

سارا ئەو قسەیەی باوکی بەردەوام لە خەیاڵیدا دووبارە دەبوویەوە، هەروەها دوودڵ بوو لەوەی دایک و باوکی بەو جۆرە و بەبێ ماڵئاواییکردن ئەویان بەتەنیا لە پاش خۆیان جێ هێشتبێت!

دوای ئەو ڕۆژەی سالار و سارا سەردانی کەنیسەی مریەمی عەزرایان کرد و قەشە یوسف پەرییان لەو ڕووداوە ئاگادار کردەوە، سالار لەگەڵ حەمەجان سەلیمدا بۆ کەرکووک چوون، ناونیشانی دۆست و ناسراوی حەکیمی باوکی سارا و باپیرە خایمی لە دەفتەرێکدا نوسیبوو، ڕۆژێک پێش ئەوەی بەڕێ بکەون، سالار بە حەمەجان سەلیمی وتبوو، 'ئیتر ئەگەر مانگێکیشمان پێ چووە ناگەڕێینەوە تاوەکو تەواوی ئەو دۆست و ناسراوانە نەبینین و سۆراغێکیان نەکەین.'

هەروەها سالار بە سارای وتبوو، 'سارا گیان بەڵێن بێت، تاوەکو هەواڵێکیان نەزانم ناگەڕێمەوە!'

دوای دوو حەفتە، سالار و حەمەجان سەلیم بێهیوا گەڕانەوە، لە سەفەرەکەیاندا سالار هەستی بەوە کردبوو ڕۆیشتنی باپیرە خایم چەندە کاریگەریی لەسەر حەمەجان سەلیم هەبوو، بەجۆرێک هەستی بەتەنیایی و دڵشکان دەکرد، دوو ڕۆژ دوای گەڕانەوەیان

حەمەجانی سەلیم حاجی پێنجوێنی لە نیوەی شەودا و لەناو جێگای خەودا جەڵدەی دەماخ لێی دەدات و سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە ساشای ژنی بەمردوویی لەناو جێگاکەیدا ڕێکەوتی دەکات.

لەدوای دیارنەمانی باپیرە خایمەوە، حەمەجان بەردەوام ئەوەی بە ساشای ژنی وتبوو، 'ئیتر دەبێت ژیان بەبێ خایم بۆ من چ مانایەکی هەبێت، هەرچەندە بیر دەکەمەوە و سەرنجی لێ دەیەم ترووسکایی تێدا بەدی ناکەم!'

دوای ئەوەی حەمەجانیان لە گردی سەیوان ناشت، سێ ڕۆژ لە مزگەوتی حاجی حان پرسەیان بۆ دانا.

دوای پرسەی حەمەجان، کەتان، سالار و عەبەی کوڕی ئەمینی مریەمی خاوەن ماڵی ڕاسپارد، تاوەکو سەردانی پۆلیسخانەکانی ناوشار و دەزگای ئاسایش بکەن، کە ئەویش تەنها لەبەر ڕازیکردنی دڵی سارا بوو.

مانگێک بەسەر دیارنەمانی دایک و باوکی سارادا تێپەڕیبوو، لەدوای ئەو ڕووداوەوە سالار نەیدەویست سارا بەتەنیا لە ماڵەوە جێ بهێڵێت، ناچار بوو بۆ هەر جێگایەک دەچوو لەگەڵ خۆیدا دەیبرد، هەروەها ئێواران سەردانی هاوڕێکانی نەدەکرد و لە ماڵەوە لای سارا دەمایەوە.

ئەوەی لای سالار جێگای گومان بوو، دوو مانگ دوای ئەو ڕووداوە، خانووەکەی ماڵی باوکی سارا لە گەڕەکی سابوونکەران، خێزانێکی کوردی فەیلیی تێیدا دەژیا، خاوەن ماڵی نوێ بە سالاری وتبوو، گوایا ئەو لە بەغدادەوە هاتووە و خانووەکەی لە حەکیم ناوێک کڕیوە، پاشان حەکیم خایم بە ماڵ و منداڵەوە بۆ ئیسرائیل گەڕاوەتەوە، سالار ئەم هەواڵەی لە سارا شاردەوە و بۆی باس

نەکرد، بەڵام لەگەڵ سامی فەرەجی هاوڕێیدا بەنهێنی خەریکی ئاشکراکردنی ئەو مەتەڵە بوون.

کات تێپەڕی و سارا هەواڵێکی کەسوکاری دەست نەکەوت، بێزاری و تێنەگەیشتن لە ڕووداوەکان خەیاڵیان شێواندبوو، بۆ دوو مانگ دەچوو بەناڕەحەتی دەخەوت و خواردنی کەم دەخوارد، شەو و ڕۆژ بێدەنگ لەسەر بەڕەیەک لەبەر پەنجەرەکەدا دانیشتبوو، قسەی لەگەڵ کەسدا نەدەکرد، بەردەوام تەوراتەکەی کەتانی بەنووزەنووز دەخوێندەوە و لەبەرخۆیەوە و نزای دەکرد.

سارا زوو زوو لە سالاری دەڕوانی و لەژێر لێوەوە پێی دەوت، 'بۆ؟ بۆ ڕاستییەکانم پێ ناڵێیت؟'

دوای ئەوەی سالار بەناچاری بە سارای وتبوو، 'ئەو شەوە سەردانم کردن، بەڵام، کاتێک چووم جێبەکەم بێنم و لەگەڵ باپیرە خایم بێین بەدوای تۆدا، ئیتر کاتێک گەڕامەوە! نازانم بۆچی ئەوان بێسەروشوێن بوون و ماڵەکە چۆڵ بوو.'

سارا لە وەڵامدا بە سالاری وتبوو، 'ئیتر تۆ ناتەوێت ڕاستییەکانم پێ بڵێیت! هەست دەکەم درۆت لەگەڵ کردووم، کاتێک منت بەزۆر لە خەستەخانە هێنایەوە ماڵی خۆتان، نازانم تۆ ئەو پەلەپەلەت لە چی بوو، هەست دەکەم پێشوەخت تۆ شتێکت زانیبێت، ئیتر تۆ قەرزارم بیت!'

سارا، کاتێک ئەمەی بەدەم گریان و کوڕووزانەوەوە بە سالار وت، سالار بەرانبەر سارا دانیشتبوو، چاوی داچڕیبوو و بێدەنگ و سەرسام لە سارای دەڕوانی، دوای ئەوەی سارا سەری بەسەر کۆشیدا شۆڕ کردبووەوە و بەکوڵ دەگریا، پاشان سالار دەستێکی خستە سەر شانی سارا و پێی وت، 'تکات لێ دەکەم سارا گیان

وا بیر مەکەرەوە! دڵنیا بە منیش دڵگرانم و بەقەد تۆ ئاگاداری ڕووداوەکانم.'

سارا لەناکاو لە سالار ڕاپەڕی و چاوە سوورهەڵگەڕاوە تەڕەکانی داچڕین و بە دەستی ڕاستی ئاماژەی بەرەو ڕووی کرد و پێی وت، 'تۆ هۆکاری دابڕانم بوویت لە کەسوکارم، من ئێستا تەمەننای ئەوەم دەکرد بۆ مردنیش بووایە لەگەڵ ئەواندا بوومایە، نەک لەگەڵ تۆدا، من جارێکا کاتی ئەوەم نەبوو لەگەڵ تۆدا بژیم و هاوسەرگیری بکەم، نەک بڕیاری ئەوەشم نەدابوو، بەڵکو بیریشم لێ نەکردبۆوە، جا باش بزانە هیوادارم زوو پێیان شاد ببمەوە، ئەگین خۆم دەزانم لەنێوان تۆ و مردندا کامتان هەڵدەبژێرم.'

دوای ئەوەی سالار ئەوەی لە سارا بیست، بەردەوام بەدەوری سارادا دەخولایەوە و زوو زوو بە دەستێکی لاملی هەڵدەکڕاند، پاشان بە ماڵەکەدا دەگەڕا و لە پڕێکدا دەوەستا و لە سارای دەڕوانی، وەکو بیەوێت وەڵامی بداتەوە، دەستی لێک هەڵدەگلۆفین و ماسوولکەکانی دەموچاوی گرژ دەکردن و لێوی لە یەک هەڵدەسوین، لە سارای ڕوانی و پاشان لەبەرخۆیەوە و بەهێواشی بە سارای وت، 'نامەوێت دڵت بشکێنم، ئیتر تکات لێ دەکەم بەو جۆرە بیر مەکەرەوە.'

لەوە زیاتر نەیدەزانی چ وشەیەک گونجاوە و شیاوی ئەو هەموو تووڕەبوون و دڵشکاوییەی سارایە تاوەکو پێی بڵێت، بیری لەوە دەکردەوە چۆن بتوانێت دڵنەوایی بکات.

لەو کاتەدا سارا لەسەر یەکێک لەو دوو بەڕە لاکێشە ڕەنگاڵەیەی کەتان، کە لە پارچە جلی کۆنە چنیبوونی، دانیشتبوو، بەڕەکان نیوەی ژوورەکەیان پڕ نەدەکردەوە، دۆلابێکی لاکێشەی سێتاکی، کە مەترێک بەرزییەکەی بوو، لە سەرووی ژوورەکەیاندا چەند دۆشەک و لێفەیەکی قەدکراوی لەسەر کەڵەکە کرابوو، بەرز و نزم بە

دیوارەکانی چواردەوردا دەیان بزمار و مێخ داکوترابوون و زەرفی نایلۆن و جل و توورەکەی ڕەنگاڵەی بەنیان پێدا هەڵواسرابوو، لەگەڵ دوو مەنجەڵ و چوار قاپ و کەوچکێکی فافۆن و تەباخێکی نەوتدا، کە لە سووچێکی ژوورەکەوە دانرابوون، لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا چوار پیاڵە و ژێرپیاڵە لەسەر سینییەکی فافۆن دانرابوون، ئەوە سەروەت و سامانی سالار و کەتانی دایکی بوو، بێجگە لە جێبەکەی سالار، کە باپیرە خایم بەدیاری بۆی کڕیبوو، تاکو پێی بچێت بۆ شاری هەولێر و لەوێ لە خانەی پێگەیاندنی مامۆستایان بخوێنێت.

چوار مانگ بەسەر ئەو ڕووداوانـەدا تێپەڕی، کەتان بەیانیان زوو پێش خۆرکەوتن بە کەنـاری چەمی جوولـەکاندا بۆ ناو باخەکانی بۆگەنە دەچووە خوار، تاوەکو دوانیوەڕۆ درەنگ کەوەر و تەرەتیزەی دەڕنی، کاتێک دەمەو ئێوارە بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە، تەباخە نەوتییەکەی گڕ دەدا و خواردنی بۆ سێ کەس دروست دەکـرد، ژەمـی خواردنەکان تەماتەی سـوورۆکـراو یـان پەتاتەی کوڵاو بوو، ئێوارانی ڕۆژی هەینییش برنجێکی بۆری لێ دەنا و ئەوەی دەمایەوە بۆ ڕۆژی شـەممە هەڵی دەگرت. چونکە ڕۆژی شەممان کەتان ئاگری نەدەکردەوە، ڕۆژانە کەتان و سارا بێجگە لە نووزەنووز و نزا و پاڕانەوە لە خوا، هیچی ترت لێ نەدەبیستن و قسەیان لەگەڵ یەک نەدەکرد.

سارا شـەوان خـەریکی خوێندنەوەی تەوراتەکەی کەتان بوو، بە ڕۆژیشدا کتێبەکانی سالاری دەخوێندەوە، یان لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەدا دادەنیشت و پشتی دەکردە سالار و کەتان و بێدەنگ لە دەرەوەی دەڕوانـی. سـالار بـەردەوام بـەدیـار سـاراوە بوو، ئێوارانیش پێڵاوی فوتباڵێن و تیشێرت و گۆرەوی و تراکسودێکی

دەکردە زەرفێکی بۆر و بە پێ بۆ یاریگای ئیدارە مەحەلی دەچوو، لەگەڵ هاورێکانیدا لە تیپی ئاری ڕاهێنانی فوتبۆڵێنی دەکرد، زوو زووش ڕۆژی هەینی دەڕۆیشت و دەیوت، 'ئەمڕۆ گرنگە، چونکە تیپاوتیپمان هەیە.'

شەش مانگ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕی، دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ، کاتی نانخواردنی ئێوارە، سامی فەرەج و جەمال عەلی لە ماڵی سالار میوان بوون، سەر سفرەکەیان ڕازاندبۆوە بە نانی گەرم و لەسەر چوار قاپی فافۆن کەباب دانرابوو، دوو قاپی نایلۆنی شین سەوزە و تەماتەی قاشکراوی لەسەر بوو، دوو سوراحی پڕ لە ماستاو لەگەڵ چەند پەرداخێکدا لەسەر سینییەکی فافۆن دانرابوو، بێجگە لە سفرە و قاپ و سوراحی و پەرداخەکان، خواردن و خواردنەوەکان جەمال و سامی فەرەج لەگەڵ خۆیاندا لە بازاڕەوە هێنابوویان، لەو کاتەدا عەبەی ئەمینی مریەم، لەگەڵ یەکێکدا بەدەم قسەکردنەوە بە قاڵدرمەکەدا بۆ قاتی سەرەوەی باڵاخانەکە سەر دەکەوتن، ناوبەناو گوێت لێ دەبوو عەبە بە زمانی عەرەبی لەگەڵ یەکێکدا دەدوا، کەتان لەبەر پەنجەرەکەدا وەستابوو، لە دەرەوەی دەڕوانی، بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئادەی ڕۆڵە سالار، بچۆ بەپیر ئەو میوانانەتەوە.'

سالار بێ ئەوەی هیچ بڵێت، هەستا و چوو لەناو داڵانی بەر ژوورەکەیاندا ڕاوەستا، عەبە کاتێک گەیشتە بەردەمی سالار، پێی وت، 'سالار، وا بزانم ئەم کوڕە غەریبە لە شاری بەغدادەوە تەشریفی هێناوە و بۆ ماڵی ئێوە هاتووە، بە ڕێکەوت بینیم، بەو کۆڵان و سەرچەمەیا دەخولایەوە و لە گەورە و بچووک هەواڵی ماڵی ئێوەی دەپرسی.'

لەو کاتەدا کەتان و سارا، هاتبوون لە شانی سالارەوە وەستابوون و گوێقوڵاخ گوێیان لە عەبە دەگرت، سالار بەسەرسامییەکەوە لە کوڕەکەی ڕوانی، گەنجێکی باریکەلەی ڕەشتاڵەی چاوڕەشی قژلوول بوو، سالار تەوقەی لەگەڵ کرد و پاشان دەستێکی بەرەو ژوورەکەیان درێژ کرد و وتی، 'فەرموون، فەرموون، دەی جارێ وەرنە ژوورێ.'

سالار کوڕە غەریبەکەی پێش خۆی دا و چوونە ژوورێ و لەسەر سفرەکە دانیشتن، لە کاتی نانخواردندا، کەتان چەند جارێک دەستی خستە سەر شانی سالار و لەژێر لێوە بە سالاری وت، 'ئا ڕۆڵە، پرسیارێک لەو غەریبە بکە بزانە بۆچی لەو وڵاتە دوورەوە هاتووە.'

سالار خۆی بەسەر سفرەکەدا لار کردەوە و بە زمانی عەرەبی بە کوڕە غەریبەکەی وت، 'برای بەڕێز، خێرە لە بەغدادەوە بەتایبەتی تەشریفت بۆماڵی ئێمە هێناوە؟'

کوڕەی غەریب بە ترس و شەرمێکەوە چاوێکی بە هەموویاندا گێڕا و وتی، 'ئەوەی ڕاستی بێت من لە شاری عوممانی پایتەختی ئەردەنەوە هاتووم، ڕاسپاردەیەکم پێیە بۆ...'

کوڕە غەریبەکە بەخێرایی هەستایە سەر پێ و زەرفێکی کاغەزی زەردباوی لە گیرفانی دەر هێنا، بە جۆرێک دەستی دەلەرزی، دەتوت زەرفەکەی ناو دەستی گەرمە و سەری پەنجەکانی دەسووتێنێت، سالار لەو کاتەدا هەستابووە سەر پێ و بەرامبەر کوڕە غەریبەکە وەستابوو، جارێک دەستی بەرەو ڕووی سالار درێژ کرد و پاشان دەستی گێڕایەوە و لە پشتی زەرفەکەی ڕوانی، 'ئەم نامەیەم هێناوە بۆ، کەتان شلومۆ یان سالار یەعقووب.'

سالار دەستی بەرەو ڕووی درێژ کرد و لەبەرخۆیەوە پێی وت،

'بەڵێ، بەڵێ، من سالار یەعقووبم.'

نامەکەی لە دەستی وەر گرت و پاشان سوپاسی کوڕە غەریبەکەی کرد، فەرمووی لێ کرد تاکو دانیشێت و لە نانخواردن بەردەوام بێت، کاتێک سالار لەسەر سفرەکە دانیشتەوە، هاتبووە سەر چۆک و بەدوودڵی و پەشۆکاوییەکەوە خەریکی کردنەوەی نامەکە بوو، کەتان لە شانیەوە سەری هێنابووە سەر شانی سالار و چاوەڕوان بوو، سارا لە جێگای خۆی هەستابوو, هاتبوو لە پشتی سالارەوە بەپێوە دەستی خستبووە سەر ئەژنۆکانی و بەسەر سالاردا خۆی چەماندبۆوە.

میوانەکان هەموو بێدەنگ لە سالاریان دەڕوانی، هەموو پاروەکانیان لە دەمیاندا ڕاگرتبوون و دانیان توند لێ گیر کردبوو، سالار لە زەرفە زەردەڵەکەدا پارچەیەک کاغەزی سپیی لاکێشەی دەر هێنا، کاغەزە پێچراوەکەی کردەوە و بەبێدەنگی چاوێکی پێدا خشاند، پێش ئەوەی سالار هیچ بڵێت، سارا لەپشتیەوە دایە پرمەی گریان و خۆی بەسەر شانی سالاردا دا، بۆ شەش مانگ دەچوو سارا نەک هەر لە سالاری نەڕوانیبوو، بەڵکو یەکەمین جاریش بوو بەر یەکتری بکەون، جەمال عەلی لە شوێنی خۆیەوە هەڵی دایە و وتی،

'سالار، چییە خێرە؟'

'بەڵێ بەڵێ، هاوڕێم، بەڕاستی نازانم بڵێم چی، بەلام گرنگ ئەوەیە ئێستا دەزانین ئەوان لەکوێن.'

عەبەی ئەمینی مریەم کە هێشتا لەناو دەرگاکەدا وەستابوو، بزەیەکی خستە سەر لێوەکانی و چاوی بە هەمووواندا گێرا، 'دەی کەواتە خێری پێوە بێت، هەموو دانیشن بەخێرا!'

دوای ئەوەی لە دەرگاکە چووە دەرەوە، 'ئادەی ڕۆڵە گیان

بۆمان بخوێنەرەوە، کێ و چی لەکوێن... کوڕی خۆم!'
کاتێک کەتانی دایکی سالار ئەمەی وت، سالار سەری هەڵبڕی و پاش ئەوەی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا چاوی بە هەمووواندا گێڕا، دەستی کرد بە خوێندنەوەی نامەکە:

"پاش سەلام و ڕێز و حورمەتم بۆ کەتان گیان، سارا و سالاری خۆشەیست، پاش سەلامم بۆ هاوڕێ و دۆستانم لە وڵات.
سالار گیان ئەو شەوەی لە گەڕەکی سابوونکەران تۆ سەردانت کردین، من تاکو بەردەرگا تۆم بەڕێ کرد و بڕیار بوو تۆ بگەڕێیتەوە، تاوەکو پێکەوە بە جێبەکەت بچین بۆ ماڵی ئێوە و من لەوێوە سارا لەگەڵ خۆم بێنمەوە، هەمووی چەند دەقیقەیەک دوای ئەوەی تۆ ڕۆیشتیت، هێزێکی تایبەتی میری جلوبەرگی مەدەنییان لەبەردا بوو، ئەوەندەی لامان ئاشکرا بوو یەکێکیان کورد بوو، سەڵت و قوت پێچایانینەوە و هەر ئەو شەوە و بۆ دەمەو بەیانی گەیاندینیانە بەغداد، ڕۆژی دوای ئەو شەوە لە فڕۆکەخانەی بەغداد سواری فڕۆکەیان کردین و ڕاستەوڕاست لە فڕۆکەخانەی یورشەلیم دابەزین، لە فڕۆکەکەدا سەلما و خانێ و منداڵەکانیانمان لەگەڵدا بوو، سەرجەم سەرنشینانی ناو فڕۆکەکە کە چل کەسێک دەبووین، زۆربەمان کورد بووین، لێرە ئێمە گوزەرانمان باشە و جێگایان بۆ دابین کردووین، ئێستا لە کەمپین، بەڵام پێ دەچێت لە داهاتوویەکی نێزیکدا لە شار یان لە گوندەکانی ئیسرائیل نیشتەجێمان بکەن.
کەتان گیان، ئاگات لە سارا بێت، خزمەتی بکە و ڕێزی لێ بگرە، دەربارەی دوارۆژی سارا و سالاریش ئەوە لە داهاتوودا نامەی دایک و باوکیتان پێ دەگات و چاوەڕوان بن.
سالار گیان، بۆ مەسەلەی ئەو ملک و ماڵەی بە ناوی من و

حەکیمەوەیە، بزانە بە هاوکاریی حەمەجانی حاجی سەلیم ساخیان بکەرەوە، لەگەڵ حەمەجان حەق و حیسابمان لەنێواندایە و من پێویست ناکات لێرەدا هیچ نرخێکیان بدەمێ، سەردانی بکە و خۆی دەزانێت. سارا گیان عازیزم گوڵەباخەکەی باپیرەت و هێزی گیانم، دایکت و باوکت و مەحموودیش سەلامت لێ دەکەن و زۆر خەمی تۆ دەخۆن، خوازیارن پێت شاد بنەوە.

سەلاممان بگەیەنە هەموو خزم و هاوڕێ و دۆستێکمان.

دڵسۆزتان خایم شلومۆ"

## ١١

’تەنها مانگێکم ماوە، مانگی سێ منداڵەکەم دەبێت و لەو بارە گرانە ڕزگارم دەبێت.‘

لە کاتێکدا سارا ئەمەی بە خەیاڵدا هات، ڕۆژێکی خۆرەتاوی مانگی دوو بوو، عەزییەکی سپیی کەتانی تاکو سەر ئەژنۆی لەبەردا بوو، قۆڵی تاکو سەر شانەکانی لێ ڕووت کردبوو، لەسەر شۆستەی جادەی سەرشەقام وەستابوو، بەلای شانی دەستی چەپیدا تاوێک بێدەنگ لە حەمامی چوارباخی ڕوانـی، پاشان هەنگاوێک چووە سەر جادە قیرەکە و دیسان وەکو ئەوەی شتێکی بیر کەوتبێتەوە پاشەوپاش بۆ سەر شۆستەکە گەڕایەوە، دانەوییەوە و لەپی دەستی خستە سەر شۆستە کۆنکرێتەکە و لەبەرخۆیەوە وتی، ’ئاگام لێتانە و هەست بە ڕۆحیانەتی ئێوە دەکـەم، دەزانـم گۆڕەکانی ئێوە و ئێسکوپرووسکتان لەژێر ئەم شۆستە کۆنکرێت و جادە قیرەدایە، ڕۆحیانەتی ئێوە لەم شارە دوور ناکەونەوە و بـەردەوام لە پێش چاو و لەناو دڵی مندان، دەتان بینم، ئا ئا من بەردەوام هەمووتان دەبینم!‘

چەند دڵۆپێک فرمێسک بەسەر ڕوومەتیدا گل بوونەوە و کەوتنە سەر ڕووی شۆستەکە و تێکەڵ بە تەپوتۆزەکە بوون، سێ گەنجی ڕەشتاڵەی باریکەلەی لاواز لـەمـلاولای ســاراوە وەستابوون و بەسەرنجەوە لێیان دەڕوانی، یەکێک لە کوڕە گەنجەکان لێی پرسی، ’دادە گیان، ئەوە چیت لێ ون بووە؟‘

سارا بەبێزارییەکەوە چاوی پێدا گێران و بێ ئەوەی وەڵامیان بداتەوە، لەنێوان شانی دووانیانەوە خۆی دەرباز کرد و هەنگاوی نایە سەر جادە قیرەکە، خێرا پەڕییەوە ئەوبەر جادەکە و خۆی کرد بە کۆڵانێکدا، تاکو گەیشتە بەردەم گومرگە سووتاوەکە ڕای کرد، لەوێوە پەڕییەوە و بە جادەی کاوەدا بەرەو سەر ڕۆیشت، هێشتا ترس و پەلەپەلی پێوە دیار بوو، هەنگاوەکانی خێرا بەدوای یەکدا هەڵدەهێنا، گەلێک لە دوکاندارەکان لەسەر شۆستەی بەردەمی دوکانەکانیاندا بە کۆمەڵ وەستابوون، ئەو شەقامە بەئەستەم ئافرەت پێیدا تێدەپەڕی، دوکاندار و حەماڵ و دەستگێڕەکان سارایان ناچار دەکرد، بە درێژاییی ئەو شەقامە لەسەر جادە قیرەکەوە بڕوات و خەڵکی لەمبەر و ئەوبەری شەقامەکەوە بەردەوام لێیان دەڕوانی، سارا، قژە ڕەشەکەی بەسەر شانیدا بەر دابووەوە و مەمکەکانی قوت، کە بە ئاستی ورگی دەر پەڕیبوون، سەرنجی ئەو خەڵکەی ڕاکێشابوو، ورگی بە جۆرێک هەڵئاوسابوو، عەزییەکەی لە بەریدا تەسک کردبۆوە و دوو گۆی سمتی لە دواوە دەر پەڕیبوو.

کاتێک گەیشتە ناو دەرگای خوارەوەی قەیسەریی نەقیب، سەرێکی هەڵبڕی و لە جەنجاڵیی ناو قەیسەرییەکەی ڕوانی، هەردوو دەستی بە ورگیەوە گرت و خۆی دایە دەم شەپۆلی ئەو عەشاماتی خەڵکە، سارا هەستی کرد گەنجێک لە دوایەوە خۆی لێ توند کردبوو، گەنجەکە بەوەوە نەوەستا و بە هەردوو دەستی ناوقەدی سارای توند گرت و خۆی پێوە نووساند، ئارەقەیەکی سارد تەواوی جەستەی خوساندبوو، کاتێک گەیشتە بەردەمی دوکانەکەی باوکی، خۆی ئامادە کرد و ویستی ئاوڕ بداتەووە و خۆی لە گەنجەکە توورە بکات، کاتێک سارا خۆی لێ ڕاپسکاند و ئاوڕی لێ دایەوە، نینۆکەکانی توند لە پێستی دەستی گیر کرد و لە

ناوقەد و سەر سمتی کردنەوە، بینیی گەنجێکی چاوڕەشی زەردەڵەی منداڵکار بوو، سارا لە چاوی ڕوانی و کوڕەکە پاشەوپاش گەڕایەوە دواوە و پشتی کردە سارا و خۆی لەناو قەرەباڵغییەکەدا ون کرد، ساراش بێدەنگ تاوێک بە چواردەوری خۆیدا ڕوانی و لەنێوان دوو ڕیز سندوقی دارەوە بۆ ناو دوکانەکەی باوکی چوو، کابرایەکی بەتەمەنی سەروڕیش سپیی لێ بوو، مشکییەکی لە سەردا و قاتێک ڕانکوچۆغەی نوێی لەبەردا بوو، هاتە بەردەمی سارا و پرسی، 'فەرموو، خوشکی خۆم.'

'باوکم لێرەیە؟'

'باوکت، باوکی تۆ کێیە؟'

'حەکیم.'

'نەخێر خوشکی خۆم، حەکیم، حەکیم، حەکیم کێیە و چکارەیە؟'

'دەی مەحموود؟ کوڕە خاڵە گیان چۆن، ئەگەر باوکم لە دوکان نەبێت ئەوا... باپیرە خایم یان مەحموودی دەبێت لێ بن، تۆ بڵێی دووکانیان بەسەر غەیرەیەکی وەکو تۆدا بەجێ هێشتبێت!'

'وەڵا، خوشکێ گیان من لێرە غەیرە نیم و ئەوە چەند ساڵێکە ئەم دوکانە تەنها خۆم خاوەنیم!'

'دەڵێم تۆ ڕەفیقی باپیرە خایمیت؟ یان...'

'باپیرە کێ؟'

'ئەرێ چۆن، مامە گیان، خۆ من شێت نەبووم، من ڕەفە و سندوقە دارەکان دەناسمەوە، کە بە دەستی باپیرەم دروست کراون، هەر هەمان کەرەستە و هەمان مێز، ئێستا پێم بڵێ باوکم و ئەوان خۆیان بۆ کوێ چوون وا تۆیەکی غەیرەیان لەسەر دوکان داناوە؟'

'کوڕە بۆ خاتری خوا، خوشکم تۆ باسی چی دەکەیت، باوکتی چی و باپیرەتی چی؟'

کابرای دوکاندار، پاش ئەوەی تاوێک بێدەنگ لە ڕەنگ و ڕوخساری سارای ڕوانی، 'خۆ ناشێت پرسیاری حەکیم و خایمە جووم لێ بکەیت؟'

'دەی مامەگیان گەر دەزانیت پرسیاری کێت لێ دەکەم بۆ ڕاست و ڕەوان وەلامم نادەیتەوە؟'

'خۆ بڵێم چی! خوانەخواستە درۆیشم لەگەڵ نەکردوویت، حەکیم و خایمی باوکی تۆ، عەیامێکە لەم شارەدا نەماون و بۆ ئیسرائیل گەڕاونەتەوە.'

'گەڕاونەتەوە، گەڕاونەتەوە، ئەوە تۆ دەڵێی چی، گەڕانەوەی چی و ئیسرائیلی چی!'

کابرا دەستی خستە سەر کەمەری و بەملاولای خۆیدا ڕوانی، 'دەی خوای گەورە ئەم بەلایە چییە ڕووی تێ کردووم، دانیشە، دانیشە دادە گیان تۆ دانیشە و پشوویەک بدە، تاکو من و تۆ باش حاڵی ببین لە یەکتری با ئەو دروانسێ دوکانەم بانگ بکەم.'

کابرای دوکاندار تاوەکو پشتێنەی بەسەر مێزی دوکانەکەیدا درێژ کرد و بەلای دەستی ڕاستیدا ڕوانی و بانگی کرد، 'حاجی حەمەساڵح، کوڕە حەمەساڵح ماڵت بە قوڕ گیرێت ئا تاوەکو ئێرە وەرە!'

کابرایەکی بەساڵاچووی هاوتەمەنی کابرای دوکاندار هاتە ناو ڕاڕەوی دوکانەکە و لە سارای ڕوانی و لە کابرای دراوسێدوکانی پرسی، 'شێخ قادر، بلێ، ئەوە خێرە؟'

شێخ قادر دەستی لە حاجی حەمەساڵحی دراوسێدوکانی ڕاتەکاند، 'ئەرێ بزانە ئەم خوشکە پرسیاری کێم لێ دەکات.'

کاتێک حاجی حەمەساڵح هاتە ناو دوکانەکەوە و شێخ قادر باس و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، حاجی حەمەساڵح چاوی داچرپیبوو،

پاشان لە سارای ڕوانی و بە دەستێکی و بە لچکی مشکییەکەی ئارەقەی نێوچەوانی سڕی، کاتێک دەستی خستە سەر شانی سارا، هەموو ئازای گیانی دەلەرزی، شێخ قادر دایە قاقای پێکەنین و بە دەنگی بەرز وتی، 'وا بزانم ئەم بەرخە لە ڕان جێ ماوە.'

لەو کاتەدا سارا بێدەنگ سەرنجی لە ڕەفەکان دەدا، لای شانی ڕاستیەوە دەستێکی هەڵبڕی و پەنجەکانی بە ڕووی زبری تەختە کۆنەکاندا هێنا، لە خەیاڵیدا باپیرە خایم لەو جێگایەی ئەودا دانیشتبوو، سەردەمی منداڵیی خۆی هاتەوە پێشچاو، کاتێک لەسەر مێزی دوکانەکە بەرامبەر باپیرەی دادەنیشت، بەتایبەتی دیمەنی ئەو ڕۆژەی تازە چووبووە قوتابخانە و ساڵی یەکەمی خوێندنی بوو، عەزییەکی هاوشێوەی ئێستای لەبەردا بوو، قاچە ڕووتەکانی دەر خستبوون و لەبەرخۆیەوە گۆرانیی دەچڕی، زوو زوو حاجی حەمەساڵح و شێخ قادر لەو خەیاڵەی دایان دەبڕی، لەو کاتەدا حەکیمی باوکیی بینی، خۆی کرد بە ژووردا و هاتە ناو دوکانەکە، کاتێک باوکی گەیشت باپیرە خایم دەستی سارای گرت و لە دوکانەکە چوونە دەرەوە، حاجی حەمەساڵح و شێخ قادر هێشتا بەرەو ڕووی یەک وەستابوون و لە گەرمەی قسەکردندا بوون، سارا بێدەنگ هەستایە سەر پێ و بە لایاندا لە دوکانەکە چووە دەرەوە و بەدەم ڕۆیشتنەوە زوو زوو دەهاتە سەر نووکی پێکانی و بەسەر ئەو خەڵکەدا لە دوور و لەناو قەیسەرییەکەی دەڕوانی، لە دوورەوە چاوی لە باپیرە خایم بوو، ئەوەندە باڵای بەرز بوو، تەواوی ئەو خەڵکەی ناو قەیسەرییەکە بەئاستەم سەریان دەگەیشتە بەرزیی شانی ئەو، بێجگە لەوە سارا دایم مشکییەکەی باپیرەی دەناسییەوە، لە قەیسەرییەکە چووە دەر و بە لای قەیسەریی وەسمان پاشادا تێپەڕی و بە دەستی چەپیدا بۆ بەردەم گوزەری ئاسنگەرەکان لای

دا، خێرا دەڕۆیشت و زوو زوو دەنگی لێدانی چەکوشی ئاسنگەرێک بە ئاسنێکی تردا، ماسوولکەکانی دەوری چاویان پێ گرژ دەکرد و چاوی بەئەستەم لێک دەنا، بەردەوام لە دوور و پێش خۆی دەڕوانی، چەندین جار شانی بەر شانی ڕێبواران دەکەوت و بێ ئەوەی ئاوڕ لە کەس بداتەوە و لێیان بڕوانێت، کاتێک گەیشتە مەیدانی ماستەکە، بێ دوودڵی و بیرلێکردنەوە خۆی کرد بە کەبابخانەی قالە مەڕیدا، لەو کاتەدا کەبابخانەکە، تاقوتەرا مشتەریی لێ بوو، سارا لەسەر مێزێکی چوارنەفەری جێگای گرت، بێئاگا بوو لەوەی وەستا و شاگرد و مشتەرییەکان چەند بە سەرنجەوە لێیان دەڕوانی، کاتێک یەکێک لە شاگردەکان بەشەرمێکەوە لێی نزیک بوویەوە و لیی پرسی، 'فەرموو خوشکم، ئەمرکە.'

'دوو نەفەر کەبابمان بۆ بێنە.'

## ١٢

ئێوارەی ڕۆژی نـەورۆزی ساڵی ١٩٧٥ بـوو، لـە نـاوشـاردا ئاهەنگگێڕان و ئاگرکردنەوە لەلایەن میرییەوە یاساغ کرابوو، دەسەڵاتداران چەند ڕۆژێک پێش نەورۆز بە بەیاننامە و بانگەواز یاساغکردنی چوونەدەرەوە و ئاگرکردنەوەیان بڵاو کردەوە، بەڵام لە چەندین گـەڕەکی شـاردا، بێ گوێدانە ئـەو هـەوڵانـەی میری، ئاگر کرایەوە، ئەوەی سەرنجی خەڵکی ئەوسای شاری سلێمانی ڕاکێشا، ئەو ئاگرە گەورەیە بوو کە لە گردی مامەیارە کرایەوە، گڕی ئاگرەکە ئەوەندە بڵند بوو لە تەواوی گەڕەکەکانی شارەوە دەبینرا، خەڵکی شار پۆل پۆل چووبوونە سەربانەکان و لێیان دەڕوانی، پاش کاتژمێرێک ئاگرەکە لەلایەن کاربەدەستانی میرییەوە خامۆش کرا، ڕۆژانـی دوای نـەورۆز، دەنگوباسی ئەوە بڵاو بوو گوایا چەند کاربەدەستێکی میری خۆیان ئەو ئاگرەیان کردبێتەوە، تاوەکو پۆلیس و ئاسایش لە گەڕەکەکانی ئەزمڕ و بەیوان و قەرەجاوا بیکەنە بیانوو بۆ دەستگیرکردنی هاوولاتیان، تاوەکو چەند ڕۆژێکیش دوای نەورۆز، هێزەکانی ئاسایش و پۆلیس لە زۆربەی شەقام و کۆڵانەکانی شاردا بڵاو بووبوونەوە، لەو ڕۆژانەدا چەندین ماڵ بەر شاڵاوی پشکنین کەوتن و دەیان گەنج دەستگیر کران.

پێنج ڕۆژ دوای ڕۆژی نەورۆز و بەسەرچوونی ئەو ڕووداوانە لە خانوویەکی قوڕینەی گەڕەکی جوولەکاندا سارا بەرەژان گرتی، نەنە کەتان و نازدار و پوورە ئامینی بەدیارەوە بوو، بە هەرسێکیان

ئەملاولایان لە سارا گرتبوو، لە کاتێکدا سارا لەسەر جێگایەکی تەختە ڕاکشابوو، زریکەی دەگەیشتە کۆلان و نەنە کەتان لەپەسا پێی دەوت، 'ڕۆڵە گیان، ڕۆڵە گیان، هێز بدەرە بەر خۆت و تۆزێک غیرەتت بێت.'

ڕۆژ تێپەڕی و شەو داهات و سارا بەدەم ژان و ئازارەوە دەی نالاند، پاشان لە کاتژمێر دەی شەودا کوڕێکی بوو، لە کاتێکدا کەتان و پوورە ئامین بە شتن و قوماتەکردنی کۆرپەکەوە سەرقاڵ بوون، نازدار لەگەڵ سڕینی ئارەقەی دەموچاوی سارادا باسی ئەوەی بۆ دەکرد، کە چۆن ئامینی کچی پێنج کچی لەسەر یەک بووە، نازدار لەو کاتەدا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، 'ئۆ خوایە نوخشەش بێت لە ئامین و تاقە کوڕێکی ببێت.'

زوو زوو سارا پێڵوی چاوی دادەخست، وەکو ئەوەی بڵێی لە هۆش خۆی دەچێت، پاشان چاوی هەڵ دەبڕی و لە دەرگای ژوورەکە و جارجارێکیش سەری وەلاوە دەنا و لە ژێر باڵی پوورە ئامینەوە لە کۆرپەکەی دەڕوانی، کۆرپەکەی لە کەروێشکێک دەچوو، کە بەدەم تانجیی ڕاوچییەوە بێت.

لەو کاتەدا سارا بینی خواجە خینۆی باپیرە گەورەی، لەگەڵ سارای خێزانیدا هاتنە ژوورەوە، شولومۆی باوکی باپیرە خایمیان لەگەڵدا بوو، هاتن و لە تەنیشت جێگاکەی ساراوە دانیشتن، باپیرە خواجە دەستی بە قژیدا دەهێنا و داپیرە ساراش دەستی توند گرتبوو، سارای دایە گەورە بەردەوام پێی دەوت، 'شەلوم ئازیزم، شەلوم.'

سارا کەنەفت و پرزەلێبڕاو، ڕەنگزەرد و بێوزە لەسەر پشت ڕاکشابوو، کۆرپەکەیان قوماتە کرد و لە تەنیشتیەوە دایان نا، پاشان

باپیرە خواجە خینۆ تەوراتە لوولکراوەکەی دەستی دەخوێندەوە و بەردەوام بەدەوری سارا و کۆرپەکەیدا دەسووڕایەوە، لەو کاتەدا سارا سەرنجی دا ژوورەکە پڕ بووبوو لە ژن و پیاوی دانیشتووانی گەڕەکی جوولەکان، سەرجەم پرچدرێژ و جلی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەردا بوو، بە درێژاییی ئەو شەوە باپیرە خواجە خینۆ تەوراتی دەخوێند و ئەوانیش بەکۆرس بەدوایدا دەیانوتەوە.

دەمی بەیانی تاریکوڕوون، ئەو دەمەی گڵۆپی سەر سەکۆی شەقامەکان هێشتا تاکوتەرا دەگڕان، سارا بە درێژاییی ئەو شەوە لە پەنجەری ژوورەکەوە لە دەرەوەی دەڕوانی، پەنجەرەی بالاخانەکە بەسەر حەوشەی ماڵەکە و چەمی جوولەکان و لەوێشەوە گەڕاجی پاسەکان و قوتابخانەی جمهوری لێوە دیار بوو، پاشان لە گەڕاجی پاسەکانەوە ناوبەناو بانگی دەستگێڕێک یان دەنگی شوفێری پاسەکان دەهات، گەڕاجەکە تاکو دەهات زیاتر خەڵک ڕووی تێ دەکرد، لەو گەڕاجەوە پاس و جێبەکان بۆ شار و گوند و دێکانی ناوچەی شارەزوور و گەرمیان دەچوون، لەوەدا بوو خۆر هەڵبێت و ڕووناکی ڕۆح بکاتەوە بەبەر شاردا و شادەمارەکانی خوێنیان پێدا بگەڕێ، سارا بە درێژاییی ئەو شەوە بە لاشەی ماندوو پڕ لە ئازاریەوە چاوەڕوان بوو، بێ خواستی خۆی بەرەوام چاوی فرمێسکیان لێ دەچۆڕا، نەیدەتوانی شێوازی دایک و باوک و مەحموودی برای و باپیرە خایم لە خەیاڵ و پێشچاویدا بسڕێتەوە، سارا ڕازی نەبوو بەوەی ئەو وەکو دایکێک لە خاکێکدا منداڵی ببێت، کە تاکو ئەو ڕۆژەیش بۆ ئەوان دۆزەخێک بوو.

لەو کاتەدا سارا بیری لەوە دەکردەوە چۆن دەست بنێتە سەر دەمی کۆرپەکەی و ژیانی لێ بسێنێتەوە، پاشان بڕوات و خۆی

بدات بەدەم ئاوی شیوەکەوە، کە گوێی لێ بوو دەنگی بەخوڕی دەهات و قوڕاو و لیتاوی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، بەڵام خۆشەویستیی بۆ سالار پەشیمانی دەکردەوە و وزەی پێ دەدا تاوەکو خۆی و کۆرپەکەی لە ژیاندا بهێڵێتەوە، زوو زوو بیری لەو قسەیەی سالار دەکردەوە، کە مانگێک پێش ئەو ڕۆژە بە سارای وتبوو، 'ئەگەر منداڵێکمان ببێت، ئەوە خۆشترین و گرنگترین کاتە لە ژیانمدا، سارا گیان ئازیزم، مەپرسە لە خۆشیدا چی دەکەم.'

هەشت ڕۆژ بوو سارا منداڵی بووبوو، هێشتا ڕەنگزەرد و بێوزە لەناو جێگادا کەوتبوو، دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە کەتان کۆرپەکەی پێچایەوە، کاتێک ویستی بڕوات و لەگەڵ خۆیدا بیبات سارا لێی پرسی، 'بۆ کوێی دەبەیت؟'

کەتان لە وەڵامدا وتی، 'بۆ لای مۆهێل، ئەوە تەمەنی هەشت ڕۆژە و دەبێت خەتەنە بکرێت و ناو بنرێت، دەیبەم بۆ لای مەردان، چا کێ دەڵێت سالارە فەنی بەم زووانە دێتەوە!'

مەردان ڕافائێل، تەنها جوولەکە بوو، کە ئەودەم لە گەڕەکی جوولەکاندا مابوویەوە، تەمەنی خۆی دەدا لە نەوەد ساڵێک و خۆی بەتەنیا لە خانوویەکی گڵینەی سەر چەمی جوولەکاندا دەژیا، تەنها کەس کە هاتوچۆی دەکرد، کەتان و سالار بوون، هەر ئەوانیش بازاڕیان بۆ دەکرد و پێداویستی و خواردنیان بۆ دەهێنا، مەردان ڕافائێل بە درێژایی تەمەنی موهێلی سەرجەم جوولەکەکانی شاری سلێمانیی کردبوو و بگرە لە شارۆچکە و دێهاتەکانیشەوە جووەکان سەردانیان دەکرد، بێجگە لە خەتەنەکردن، ناوی منداڵانیشی دەنا، پاش ئەوەی کەتان کۆرپەکەی لەسەر باوەشی دانا، مەردان ڕافائێل پەرداخێک شەرابی سووری تێکرد و پەنجەیەکی ژەند بە پەرداخە

شەرابەکەدا و لێوی کۆرپەکەی پێ تەڕ کرد، پاشان پەرداخەکەی دایە دەستی کەتان، لە کاتێکدا کەتان قومی لە شەرابەکە دەدا، مەردان ڕافائێل زریکەی لە کۆرپەکە هەستاند و خەتەنەی کرد، پاشان پرسیاری لە کەتان کرد ئاخۆ چ ناوێک لە کوڕەزاکەی دەنێت، کەتان خێرا وتی، 'ئارۆن'

## ١٣

'نـازداری دایکم، دوای مردنی خوله پیرانی مێردی، له دێی قۆخەمامۆی کوردستانی ئێرانەوە بە سێ منداڵەوە لە دەست کەسوکاری هەڵدێت، لەگەڵ من و عەلیی برام و ئامیندا دێتە ئەم دێی ئاروزەرە، ئیتر بزانە ژنێکی قوڕبەسەر بە سێ منداڵەوە، وەکو دایکم باسی لێوە ئەکرد، ئەوسا من تەمەنم دە ساڵێک بووە، ئیتر لێرە دایکم مەجبوور دەبێت بمکات بە شوان.'

'بەبیرم دێت بەمنداڵی لە گەڕەکی جوولەکان بە دایکتیان دەوت ژنە ئێرانییەکە!'

'دەزانم، ئای بەوە قەڵس دەبووم، وام دەزانی جنێوم پێ دەیەن.'

'جا تۆ ئەوسا بە چی قەڵس نەدەبوویت؟ مردووت مرێت لەوەتەی دەتناسم هەر بێحەوسەڵە بوویت!'

'ئێ جا سالارە فەنی ئەگەر تۆیش سەردەمی منداڵیت وەکو من بەهەژاری بەسەر بردایە، ئەوا نەوەکو تووڕە...!'

سالار قسەکەی پێ بڕی، 'بۆ لە تۆ وایە من کوڕی حەمەقەدۆ بووم!'

'ئیتر من ئەوە نازانم، ناپیاو بەڵکو شێت و شبر دەبوویت!'

'ئیتر بەس نییە باوکی تۆ بە دەردی خوا مردووە و وەکو باوکی من جەردە و پیاوخراپ سەریان نەبڕیوە، ئەرێ تۆ گلەیی چی لە بەختی خۆت دەکەیت؟'

دوای ئەوەی مامۆستا ڕەسوڵ ئەمەی بە سالار وت، جگەرەکەی

بە جگەرەکەی دەستی سالار داگیرساند، بە ددانە شاش و گەورەکانی پێشەوەی توند فیلتەری جگەرەکەی گرتبوو، زوو زوو نەفەسی لە جگەرەکە دەدا و دووکەڵەکەی لە لووتیەوە دەکرد بە هەوادا، پێکەوە لەسەر وشکەکەڵەکێک لەسەر ڕێگای بەینی دێی ئاروزەر و بایانە دانیشتبوون، لە دوورەوە لە کۆمەڵێک چەکداریان دەڕوانی، بێدەنگ لەسەر ڕێگای دێی بایانەوە بەرەو لای ئەوان دەهاتن و ژمارەیان بیست کەسێک دەبوو، کاتێک گەیشتن، بۆ پشوودان لایان دایە لای ئەو کەڵەکەی سالار و مامۆستا ڕەسوڵی لەسەر دانیشتبوو، دوای ئەوەی بەخێرهاتنیان لە چەکدارەکان کرد، هەموو بێدەنگ لەسەر ڕێگاکە و تەنیشت کەڵەکەکە دانیشتن، یەکێک لە چەکدارەکان دوای ئەوەی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، لەبەرخۆیەوە وتی، 'کوڕە برا لێبووردنی گشتی چی و خۆتەسلیمکردنەوەی چی! تاوەکو دوێنێ ئێمە لە یەکترینمان دەکوشت، تۆ بڵێی ئێستا هەر ئاوا بەئاسانی لێمان خۆش بن، بەخوا من قەت باوەڕ بەو دوژمنانە ناکەم.'

هەموو بێدەنگ بوون و کەس وەڵامی ئەو قسەکەرەی نەدایەوە، تەنانەت کەس لێیشی نەڕوانی، سالار هەستا و بەسەر چەکدارەکاندا گەڕا و جگەرەی بەسەردا دابەش کردن، هەموو جگەرەیان لە سالار وەر گرت و کەس ڕەتی نەکردەوە، یەکێک لە چەکدارەکان لەژێر لێوەوە و وەکو لەگەڵ خۆیدا بدوێت وتی، 'ئێنجا ئێمەی کورد کەی باوەڕمان بە داگیرکەر هەبووە؟ بەڵام ئێمە ئەمڕۆ ناچارین!'

چەند کەسێکیان داوایان لە سالار کرد تاوەکو جگەرەکانیان بۆ داگیرسێنێت، دوای ئەوە گەڕایەوە و ویستی لەسەر کەڵەکەکە دانیشێت، مامۆستا ڕەسوڵ لە سالاری ڕوانی و وتی، 'ڕووی ناچاری ڕەش بێت! جا باشە ئێمە کەی ناچار نەبووین!'

سالار کاتێک پشتی لە چەکدارەکان بوو، سەرنجی چووە سەر

ماکەرێک، کە لەو کاتەدا لەودیو ئەو کەڵەکەی ئەوان لەسەری دانیشتبوون بەچکەی دەبوو، دوو قاچی بەچکەی کەرەکە لە ژێر کلکییەوە دیار بوو، کاتێک کەرەکە لەتاو ئازار دەستی کرد بە زەڕین و هاوارکردن، سەرنجی هەمووانی ڕاکێشا و چەکدارەکان هاتبوون بە ڕیز لە پشتی ئەوانەوە لە کەرەکەیان دەڕوانی، ماکەرێکی دێز و سمی لای ڕاستی پەڕیبوو، زەڕەی بەو دۆڵەدا دەنگی دەدایەوە، دوای ئەوەی چەند جارێک لەسەر لا کەوت و بە گران هەڵسایەوە، سالار بەسەر کەڵەکەدا بازی دا و چوو بۆ لای ماکەرەکە، کاتێک لاملی گرت و چەند جارێک دەستی بە سەرشانیدا هێنا، پاشان چوو لە پشتی ماکەرەکەوە وەستا و دەستی کرد بە ڕاکێشانی هەردوو سمی جاشە کەرەکە، مامۆستا ڕەسوڵ خۆی گەیاندە لای سالار و لە تەنیشت کەرەکەوە وەستا و باوەشی کرد بە لاملیدا، لە سالاری ڕوانی و وتی، 'ئادەی سالە گیان با ئەو قوڕبەسەرە لەو بەڵایە ڕزگار کەین، ڕایکێشە، دەی ڕایکێشە!'

سالار قاچی لە زەوی گیر کردبوو، زوو زوو خۆی بە پشتدا دەخست و سمی جاشە کەرەکەی ڕادەکێشا، هەردوو مەچەکی سالار خوێنیان لێ دەچۆڕا، ماکەرەکە لە ژێر باڵی مامۆستا ڕەسوڵەوە بە دەنگێکی تێکشکاوەوە دەی زەڕاند، چەکدارەکان یەک یەک و بە کۆرس هاواریان لێ دەکردن، 'مرد، تەواو مرد.'

کاتێک جاشە کەرەکە بەدەست سالارەوە لە جەستەی کەرە بوویەوە، بە پشتدا کەوت و جاشولکەکە بە خوێن و لیتاوەوە کەوتە باوەش و سەرسنگی، چەکدارەکان هەموو دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان، کەرەکە لەو کاتەدا چۆکی دادایە سەر زەوی و لەسەر باڵی مامۆستا ڕەسوڵ پاڵکەوت، چەند جارێک ناڵاندی و پاشان چاوی لێک نا و گیانی دەر چوو، کاتێک سالار ڕاست بوویەوە و

جاشوولکەکەی لەسەر زەوی دانا، چەکدارەکان هەموو هاتبوون و چواردەوریان لێ دابوون، یەکێکیان پشتێنەکەی لە قەدی کردەوە و دایە دەستی سالار، ئەویش بەهێواشی خوێنی سەر جەستەی خۆی و جاشوولکەکەی پێ سڕی.

کاتێک سالار و چەند پیاوێک جاشوولکەکەیان پاک کردەوە، بە چاوە گەورە و گەشەکانی لە هەمووانی ڕوانی، پاشان لەژێر دەستیاندا خۆی ڕاپسکان و هەڵسایە سەر پێ، چەند جارێک کەوت و دیسان هەڵسایەوە، وەکو کلوویەکی بەفر لەسەر بۆری و ڕەشیی ئەو خاکە سووتاوە دەستی کرد بە غاردان.

هەموو بێدەنگ لە شانی یەکەوە وەستابوون و لێیان دەڕوانی، سالار لەبەرخۆیەوە وتی، 'سارای هاوسەرم لەوانەیە ئێستا منداڵی بووبێت، تەمەننا دەکەم لای خوا سەلامەت بێت، ئەوەتا سرووشت کارەساتەکان زوو تێدەپەڕێنێت، بەڵام ئازار و ئاسەواریان لە یادەوەریی ئێمەی مرۆڤدا هێلانە دەکات.'

## ١٤

دوو حەفتە بەسەر لەدایکبوونی ئارۆندا تێپەڕیبوو، لە دەمەوئێوارەیەکی درەنگدا سالار لەگەڵ سێ هاوڕێیدا بە پیکابێک خۆیان کرد بە گەڕەکی جوولەکاندا، پشتی پیکابەکە دوو سندوقی دار و چوار توورەکەی ڕەنگ بۆری تێدا بوو، دوای ئەوەی بەپەلەپەل دایانگرتن و بە قاڵدرمەکاندا بۆ قاتی سەرەوەی بالاخانەکە بردنیان، هاوڕێکانی لە بەرهەیوانی بالاخانەکەدا تەوقەیان لەگەڵ سالار کرد و بە قاڵدرمەکاندا چوونە خوار، سالار کاتێک چووە ژوورەوە، پێش ئەوەی سلاو لە سارا و دایکی بکات، تاوێک بەسەر کورەکەیدا نووشتایەوە و چەند جارێک ماچی کرد، دەستی دایە و ویستی لە باوەشی بگرێت، کەتانی دایکی دەستی گرت، 'نا، نا ڕۆڵە گیان وازی لێ بێنە با تۆزێک بخەوێت، لە بەیانییەوە دەزریکێنێت!'

کاتێک هەڵسایە سەر پێ، بەرامبەری سارا وەستا و هەردوو باڵەکانی بەسەر شانەکانیدا شۆڕ کردنەوە، هەوڵی دەدا لە چاوی سارا بڕوانێت، بەلام ئەو لەو کاتەدا سەری داخستبوو و لە بەرپێی خۆی و سالاری مێردی دەڕوانی، 'دەڵێم سارا گیان شوکور هەموو شتێک باشە، سوپاس کە منت کرد بە باوک!'

'بەڵێ، دیارە زۆر شانازیی پێوە دەکەیت!'

'زۆر زۆر، دەی چۆن سارا گیان، دڵنیابە بەقەدەر هەموو دنیام پێ خۆشە.'

'ئێ باشە خۆشی لە خۆت!'

پاشان لە سارا و دایکی ڕوانی و پێی وتن، 'پاش کەمێکی تر چەند هاوڕێیەکم دەگەنە ئێرە و کۆبوونەوەیەکی زۆر گرنگمان هەیە، ئیتر باشترە ئێوە بۆ دوو کاتژمێرێک بۆ ماڵی نەنە ئامین بچنە قاتی خوارەوە!'

کەتانی دایکی لەبەرخۆیەوە دەیبۆڵاند، سارا سالاری مێردی نەدواند و خێرا کۆرپەکەی لە باوەش گرت و بە چاوی تەڕەوە کەتانی خەسووی پێش خۆی دا و بە قالدرمەکاندا چوونە خوار، کەتان و سارا تاکو نیوەشەو لای پوورە ئامین مانەوە، چونکە میوانەکانی سالار تاوەکو درەنگانی شەو مانەوە.

ڕۆژی دوای ئەو ڕۆژە، کەتان لە سالاری پرسی، 'ئەوە تۆ بۆ دوو حەفتەیە خۆت لێ ون کردووین؟'

سالار لە وەڵامدا وتبووی، 'دوو حەفتە لەگەڵ جەماله ڕەش و سامیی فەرەج و جەمال عەلیدا لە ناوچەی شارباژێر بووم، چونکە کۆنفرانسمان هەبوو، پاشان لەوێوە بۆ شاری پێنجوێن چووین، لای دۆستێکمان کەلوپەلمان بۆ چاپخانە و ڕادیۆکەمان دەست کەوت.'

دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، زیاتر لە کاتژمێرێک دەبوو سالار کوڕەکەی لە باوەش گرتبوو، ساراش بێدەنگ بەرانبەری دانیشتبوو، کاتێک ئەوان پێکەوە بێدەنگ لە کۆرپەکەیان دەڕوانی، نەنە کەتان لەبەرخۆیەوە وتی، 'سالار، ناوم ناوە ئارۆن!'

سالار دوای ئەوەی بەسەرنجێکەوە لە سارای ڕوانی، 'ئارۆن، چۆن؟ ئارۆن! دایە بۆ ئارۆن، پەلەتان لە ناونانی ئەو منداڵە چی بوو!'

'دەی ڕۆڵە گیان، دەزانیت تۆ لە کەیەوە ڕۆیشتوویت!'

سالار لە سارای ڕوانی، 'سارا گیان تۆ ناوی ئارۆنت بەلاوە چۆنە؟'

سارا شانی هەڵتەکاند، لە کاتێکدا لە چاوی سالاری دەڕوانی، ماسوولکەکانی دەموچاوی گرژ کرد و فرمێسک بە چاویدا هاتە خوار، 'بەلاتەوە گرنگە هەر ناوێکی لێ نرابێت؟ کە تۆ هاوڕێکانت و سیاسەت لە پێش دایک و ژن و منداڵتەوەن، تاکو یەکێتی قوتابیان بوو تۆ هەموو ژیانت بۆ تەرخان کردبوو، ئەوە ئێستا وەکو خۆت دەڵێیت ئێمە کۆمەڵەین، من نازانم دایکت ناوی ناوە، بە من بووایە، ناوم لێ دەنا، بەدبەخت!'

'نا، نا، سارا گیان، ئەوەندە دڵی خۆت تەنگ مەکە و گرنگ ئەوەیە تۆ بەسەلامەتی مناڵەکەت بووە و خۆت و کۆرپەکەت بێوەین! دەی خۆ من بە جەمالدا هەواڵم بۆ ناردبوون، باوەڕ بکە بەردەوام دڵم لات بوو، خۆت پێت نەوتم، مانگی چوار مناڵەکەمان دەبێت، ئێ خۆ چووزانم ئەم پیاوە بچکۆلانەیە پەلەیەتی و پێش وەختی خۆی لەدایک دەبێت!'

'ئا، ئا، پەلەیەتی، ئەگەر کوڕەکەت لە پاشەڕۆژدا بزانێت، لە کوێ و لە چ دایک و باوکێک هاتۆتە دونیا، دەترسم لەم وڵاتەدا جێگای نەبێتەوە و پاشان تف و نەعلەتمان لێ بکات!'

'وا مەڵێ سارا گیان، ئەوەندە ڕەشبین مەبە و تۆزێک بەهیواوە لە پاشەڕۆژی خۆمان و کوڕەکەمان بڕوانە.'

'کام پاشەڕۆژ؟'

لە کاتێکدا سارا ئەمەی وت، هاتبووە سەر چۆک و لە سالار نزیک بووبوویەوە و پڕ بە قوڕگی هاواری بەسەردا کرد، دیسان دووبـارەی کـردەوە، 'کام پاشەڕۆژ، پێم بڵێ، تۆ کام پاشەڕۆژت مەبەستە، ئەگەر ئەو پاشەڕۆژەت مەبەستە کە لە کتێبی پیرۆزی تەوراتدا ناو براوە، ئەوە من بەبێ کەسوکارم لە خوایش ڕازی نابم لە ڕۆژی قیامەتدا زیندووم بکاتەوە.'

کەتان هات و لەنێوان سالار و سارادا وەستا و دەستی خستە سەر شانی سارا، 'کچی خۆم ئیتر ئەوەندە بەسە، با خوا لەوە زیاتر ماڵوێران و بێبەختمان نەکات!'

سالار لەژێر باڵی دایکیەوە لە سارای ڕوانی، 'ئێ خۆ دونیا کاول نەبووە و ئەوەتا ئێستا من و تۆ لەگەڵ کۆرپەکەماندا پێکەوەین، بۆ ئێستا ئەوەندەمان بەسە، ئیتر وەکو تر من قوڕی کوێ بکەم بە سەرمدا؟'

سارا دەستی بە دەستی کەتانی خەسوویەوە گرت و هەستایە سەر پێ، چوو بۆ بەر پەنجەرەکە و دوای ئەوەی چەند هەناسەیەک لە دەرەوەی ڕوانی، پاشان چوو لە تەنیشت سالارەوە دانیشت و خۆی لە سالار نزیک کردەوە، دەستێکی خستە سەر قوماتەی کورەکەی و بە دەستەکەی تریشی دەستی سالاری گرت و سەری نایە سەر شانی سالار، بە جۆرێک بەکول دەگریا، سالاری لەگەڵ خۆیدا ڕادەوەشاند، بەدەم گریانەوە و بە دەنگێکی تێکشکاوەوە، 'نازانم سالار گیان، دڵم زۆر تەنگە، هیچ شەوێک خەو نایەتە چاوم و وا هەست دەکەم لە هەموو ئان و ساتێکدا ڕۆحم لە لاشەم دەر دەچێت، لەو ڕۆژەوەی ئەو کورەم بووە، هەمووی دوو جار لە دەموچاویم نەڕوانیوە، نازانم بۆچی!'

'سارا گیان، ئەوە زیاتر لە دە ساڵە باپیرە خایم و دایکت و ئەوان، لێمان دوور خراونەتەوە، ئازیزم، ئێستا تۆ دڵنیایت، کە گوزەرانیان باشە و هەروەها ئەوان لەکوێ دەژین، پێویستە ئەو ڕووداوانە لەبیر خۆت بەریتەوە، ئەگەر لەبەر خاتری خۆت و خۆیشم نەبێت لەبەر خاتری منداڵەکەت.'

'دەزانم، ئەوە چەندین ساڵە لە هەوڵدام لەگەڵ خۆمدا، بەتایبەتی ئەم چەند ڕۆژەی ڕابردوو، ئەوەم بە خۆم وتووە، هەر وەکو چۆن

تۆ دەیڵێیت، بەڵام هەست دەکەم ئیتر کێشەی دەروونیی من تەنها دابڕانی کەسوکارم نییە، سالار لەناو ڕۆحی مندا شتێک تێک شکاوە، تۆ نازانیت سالار گیان، خۆم نازانم بۆچی چاوم بە زیندووەکان هەڵنایەت و بەردەوام لەگەڵ ڕۆحیانەتی مردووەکاندام و دەیانبینم و تەنانەت دەتوانم بیاندوێنم.'

## ١٥

دوای نانخواردنی ئێواره و ئاوابوونی خۆر، سالار بەبێ ئەوەی لەگەڵ کەتانی دایکی و سارای خێزانیدا بدوێت، پێڵاوەکانی لە پێ کردن و خۆی بۆ ڕۆیشتن ئامادە کرد، کاتێک ویستی بڕوات، دایکی لێی پرسی، 'ئەرێ ڕۆڵە بەم درەنگانە بۆ کوێ دەچیت؟'

سالار لە وەڵامدا وتی، 'دەچم بۆ مەلعەبەکە.'

کەتان لەو کاتەدا ئارۆنی کوڕەزای لە تەشتێکدا دەشۆرد، دوای ئەوەی جلی لەبەر کرد و لەسەر جێگاکەی ڕایکێشا، چوو بۆ لای سارا و پێی وت، 'ئەرێ ڕۆڵە گیان بۆچی جامێک ئاو ناکەیت بە خۆتدا؟ خۆ ئەوە مانگێک دەبێت خۆت نەشۆردووە!'

سارا بێدەنگ لە خەسووی دەڕوانی و وەڵامی نەدایەوە، پاشان کەتان لە چێشتخانەکە جلەکانی لەبەر سارادا داکەند و تەنها ژێرکراسێکی سپی لەبەردا مابوو، لەسەر سێپایەکی تەختە داینیشاند و جامێک ئاوی کرد بە سەریدا، کەتان لەبەرخۆیەوە وتی. 'توخوا بڕوانە چۆن ئێسقانی ئەو سەرشانانەی دەر کەوتوون، ئەرێ ڕۆڵە گیان تۆزێک هۆش بێنەرەوە بەر خۆت و بە دڵ تیکەیەک نان بخۆ و تۆزێک خزمەتی خۆت بکە. لەبەر خاتری ئەو توڵفە، بەڵکو بتوانیت قومێک شیری پێ بدەیت!'

سارا سەری بەسەر کۆشیدا شۆڕ کردبووەوە و بێدەنگ لە بەرپێی خۆی دەڕوانی، لەو کاتەدا ئارۆن لە ژووری دانیشتنەکە دەستی کرد بە گریان، کاتێک کەتان سارای بەجێ هێشت و بۆ لای

ئارۆن چوو، سارا وەکو شتێکی بیر کەوتبێتەوە، هەستایە سەر پێ و لە چێشتخانەکە دەر چوو بە قاڵدرمەکاندا چووە خوار، بە سەری تەڕ و بە تەنها ژێرکراسێکەوە لە دەرگای حەوشەوە چوو بۆ کۆڵان.

کەتان لە ڕۆیشتنی سارا بێئاگا بوو، کاتێک سارا گەیشتە سەر شیوەکە، تاوێک بە ڕاست و چەپی خۆیدا ڕوانی و چەند جارێک دەستی توند لە یەک هەڵگلۆفین، پاشان لەناکاو وەکو شتێکی بیر کەوتبێتەوە تاوی دایە بەر خۆی و بەڕاکردن بەرەو گەڕەکی سەرشەقام کەوتە ڕێ، بەدەم ڕاکردنەوە هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا و بەردەوام دەگریا، گەیشتە سەر ئەو تەپۆڵکە خۆڵ و بەردانەی کە شۆفل و کرێکارەکانی ڕێگاوبان هەڵیان دابوویەوە، لەوێ ڕاوەستا و ئەژنۆی دادایە سەر تەپۆڵکە خۆڵەکە و دەستی کرد بە چنگەکرێ و کۆکردنەوەی ئەو ئێسقانە سپییانەی بەو ناوەدا پرژابوون، ئێسقانی مردووەکان لەبەر ڕووناکیی مانگەکەدا سپی دەچوونەوە، سارا بە دەستێکی قەراغی ژێرکراسەکەی گرتبوو، بە دەستەکەی تری بەردەوام ئێسقانەکانی کۆ دەکردەوە و لە کۆشی دەنان، زوو زوو لەبەرخۆیەوە دەیوت، 'دەی خێر لە خۆتان نەبینن، دەی خوایە زیندووتان ماڵوێران بێت و ئێسکوپرووسکی مردوویشتان بە خواردنی سەگ و گورگەکان بێت!'

ئەوەندە ژێرکراسە سپییەکەی هەڵکردبوو، سمت و بەرورگی سپیی وەکو ڕەنگی ژێرکراسەکە لەبەر ڕووناکی مانگەکەدا دەدرەوشایەوە، دوای ئەوەی کۆشی لە وردەئێسقان پڕ کرد، بەناو گۆڕستانە تێکدراوەکەدا دەستی کرد بە گەڕان، دەمی شۆفلەکان کێلە بەردەکانیان تێک شکابوو، ئەو کێلانەی لە بەردی مەڵکەندی داتاشرابوون، پاشان تاشەبەردە بۆرە وردەکان تێکەڵ بە ئێسقانی مردووەکان بووبوون.

ڕۆژانـی پێشوو، بێجگە لە کرێکارەکانی ڕێگاوبـان، خەڵکی زۆرینەی شاریش بە خاکەناز و پاچەوە هاتبوون بۆ هاوکاریکردنی کرێکارەکان، لەگەڵ لێدانی دەمـی شۆفلەکە لە گـۆڕە جووەکان، خەڵکەکە بە کۆمەڵ ڕایان دەکرد و لەناو خۆڵ و بەرد و ئێسقانە وردەکاندا لە زێڕ و زیو دەگەڕان، ئەو پڕۆژەیەیی بیست ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە لە بەغداد پلانی بۆ دانرابوو، پاشان لەو ساڵانەدا کە زەعیم سدیق پارێزگار و لێپرسراوی شاری سلێمانی بوو، کەوتنە جێبەجێکردنی، بە پلان چەند ساڵێک پڕۆژەکە ڕاگیرا، کاربەدەستانی میری دەیانویست خەڵکی شار خۆیان بە دەستی خۆیان ئاسەواری جووەکان لەسەر نەخشەی شارەکانیان بسڕنەوە، دوای ئەوەی لە سەرتاسەری عێراقدا پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاو کردەوە، کە هەموو گۆڕێکی جوولەکە زێڕ و زیوی تێدایە، ڕۆژنامەکانی میری ڕۆژانە هەواڵی ئەوەیان بڵاو دەکـردەوە، کە کەسێک لە فلان شار یان گوندێک، بە هەڵدانەوەی گۆڕی جوویەک زەنگین بووە، زۆرینەی خەڵکی سلێمانی وەکـو شـار و گوندەکانی تـری عێراق، شـەوان درەنگ بە پاچ و خاکەنازەوە دەهاتن و یەک یەک گۆڕەکانیان هەڵ دەدایـەوە، گۆڕی وا هەبوو زیاتر لە دە جار ژێـروژوور کرابوو، میری بە فێڵ ئەو تـاوانـەی بە خەڵکی شـار ئەنجام دا و پاشان بڕیاری جێبەجێکردنی پڕۆژەکە درا.

ئەو پڕۆژەیەیی ساڵی ١٩٥٢ لە بەغداد دەر کرابوو، بڕیارێک کە ئاسەواری جووەکان لەسەر نەخشەی شاری سلێمانی بسڕێتەوە.

ئەو شەوە سارا تێکەڵی کۆمەڵێک منداڵ بووبوو، هەموویان تـوورەکـەی سپییان ڕاسـت و چـەپ لـە ملـدا بـوو، وەکـو سـارا ئێسقانەکانیان کۆ دەکردەوە، منداڵەکان هەموویان سەرتاشراو و کڵاوی ڕەشیان لە سەردا بوو، قژی قەنافس و دەوری گوێیان

لوول کرابوو، هەموو ڕانکوچۆغەی ڕەشیان لەبەردا و پشتێنی سپییان بەستبوو، کاتێک سارا لەگەڵ منداڵەکاندا لە ئێسکوپرووسکی پێشینانیان دەگەڕا، سارای داپیرەی لەگەڵ خواجە خینۆی باپیرە گەورەیدا دەستیان دایە باڵی و بردیان لە کەناری گۆڕستانەکەوە ڕایان وەستاند، لەو کاتەدا سارا بینیی سەدان ژن و پیاو لە دانیشتووانی گەڕەکی جوولەکان بە توورەکەی سپییەوە ئێسقانی مردووەکانیان کۆ دەکردەوە، خواجە خینۆی باپیرە گەورە لەبەرخۆیەوە وتی، 'هەموو گوێیان لە نزاکانت بووە و بە دەنگی تۆوە هاتوون، دووبارە ئێسکوپرووسکی مردووانمان لە ڕۆژهەڵاتی شار و لە گردی کەپر لە گۆڕ دەنێینەوە، تاوەکو ڕۆحیانەتی ئێمە لەسەر ئەم خاک و ئاوە ئۆقرە بگرێت.'

سارای داپیرە وتی، 'ئیتر ئێمە لێرەین!'

خواجە خینۆی باپیرە، دووبارە لەگەڵ سارای خێزانیدا بەکۆرس وتیان، 'ئیتر ئێمە لێرەین.'

منداڵەکان و خەڵکەکە چواردەوریان لێ دابوون و لە سارایان دەڕوانی و هەموو پێکەوە و بەکۆرس، 'ئێمە لێرەین.'

لەو کاتەدا سالار گەیشتبووە لای سارا و هەردوو شانی گرتبوو ڕای دەوەشاند، سارا لەبەرخۆیەوە و بەدەم گریانەوە دەیوت، 'ئێوە لەم شارە ناڕۆن، ڕۆحیانەتی ئێوە لێرە ناڕوات!'

سالار ناچار بوو سارا لە باوەش بگرێت و خێرا خێرا هەنگاوەکانی هەڵ دەهێنایەوە و بەرەو گەڕەکی جوولەکان و ماڵەوە ڕای دەکرد، سارا لە باوەشی سالاردا و بەدەم ڕێگاوە توند هەردوو دەستی بە قەراغی ژێر کراسەکەیەوە گرتبوو، سالار لەژێر لێوەوە و وەکو لەگەڵ خۆیدا بدوێت بە سارای وت، 'مەگەر تۆیش وەکو ڕۆحیانەتی ئەو مردووانە هۆگری ئەم شارە نەبیت!'

## ١٦

کەتان کاتێک سارای لە خەو هەڵساند، هێشتا ڕووناکیی مانگ لە پەنجەرەکەوە تاوەکو ناوەڕاستی ژوورەکە کشابوو، بە شپرزەییەوە ئارۆنی کوڕەزای خستە باوەشی سارا و لەبەرخۆیەوە پێی وت، 'ئا ڕۆڵە گیان لێم بگرە، بەخوا لە ئێوارەوە هیچمان چاومان لێک نەناوە، با بچم بەلای ئیشەکەمەوە.'

سارا دوای ئەوەی لەسەر جێگاکەی دانیشت و هەردوو دەستی بە ڕوخساریدا هێنا، ئارۆنی کوڕی لە دەستی خەسووی وەر گرت، ئارۆن وەکو تووتەڵەی سەگ زۆر بەهێواشی لەبەرخۆیەوە دەی نووزاند. کەتان بەسەر جلە کوردییەکانیدا شەرواڵێکی پیاوانەی لەپێ کرد، پاشان توورەکەیەکی بۆری ڕاست و چەپ کردە شانی، پێش ئەوەی بڕوات بە سارای وت، 'چ کات خۆر کەوت، سالار بەخەبەر بێنە و پێکەوە ئەو کوڕە بەرن بۆ سەر دوختۆرێک، ئەو تولفە نەخۆشە، زۆر نەخۆشە، ئەگەر موشوورێکی نەخۆین ڕۆح دەر نابات!'

کەتان لە دەرگای ژوورەکە چووە دەرەوە و بە قالدرمەکاندا بۆ ناو حەوشەی بالاخانەکە چووە خوار، کاتێک گەیشتە کۆلان و سەر شیوەکە، تاوێک بەبێدەنگی لە قاتی سەرەوەی بالاخانەکەی ڕوانی و بە فەقیانەی کراسە جەلسەکەی چاوە تەڕەکانی سڕی، پاشان بە کەناری شیوەکەدا بەرەو خوار داگەڕا.

لەناو بێدەنگیی ژوورەکەدا، سارا لە ڕوخساری کوڕەکەی دەڕوانی، پاشان لەتەنیشت خۆیەوە و لە نزیک سالاری مێردیەوە ڕایکێشا،

هەستایە سەر پێ و تاوێک بە ژوورەکەدا گەڕا، چوو ئەژنۆی دادایە سەر قەراغی جێگاکەی سالار و دەستی برد پشتییەکەی خۆی بەدەستەوە گرت، بەسەر ئارۆنی کوڕیدا نووشتایەوە و توند پشتییەکەی لەسەر دەموچاوی کوڕەکەی دانا و هەردوو دەستی توند لەسەری ڕاگرت، چەند هەناسەیەک ئارۆنی بێدەنگ کرد، وەکو ئەوەی شتێکی بیر کەوتبێتەوە، هەستایە سەر پێ و تەوراتەکەی کەتانی لە تەنیشت جێگاکەیەوە هەڵگرت، ژوورەکەی بەجێ هێشت و بە پێی پەتی و بە ژێرکراسێکەوە چوو بۆ کۆڵان، لە بەرامبەر دەرگای حەوشەکەیاندا بەسەر پردە گڵینەکەدا پەڕییەوە و بەرەو کۆڵانی کنێسەت کەوتە ڕێ، دەرگای کنێسەتەکە لەسەر پشت بوو، چەند جارێک دەستی بە ڕووی دەرگا دارەکەدا هێنا، کاتێک سارا گەیشتە ناو کنێستەکە، زیاتر لە دە پیاوێک لەدوای مەلا حەسیبی شارەزورییەوە ڕیزیان بەستبوو، هەموو لەو دیوارەیان دەڕوانی کە بە دەستی باپیرەی سارا خشتە سوورەکانی هەڵچنرابوو، سارا بە بەردەمی نوێژخوێنەکاندا تێپەڕی و چوو شانی مەلا حەسیبی گرت و چەند جارێک ڕای وەشاند، پاشان لەبەرخۆیەوە وتی، 'مەلا، ئەرێ تۆ ڕووت لە کام قیبلە کردووە؟ نازانیت ئەم تاقە بۆ ئەو مەبەستەی تۆ دروست نەکراوە؟'

دوای ئەوەی دەنگەدەنگ کەوتە ناو نوێژخوێنەکانەوە و ڕیزەکەیان تێک دا، سارا لێی ڕوانین و پێی وتن، 'ئێوە لەم تاقەوە دەنگتان بە خوا ناگات، نوێژ و نزاکانتان دیوارێک نابڕێت کە بە دەستی جوویەک درووست کرابێت!'

مەلا حەسیب دەنگی هەڵبڕی و هاواری بەسەر سارادا کرد، 'ئەم بەڵای خوایە لەکوێوە پەیدا بوو!'

یەکێک لە نوێژخوێنەکان وتی، 'قوربان وا بزانم ئەم نامەحرەمە دراوسێی ماڵی ئێمەیە و ژنی سالارە شیوعییە، ئەوانیش وەکو من

کرێچین و له ماڵی ئەمینی مریەمدان.'

مەلا حەسیب دیسان دەنگی هەڵبڕی، 'ئادەی موسوڵمانینه ئەو نامەحرەمه لێره دەر بکەن، با مەحرەمی پیرۆزی خوا گڵاو نەبێت.'

کاتێک مەلا حەسیب ئەمەی وت،ساڵحی ڕەشەی حەماڵ خێرا پاڵتاوەکەی لەبەر خۆی داکەند و دای بە سەر شانە ڕووتەکانی سارادا و بۆ دەرەوەی کنێسەت پێش خۆی دا، سارا ئاوڕی دایەوە و بانگی کرد، 'مەلا، مەلا، دەستوبرد بکە لە نوێژەکانت، چونکە حاخام و پیاوانی گەڕەک بۆ ئێرە بەڕێوەن!'

ساڵحی ڕەشەی حەماڵ توند قۆڵی ڕووتی سارای گرتبوو، کاتێک گەیشتنە ناو حەوشەی کنێسەت، سارا بینیی حاخام پێش پیاوانی گەڕەک کەوتبوو بەرەو ناو کنێسەت دەچوون.

بێدەنگ بە لایاندا تێپەڕین و ساڵحی ڕەشەی حەماڵ سارای گەیاندەوە ماڵەوە، لەگەڵ سارادا چووە هەیوانی قاتی سەرەوەی باڵاخانەکە، کاتێک لە دەرگای دا، سالار هێشتا لە پرخەی خەوندا بوو، بە چاوی خەواڵووەوە دەرگای کردەوە، سارای بینی لەناو پاڵتاوە گەورەکەی ساڵحی ڕەشەی حەماڵدا تەنها سەری دیار بوو، بێ ئەوەی لە ساڵحی ڕەشەی حەماڵ بڕوانێت، خێرا دەستی سارای گرت و بە دوای خۆیدا بردییە ژوورەوە، پاڵتاوەکەی لە جەستەی سارا کردەوە، سارای لە ژوورەوە بەجێ هێشت و دەرگای ژوورەکەی بەدوای خۆیدا داخست، ساڵحی ڕەشەی حەماڵ ویستی سڵاو لە سالار بکات، سالار پاڵتاوەکەی بەرەو ڕووی ڕاگرت و بە دەنگی بەرز هاواری بەسەردا کرد، 'ساڵه گەڕ باش گوێم لێ بگرە، هەرچییەک بووە و نەبووە، سارای ژنمت لە هەر جێگایەکەوە هێناوەتەوە بۆ ماڵەوە، لای کەس باسی ناکەیت و نامەوێت کەس پێی بزانێت، تێگەیشتیت؟'

ساڵحی ڕەشەی حەماڵ پاڵتاوەکەی لە دەستی سالار وەر گرت، 'نا،

نا، چۆن، بۆ خاتری خوا مامۆستا گیان!'

'ئیتر ساله گەڕ لەبەر خاتری خوا بێت یان هەر مەشایەخێکی تر، بیبیستمەوە کە لای کەسێک باست کردبێت سەرت دەبڕم!'

'کورە بەخوا مامۆستا گیان، سارا خان بە ژێرکراسێکەوە هاتبوو بۆ ناو مزگەوت، زۆربەی پیاوانی گەڕەک و مەلای مزگەوت بینییان، جا ئیتر من قوڕی کوێ بکەم بە سەری خۆمدا و من دەمی ئەو خەڵکەم چۆن پێ دەگیرێت!'

کاتێک ساڵحی ڕەشەی حەماڵ ئەمەی وت، سالار بە دەستی چەپی پشتی ملی خوراند و بێدەنگ دەستی خستە سەر شانی و هێواش لەبەرخۆیەوە وتی، 'تێگەیشتم، ماڵت ئاوا بێت.'

سالار پشتی کردە ساڵحی ڕەشەی حەماڵ و چووە ژوورەوە و دەرگاکەی بە دوای خۆیدا داخست، ساڵحی ڕەشەی حەماڵ لە خەیاڵیدا ئەو پرسیارەی ئامادە کردبوو، ویستی لە سالار بپرسێت، 'ئەرێ مامۆستا گیان خۆ خوانەخواستە ئێوە جوولەکە نین؟'

ساڵحی ڕەشەی حەماڵ دەستی بە ڕووی دەرگاکەدا هەڵبڕی و ویستی دیسان لە دەرگا بدات، لەو کاتەدا گوێی لە دەنگی گریانی ئارۆن بوو، پاشان دەستی داگرتەوە و پاڵتاوەکەی لەبەر کرد و بێدەنگ بە قاڵدرمەی بالاخانەکەدا چووە خوار و ڕێگای مزگەوتەکەی گرتە بەر.

## ١٧

چەند مانگێک بوو گوێزابوویانەوە گەڕەکی چوارباخ، عەلیی نانەوای کوڕی نازداری هاوڕێی کەتان، لە ماڵی شێخ حسێندا ژوورێکی بۆ بە کرێ گرتبوون، دوو ساڵ پێش ئەوەی ئەوان بچنە ئەو ماڵە، کە بەوانەوە چوار ماڵی تری تێدابوو، شێخ حسێنی مێردی ئایشە خان بە نەخۆشییەکی کوتوپڕ مردبوو، ئایشە خانی خاوەنماڵ بە کرێی کرێچییەکانی بژێویی سێ کوڕەکەی دابین دەکرد.

یەکەم ڕۆژی هەینیی مانگی چوار، جادە و کۆڵانەکانی شار چۆڵ بوون، لە گەڕەکی چوارباخ بێدەنگییەکی ترسناک کۆڵان و سەکۆ و دیوارەکانی داگرتبوو، ڕۆژانی ئاسایی منداڵانی گەڕەک لە بەیانیی زووەوە تاوەکو ئێوارە و بگرە شەو درەنگانێک لە کۆڵان دەبوون، زۆربەی کات بە تۆپێکی چەرمی بۆر یاریی تۆپتۆپێنیان دەکرد، سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە منداڵەکان زوو زوو لە دەرگاکانەوە سەرەتاتکێیان لەگەڵ هێزەکانی ئاسایش و پۆلیس دەکرد، کە بەردەوام بە کۆڵانەکاندا دەگەڕان، جێبێکی سەوزیش بە درێژاییی ئەو ڕۆژە لە بەردەرگای یەکەمی مزگەوتی عەبدوڵڵا لوتفیدا وەستابوو، چوار کەسی مەدەنیی عەینەکلەچاوی تێدا بوو، شەوی پێش ئەو ڕۆژە هێزێکی تایبەتیی سەر بە ئاسایش چەند ماڵێکیان لە گەڕەک پشکنیبوو، سامی فەرەج دوو ڕۆژ پێش ئەو ڕۆژە سالار و سارای ئاگادار کردبۆوە و لە گەڕەکی عەقاری بردبوونیە ماڵی

خۆیان، ئەو لاوانەی لە بەرەی بەرگریی لە نیشتماندا بوون، کە سالار لێپرسراویان بوو، لە شار دەر چوون یان لە گەڕەکەکانی تری شاردا خۆیان حەشار دا.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە لە گەڕەکی عەقاری، جەمال عەلی بە زەرفێکی بۆرەوە خۆی کرد بە ماڵی سامی فەرەجدا، سالار لە ڕێوە لە جەمال عەلیی پرسیی، 'دەمانچەکەت بۆ هێناوم؟'

'کەباب، بە ترش و پیازەوە.'

'ئەم ئێوارەیە یاریمان هەبوو؟'

'شانستان هەبوو ئەگینا دەمانکردن بە پەنگ.'

'سالە گیان، بە چی دەتان کردین بە پەنگ، بە تۆپێن یان بە غەش و فاوڵکردن.'

'جەمال خوات بێت، تیپی کەمال سەلیم فاوڵکەرن یان تیپی ئاری.'

'ئاریی چی، هاوڕێم وا بزانم تیپی ئاری خۆمان خۆش!'

سالار و جەمال عەلی دەمێ بوو لە باسوخواستی وەرزشدا بوون و هێشتا لەناو دالانەکەدا بەرانبەر یەکتری وەستابوون، سامی فەرەج بانگی کردن، 'دەی وەرن ماڵتان بە قوڕ نەگیرێت، تیپی ئاری چی و تەڕەماشی چی، با کەبابەکە سارد نەبێتەوە.'

کاتێک هاتنە ژوورەوە، سالار پاڵێکی نا بە شانی سامی فەرەجەوە و پێکەنی، 'ئەرێ هەتیو بۆ ناڵێیت، کەمال سەلیمی چی و تەڕەماشی چی، بۆ ئاری، هەی بەقەد گەڕەکی چوارباخ و تیپی ئاری لە بەربینت خڕ بێت.'

لە کاتی نانخواردندا جەمال عەلی دەستێکی خستە سەر شانی سالار و پێی وت، 'ئەمڕۆ هەواڵم پێ گەیشت کە شەش لە برادەران

لەو حەملەی گرتنە دەرباز بوون، بێجگە لە حەمە قەموور و ئاراس و سەلاح، ئەو سێ برادەرەش لەوە ناچێت دەستگیر کرابن، ئیتر ئەوەندەی من زانیاریم هەبێت.'

'دەی هێمن؟'

'هێمن، کام هێمن؟'

'هێمنی عەزە شەل'

'ئەوە بە هێمنەوە بوون بە چوار مەفقود!'

سارا و سازگاری خێزانی سامی فەرەج پێکەوە چووبوونە قاتی سەرەوە، سامی فەرەج بۆ کڕینی شووشەیەک عارەق و کیلۆیەک لیمۆ لە ماڵ دەر چوو، سالار و جەمال بە خەیاڵی خۆیان سەرقاڵی سەرلەنوێ داڕشتنەوەی تیپی ئاری بوون، جەمال عەلی زوو باسەکەی دەگۆڕی و لەبەرخۆیەوە دەیوت، 'پێویستمان بە شۆڕشی چەکدارییە!'

سالار لە وەڵامدا ئاوای بە جەمال عەلی وتبوو، کە هێشتا سێ بەشی میللەتی کورد لەژێر میحنەت و ئازاری نسکۆی شۆڕشێکی گەورەدا دەناڵێنن و لە پەیڕەو و ڕێبازی پارتەکەی ئەوان بێئاگان، بگرە هەر تێناگەن، جەمال عەلی لە وەڵامدا وتبووی، 'سالار، هەر لە دوو جێگا، ئیتر لە گەرمیان بێت یان لە کوێستان، دوو زەبری کاریگەر لە دوژمن بوەشێنین، شۆڕشەکە خۆی بۆ خۆی کڵپە دەستێنێ.'

'ئەرێ ئەو یارییەی بەینی ئەڵمانیا و هۆڵەندا کەی دەکرێت، وتم بەڵکو لە ئێزگەی دەنگی کوەیت گوێمان لێ بگرتایە.'

'سبەی ئێوارە، وا بزانم سەعات شەش دەست پێ دەکات.'

لەم قسانەدا بوون، سامی فەرەج خۆی کرد بە ژووردا، شووشەیەک عارەقی بە دەستەوە و بە دەستەکەی تریشی زەرفێکی

کاغەزی بۆری گرتبوو، هێشتا لەناو دالانەکەدا بوو، بە دەنگێکی بەرز و گڕ:

"بەو مانگەی وا بە حەواوە
سەد ئەستێرە دەوریان داوە
یاری خۆمە و لێم توریاوە"

لەو کاتەدا سامی فەرەج گەیشتە ناو دەرگای هۆڵی دانیشتنەکە، هەردوو دەستی لە حەوادا و لەسەر نووکی پێکانی بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە و سەمای دەکرد، ئینجا سالار و جەمال لەبەری هەستان و پێکەوە بەکۆرس:

"هەی ئاغا و ئاغا و ئاغا
بۆم تێکە لەو قۆنیاغە."

جەمال عەلی، گۆرانییەکەی پێ بڕین و سەیری سامی فەرەجی کرد و بەدەنگی بەرز، 'هەتیو مردوو مرێت، دەزانیت تۆ بە ناخێری گیانت لە کەیەوە ڕۆشتوویت، بۆ قومێک عارەق و دوو لیمۆ، ئا... ئەوەتا دوو هەنگاوە، یان چوویت لە ئەبونەواز عارەقەکەت کڕی!'

سامی فەرەج پێکەنی و زەرف و شووشەی عارەقەکەی لەسەر مێزەکەی بەردەمی جەمال و سالار دانا، 'هەتیو خۆ من ئێوە نیم، عەیامێکە بەدوای تۆپا ڕادەکەن و بوون بە تانجی.'

کاتێک سامی فەرەج بەدەم گۆرانیوتنەوە خەریکی پەرداخهێنان و ڕازاندنەوەی مێزەکەی بەردەمی سالار و جەمال بوو، لە دەرگا درا، جەمال و سالار ڕاپەڕین و بە پەشۆکاوییەکەوە هەڵسان و خۆیان خستە بەر پایەی ئەملاولای پەنجەرەی ژوورەکە، کە بەسەر دەرگای حەوشەی ماڵەکەدا دەیڕوانی، جەمال لەبەر پشتێنەکەیدا دەمانچەیەکی دەر هێنا و لەناو دەستی ڕاستی گرتی، سالار

بەسەرسامییەکەوە لە جەمالی ڕوانی، سامی فەرەج خێرا گەیشتە ناو دەرگای دالانەکە، کاتێک کردیەوە، لە ناو حەوشەکەوە و بە دەنگی بەرز بانگی لە سالار و جەمال کرد، 'دوکتۆر بەختیار و حسێن مەولوودن.'

کاتێک دوکتۆر بەختیار خالید و حسێن مەولوود گەیشتنە ناو دەرگای هۆڵەکە، بەجووت دەستیان کرد بە چەقەنەلێدان و گۆرانیوتن، جەمال لە جێگای خۆی دانیشتبۆوە و دەمانچەکەی نابوویەوە ژێر پشتوێنەکەی، لە جێگای خۆیەوە، 'سەیری ئەم دوو داڵە کەرخۆرەیە ناکەیت، بەس سەیری بنباڵیان کەن دەزانن لەکوێ کەلاک کەوتووە.'

'بەخێر نەیەن، ئەرێ ئێوە لەکوێوە پەیدا بوون؟'

کاتێک سالار ئەمەی وت، بەختیار خالید هاتبووە ژوورەوە و لە جەمال و سالاری ڕوانی و وتی، 'ئەرێ بۆچی تۆ و جەمال لە خۆتان ناپرسن چی دەکەن لە گەڕەکی عەقاری، کوڕە خوات بێت سالار، لەو پەنجەرەیەوە باخ و دەرگای حەوشەکەمان دیارە.'

'ماڵتان بە قوڕ نەگیرێت، تا زووە با دوو پێک بخۆینەوە، تا ئەو عارەقە حەیاتە سارد نەبۆتەوە.'

'جا حسێن گیان، سێ چارەک عارەق کێ بیخوات و کێ بەمەستی گۆرانییەکمان بۆ بڵێت، یان شیعرێکمان بۆ بخوێنێتەوە؟'

'من کاکە سالار، باوەڕ ناکەی چەند بە کڵپەی ئەم شۆڕشە نوێیە سەرمەستم، بێ عارەق بەیانی تا ئێوارە لە خۆشیاندا لەسەر نووکی پێکانم سەما دەکەم.'

'دوجتۆرە فەنی، بە ناخێری گیانت مەیکە بە باسی سیاسەت و دانیشتنەکەمان لێ تێک مەیە.'

سالار سەیرێکی جەمالی کرد و دەستێکی لێ با دا، 'حەی حەی، دڵمان خۆشە کوڕمان بۆ گەورە بووە و شان دەدەنە بەر قورسایی مەینەتییەکانی ئەم میللەتە قوڕبەسەرە!'

جەمال بە لاچاوێک سەیرێکی سالاری کرد، 'جا، هەر شان سالە گیان؟'

## ١٨

دوایین ڕۆژی شەممەی مانگی چوار بوو، سالار و سارا لەگەڵ ئارۆن و کەتاندا دوامالئاواییان لە دۆست و هاوڕێکانیان کرد، پاشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژە لە گەڕەکی چوارباخەوە بە تەکسییەک بۆ ماڵی سامی فەرەج چوون، سارا و کەتان ماتەمینی و بێزاری بە ڕوویانەوە دیار بوو، کاتێک بەڕێوە بوون، سارا بەردەوام ئەوەی بە سالار دەوت، 'تکات لێ دەکەم سالار، با لێرە نەڕۆین، تۆ نازانیت من ڕۆحم چەند هۆگری ئەم شارەیە!'

سالار لە وەلامدا بە سارای وتبوو، 'دڵنیابە ئەوەندە نامێنینەوە، بەڵکو بۆ شوێنونی و سەلامەتیی گیانی خۆمان تەنها چەند مانگێک لە هەولێر دەبین.'

سارا دیسان خەیاڵ دەیبردەوە و پاشان وەکو لە خەو ڕاپەڕیبێت، دەستی بەرەو ڕووی سالار درێژ دەکرد و بە دەنگێکی چپە، وەکو بیەوێت لەگەڵ خۆیدا قسە بکات، 'لێرە ناڕۆین!'

کەتانی خەسووی لێی دەهاتە پێشەوە و زوو زوو دەیپرسی، 'سارا دەڵێی چی، کێ ناڕوات؟'

کاتێک گەشتنە کۆلانەکە، بینییان جێبێکی کورتی لاندرۆڤەر لە بەردەمی ماڵەکەدا وەستاوە، شوفێرێکی گەنجی نەناس و مەلا ڕەحمانی هەولێریی تێدا دانیشتبوون، مەلا ڕەحمان کابرایەکی بەتەمەنی سەروریشسپیی بالابەرزی ڕەقەڵە بوو، مێزەرێکی سپیی لە سەردا و جبەیەکی درێژی ڕەساسیی لەبەردا بوو، ئەودەم دە

ساڵێک دەبوو لە گەڕەکی تەیراوای شاری هەولێر مەلای مزگەوتی شێخ مەلا ڕەشید بوو.

مەلا ڕەحمان، کە خۆی ناوی یوسف حمۆ بوو، پێش ئەوەی ببێت بە مەلا، لە قوتابخانەی حامورابیی بنەڕەتی گەڕەکی کەڕادە لە شاری بەغداد مامۆستای زمانی عەرەبی بووبوو، ساڵی ١٩٤٨ لە ڕۆژانی فەرهوودەکەی ئەو ساڵەدا ماڵەکەی لەلایەن گرووپە عەرەبە دژەزایۆنیستەکانەوە تالان دەکرێت و دەسووتێنرێت، ئەو ڕۆژە یوسف حمۆ خۆی لە ماڵ نابێت، عەرەبە توندڕەوەکان سەری سوهام حەمدانی ژنی دەتاشن و مەمکی دەبڕن و بە درەختی حەوشەکەیاندا هەڵی دەواسن، ئەودەم یوسف حمۆ شەش مانگ بوو هاوسەرگیری لەگەڵ سوهام حەمداندا کردبوو، دوای ئەو ڕووداوە، ناچار یوسف حمۆ بەتەنیا بۆ شاری سلێمانی هەڵدێت، ناوی خۆی بە ڕەحمان عەبدوڵڵا قادر دەگۆڕێت، هەر هەمان ساڵ لە مزگەوتی خانەقای شاری سلێمای دەچێتە حوجرە و دوای پانزە ساڵ خوێندن بڕوانامەی مەلایەتی وەر دەگرێت.

ئەو ڕۆژە، کاتێک سالار مەلا ڕەحمانی بینی ڕووی گەشایەوە و دەم بە پێکەنینەوە بەرەو ڕووی چوو، چەند هەناسەیەک باوەشیان کرد بە یەکتریدا، پاشان سالار دەستی لە شان و ملی مەلا ڕەحمان کردنەوە و ئاوڕی لە سارا دایەوە و وتی، 'سارا، ئەوە مەلا ڕەحمانە، یان باشترە بڵێم یوسف حمۆ، هاوڕێی باپیرە خایم.'

'هاوڕێ؟ خایم پشتوپەنای من بوو.'

سارا بەرانبەری مەلا ڕەحمان وشک وەستابوو، چاوی داچڕیبوون و بەسەرسامییەوە لێی دەڕوانی، وەکو ئەوەی بینینی مەلا ڕەحمان هیوایەکی پێ بەخشیبن، یان گومانی لەوە هەبووبێت چۆن مەلایەک خۆی بە هاوڕێی نزیکی باپیرە خایم بزانێت، مەلا

ڕەحمان دەستی بەرەو ڕووی سارا درێژ کرد و وتی، 'ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم، تۆ سارای کچی حەکیمیت!'

سارا، بەدوودڵییەکەوە دەستی درێژ کرد و تەوقەی لەگەڵ مەلا ڕەحماندا کرد، پاشان بەهێواشی و بەشەرمێکەوە لە مەلا ڕەحمانی ڕوانی و وتی، 'بەڵێ، خۆیەتی.'

'ئای کچی خۆم، بەخوا خایم و دایک و باوکت چاک خۆیان نەجات دا، دڵنیام ئەوان گوزەرانیان گەلەک لە ئێمە باشترە.'

سارا سەرێکی بۆ مەلا ڕەحمان ڕاوەشاند و لەژێر لێوەوە وتی، 'پێ دەچێت وا بێت!'

کەتان دوای ئەوان لە تەکسییەکە دابەزی، تاوێک بوو لەگەڵ شوفێری تەکسییەکەدا لەسەر کرێکەی لە لێدواندا بوو، پاشان بۆ چەند هەناسەیەک باوەشی کرد بە ملی مەلا ڕەحماندا و لەبەرخۆیەوە و بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە، 'یوسف گیان.'

سالار دەستی دایکی گرت و دەستەکەی تری خستە سەر شانی مەلا ڕەحمان و پێی وت، 'بچینە ژوورەوە تاوێک دانیشین، یان... بڕۆین!'

'ئەگەر ئامادەن باشترە بەڕێ بکەوین.'

'بەڵێ ئامادەین.'

سالار ئەمەی وت و ویستی بەرەو ژوورەوە بڕوات، لەناو دەرگاکەدا ڕووی بوو بە ڕووی سامی فەرەجەوە، کاتێک لەگەڵ سالار تەوقەیان لەگەڵ یەک کرد، سامی فەرەج سڵاوی لە مەلا ڕەحمان و شوفێرەکە کرد، تاوەکو ئەو کاتە شۆفێرەکە هێشتا لە جێبەکە دانەبەزیبوو، پاشان سازگاری خێزانی سامی فەرەج هات و لە شانی سارا و کەتانەوە وەستا، پێش ئەوەی بڕۆن، سامی فەرەج و سازگاری خێزانی یەک یەک ئارۆنیان لە باوەش گرت و ماچیان کرد، پاشان

دوای ماڵئاواییکردن سواری جیپەکە بوون، سامی فەرەج و سازگار بەردەوام دەستیان لە حەوادا بوو، شوفێرەکە لە چەند هەناسەیەکدا لەوسەری کۆلانەکەی ماڵی سامی فەرەج لە چاو ون بوو، لە شار دەر چووبوون کاتێک مەلا ڕەحمان دەستی بۆ لای شوفێری جیپەکە درێژ کرد و لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەم پیاوە حیکمەتی کوڕمە!'

کەتان وتی، 'تەمەندرێژ و تەندروست بێت.'

حیکمەتی کوڕی مەلا ڕەحمان، وەڵامی نەدایەوە، مەلا ڕەحمان ئاوڕی لە کەتان دایەوە و وتی، 'لەگەڵ عەولادی تۆدا.'

پاشان مەلا ڕەحمان خۆی خستە سەر لا و لە سالار و سارای ڕوانی و وتی، 'هەرچەندە من لە بەغداد لەدایک بووم، بەڵام ئەوەم لە باوکمەوە بۆ بەجێ ماوە، کە ئێمە خەڵکی شاری سلێمانین، ئیتر بەو جۆرە دڵم بەردەوام غەریبیی ئەو شارەی کردییە.'

'دەی چۆن مەگەر گۆڕی باووباپیرانت لە سلێمانی نەبێت؟'

سالار لە دایکی ڕوانی و لەژێر لێوەوە پێی وت، 'کام گۆڕی کەسوکار؟ مەگەر کێل و ئێسقانیان تەفروتوونا نەبووبێت؟'

مەلا ڕەحمان وتی، 'ئیتر چ بکەین! ئەوە قیسمەتی ئەوان بووە.'

سارا وەکو بیەوێت دڵنەواییان بداتەوە، چاوی بە هەمواندا گێڕا و بە دەنگی بەرز وتی، 'ڕۆحیانەتی ئەوان هەردەم لەو شارە ناڕوات، چونکە یادی ئەوان هەردەم لە دڵی ئێمەی جوودا زیندووە.'

دوای ئەوەی سارا ئەمەی وت، هەموو بێدەنگ بوون، دیار بوو هەر یەکەیان و لە خەیاڵی خۆیدا بیری لە قسەکەی سارا دەکردەوە، پێش ئەوەی بگەنە شاری کۆیە و لەسەر ڕێگای دووڕیانی ڕانیە و بە دەستی چەپیشدا بەرەو کۆیە بڕۆن، سارا پاڵی دابوویەوە و چاوی زرت و تەڕ بە درێژاییی ئەو ڕێگایە فرمێسکیان لێ دەچۆڕا و زوو زوو لە مەلا ڕەحمانی دەڕوانی، کاتێک بەناو شاری کۆیەدا

تێپەڕین، مەلا ڕەحمان لەبەرخۆیەوە وتی، 'حاجی قادری کۆیی، ئەو پیاوە زۆر بلیمەت بوو، ئاستی ڕۆشنبیریی و دنیابینیی لە سەرجەم شاعیر و نووسەرە بەهەشتچییەکانی تری سەردەمی خۆی بالاتر بوو!'

لەو کاتەدا سالار لە دوکان و خەڵکی سەر جادەکانی دەڕوانی، لەبەرخۆیەوە وتی، 'بێگومان.'

'ئەم شارە تاکو پێش ساڵی ١٩٥٢ بیست خێزانی کوردی جوولەکەی تێدا بوو، دوایین خێزان کە کۆچیان کرد و کۆیەیان بەجێ هێشت ماڵی پوورە سەلمام بوو.'

مەلا ڕەحمان، بێ ئەوەی لە سارا بڕوانێت، لە وەڵامدا وتی، 'ئیتر ئەوەش قیسمەت و نسیب کچی خۆم!'

سارا لەژێر لێوەوە، 'قیسمەت و نسیب، بەڵێ مامۆستا فەرمایشتی جەنابتە!'

ڕێگاکە تاوەکو دەگەیشتە نێزیک دێگەڵە، بیست کیلۆمەترێک دەبوو، ئەو ڕێگایە سەرەتا بە جادەیەکی تازەی قیرتاوکراو دەستی پێ کرد و دوایین پێنج کیلۆمەتری زیخ و گڵێکی تێکەڵ بوو، پێ دەچوو هێڵی کێشراوی ئەندازیارەکەی بزر کردبێت، پێچاوپێچ و چاڵوچۆڵ بەو پێدەشتەدا کشابوو، حیکمەتی شوفێر چەند جارێک لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئەوەی چەند ساڵێکە خەریکین!'

حیکمەتی کوڕی مەلا ڕەحمان بە درێژاییی ئەو ڕێگایە لەوە زیاتر هیچی تری نەوت، سارا لە پشتی شوفێرەکەوە کزۆڵەی کردبوو، بەردەوام لە مەلا ڕەحمانی دەڕوانی، وەکو چاوەڕوان بێت ئاخۆ کەی مەلا ڕەحمان یادگارییەکانی خۆی لەگەڵ باپیرە خایمدا دەگێڕێتەوە، ئارۆن لە باوەشی کەتاندا، پێکەوە پێش ئەوەی بگەنە ناو شاری کۆیە خەویان لێ کەوتبوو.

به چـواردەوردا هەتا چاو بڕ بکات دەشتێکی پان و بەرین، زەویی پارچەپارچەکراوی ڕەنگاوڕەنگ، ناوبەناو لە بەینی سنووری ئەو زەوییانەدا دڕک و چاوبازەی کێوی بۆ ئەو باخچەی گوڵانە بووبوونە چوارچێوەیەک، ڕانەمەڕ و بزنی ڕەش و بۆر بە ڕووی ئەو دەشتەدا پرژابوون، ئاسمانێکی بێگەرد و شین و لە دوورەوە ترۆپکی شـاخـەکـان سپییان دەکــردەوە، زوو زوو کزەبایەکی فێنک لە درز و کەلەبەری ئەو جێبە کۆنەوە ئارەقەی جەستەی سەرنشینەکانی وشک دەکردەوە.

## ١٩

دەمەو ئێوارەی ڕۆژی شەممە گەیشتنە شاری هەولێر و لە ماڵی مەلا ڕەحمان دابەزین، لەناو حەوشەی ماڵەکەدا وەستابوون، کاتێک مەلا ڕەحمان باسی ئەوەی بۆ کردن، کە مانگێک پێش ئەو ڕۆژە کافەی ژنی بە نەخۆشییەکی کوتوپڕ مردووە، دوای ئەوەی چوونە ژوورەوە، مەلا ڕەحمان لە کەتان و سارای ڕوانی و پێی وتن، 'ئیتر ماڵی بێکەیبانوو ساردوسڕە، من و حیکمەتی کوڕم بێکافەییمان پێوە دیارە و لە ماڵداریدا هەردووکمان زۆر دەستەپاچەین، بۆمان دەر کەوتووە ئێمە دوو پیاوی تەمبەرین، ئەوەتا کافەمان کردۆتە بیانوو بۆ ئەوەی کار نەکەین، ئیتر چاوەڕوانی ئێوە بووین تاوەکو بێن و قۆڵی لێ هەڵماڵن و دەستێک بەم ماڵەدا بێنن.'

'دەی بەسەرچاو، یوسف گیان یاخوا یادی کافە لەلای ئێوە دایم زیندوو بێت.'

'لەگەڵ مردووانی تۆدا کەتان خان.'

مەلا ڕەحمان لە چێشتخانەکەیان ئاماژەی بە مەجەڵێکی فافۆنی گەورە کرد و بە کەتانی وت، 'ئەوە دوێنێ شۆربای نیسکێنمان لێ نابوو، زۆرە و بەشی هەموومان دەکات، گوتم با ئەمڕۆ شەممەیە و ئاگر نەکەینەوە، دوایی لەگەڵ نانی تیری حازری بکەن و لەو دۆرابە ئاسنەیشدا شەرابی تێدایە، بەڵام شەرابەکە لە مەسینەدایە، وتم ئێ نەوەکی ناحاڵییەک ڕێگای بکەوێتە ماڵم.'

کەتان دەستی خستە سەر شانی مەلا ڕەحمان و پێی وت، 'دەڵێم

یوسف گیان، خۆ تۆ عادەت و تەقالیدی خۆمانت ون نەکردووە؟'
'نا، نا چۆن کەتان خان حەیفت نەکرد.'
سالار مەسینەکەی بە دەستەوە بوو، بۆنی شەرابەکەی کرد و لەبەرخۆیەوە پرسیی، 'بۆنەکەی تایبەتە، ئەوە شەرابی کوێیە؟'
'شەرابی ماتانە و لە کەرکووک دروووست کراوە!'
'ماتان؟'
'نەخێر سالار گیان ئەوە خۆم درووستم کردووە، بۆیە ناوی ماتانم هێنا بۆ ئەوەی ناوی بێنمە ناو ناوان، ماتان هاوڕێی نێزیکم بوو، وەکی خایم... ئای یادت بەخێر خایم گیان، خۆزگە تەمەن بواری پێ دەداین تاوەکو بۆ تەنها جارێک یەکترینمان دەبینییەوە.'
سارا لە مەلا ڕەحمانی ڕوانی و سەری بۆ لەقاند، 'ئێ دەی مادام شەرابێکی تایبەتە با پێکەوە تامی بکەین، مەبەستم بە یادی ماتان و باپیرە خایمەوە.'
کەتان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، 'ئیتر چی بکەین؟ ئەوەیش قەدەری ئێمەیە!'
کاتێک حیکمەتی مەلا ڕەحمان پێنج پیاڵەی لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانا، سالار پڕی کردن لە شەراب، دوای ئەوەی پیاڵەی شەرابەکەیان هەڵبڕی، هەموو بەکۆرس، 'لا خایم.'
بۆ ماوەی ساڵێک لە هەولێر مانەوە، سارا و خەسووی لە ماڵی مەلا ڕەحمان نەهاتنە دەرەوە، سالار دوو جار لەگەڵ حیکمەتی کوڕی مەلا ڕەحماندا بۆ سلێمانی گەڕایەوە، دواجار سامی فەرەج بە سالاری وتبوو، ئەگەر بە زووترین کات هەردووکیان هەڵ نەیەن و نەچنە شاخ، ئەوا دەستگیر دەکرێن، چونکە زۆربەی هاوڕێکانیان لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە دەستگیر کراون.
سامی فەرەج نامەیەکی جەمال عەلیی بۆ سالار خوێندبۆوە، پاش

ئەحواڵپرسین، داوای لێ کردبوون، کە زۆر بە پێویستی دەزانێت هەردووکیان لە ماوەی حەفتەیەکدا بگەنە دۆڵی زەڵێ.

ئەو ڕۆژە لە ماڵی سامی فەرەج، سالار بڕیاری ئەوەی دابوو، کە لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا دایکی بۆ سلێمانی بەرێتەوە و پاشان لەگەڵ سارا و کوڕەکەیاندا لە هەولێرەوە بۆ زەڵێ بڕوات.

ئەو ڕۆژەی حیکمەتی کوڕی مەلا ڕەحمان لەناو کەمپی ئاوارەکانی دۆڵی زەڵێدا جێبەکەی وەستاند، ئەوان لەنێوان خۆیاندا بڕیاری ئەوەیان دابوو، سارا و سالار لەو کەمپە بمێننەوە و کەتانیش لەگەڵ حیکمەتی مەلا ڕەحماندا بۆ سلێمانی بگەڕێتەوە، سامی فەرەج و سازگاری ژنی لەسەر ڕێگاکەیان وەستابوون و چاوەڕوانیان دەکردن، سالار، کاتێک جێبەکە وەستا، بە دایکی وت، 'دایە لە گەڕەکی چوارباخ دەچیتەوە ماڵی ئایشە خانی ژنی شێخ حسێنی ڕەحمەتی و دیسان هەمان ژوورم لەوێ بۆ بە کرێ گرتوویتەوە، دەبیتەوە بە دروارسێی نازداری هاوڕێت.'

کەتان وەڵامی سالاری نەدایەوە، لەو کاتەدا ئارۆنی کوڕەزای لە باوەشدا بوو، چەند جارێک توند بە خۆیەوە نووساندی و پاشان ئارۆنی دایە دەستی سارا، پێش ئەوەی سارا لە جێبەکە دابەزێت، باوەشی کرد بە ملی خەسوویدا و چەند جارێک ئەملاولای ماچ کرد، کەتان نەیتوانی هیچ بڵێت و تەنها بە لچکی فەقیانەی کراسەکەی فرمێسکەکانی دەسڕی.

دوای ئەوەی لەلای سامی فەرەج و سازگار لە جێبەکە دابەزین، ماڵئاواییان لە کەتان و حیکمەتی مەلا ڕەحمان کرد و جێبەکە بە هەمان ئەو ڕێگایەدا گەڕایەوە کە پێیدا بۆ ناو کەمپی زەڵێ هاتبوو.

ڕۆژێک پێش ئەو ڕۆژەی سالار و سارا بگەن، سامی فەرەج خێمەی بۆ خۆیان و سالار و سارایش هەڵدابوو، پاشان ئێوارەی ئەو ڕۆژەیان بە گەڕان و یەکترناسین لەگەڵ دانیشتووی کەمپەکەدا بردە سەر.

سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوایی، سارا تایەکی گەرمی لێ هاتبوو، سەرەڕای ئەو دەردەی، خۆشی سەرمای بووبوو، لەچاو ڕۆژانی پێشوودا گۆڕانکاریی بەسەردا نەهاتبوو، ئەو دەرمانانەی دکتۆر لە شاری هەولێر بە سارای دابوو، چارەسەری ئەو دەرد و ئازارەی سارایان نەکرد، دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، سازگاری ژنی سامی فەرەج چووبوو بەداوای دکتۆر نزار خالیدیدا، کە دکتۆری کۆمەڵەی ڕۆژهەڵات بوو، بە سەردان بۆ دێهاتەکانی دۆڵی زەڵێ هاتبوو، دکتۆر نزار بە سارای وتبوو، هیچ نییە و تەنها سەرمات بووە.

سالار چەند ڕۆژێک بوو لەگەڵ سامی فەرەج بە سەردان بۆ سەرگەڵوو چووبوو، بێخەم سارا و ئارۆنی لە لای سازگاری ژنی سامی فەرەج جێ هێشتبوو، لەو ڕۆژانەدا دوو ژن لە شاری سنەوە هەڵهاتبوون و لەوێ میوان بوون، سارا زۆر دڵی پێیان دەکرایەوە و هەستی دەکرد پەیوەندیکردن لەگەڵیاندا کەمێک ئازارەکانی لەبیر دەباتەوە، دانیشتووانی کەمپەکە ناویان لێ نابوون گوڵەکانی شۆڕشگێڕان، دوو ئافرەتی قەشەنگ و بەژن و باڵا ڕێک و ڕووخۆش بوون، هاوتەمەنی یەک بوون و تازە لە زانکۆی تاران خوێندنیان تەواو کردبوو، تەمەنیان خۆی لە بیستوچوار ساڵ دەدا، بە هەڵسوکەوتیان وزەیان بە دانیشتووانی کەمپەکە دەبەخشی، شەو و ڕۆژ گۆرانی و قاقای پێکەنینیان وەک دەنگی باز بەو دۆڵەدا دەنگی دەدایەوە، ئەو دوو گوڵەی شۆڕشگێڕان ناویان تەلا و تابان بوو، کە لەو ڕۆژانەدا ئاسوودەییان بە ڕۆحی ماندووی سارا دەبەخشی.

سالار کاتێک لە سەرگەڵوو گەڕایەوە و سارای بەو زەلیلییە بینی، لەبەرخۆیەوە بە سازگاری وتبوو، 'نازانم من ئەو کەرێتییەم بۆ کرد و سارام بۆ چی بەو زەلیلییە مەجبوور کرد بۆ شاخ لەگەڵم بێت.'

باری تەندروستیی سارا ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو خراپی دەچوو، ڕەنگی

زەرد و لاواز بووبوو، شەو تاکو بەیانی بەدەم گریانەوە گۆرانی ئەوت و ڕۆحی ماندووی خۆی دەلاواندەوە، سالار ناچار بوو شەوانە بەدیاریەوە دانیشێت و نەنوێت، چونکە سارا شەو درەنگ دەر دەچووە دەرەوە و بەناو ئەو دارستانانەدا دەگەڕا و بەدەم گریانەوە بانگی لە دایک و باوک و مەحموودی برای و باپیرە خایم دەکرد.

سارا بە سالاری وتبوو، 'ئەریٚ سالار، ئەگەر ئێمە لە سلێمانی بمابنایەتەوە لەلایەن حکومەتەوە دەستگیر دەکراین؟ یان ئەوە تەنها بڕیاری خۆت بوو بۆ ئەوەی لە هاوڕێکانت نێزیک بیت و بەزمی شەوانە و عارەقخواردنەوەت بەردەوام بێت؟'

بێجگە لەوەی ترسی بەجێهێشتن و لێکدابڕان خەیاڵ و ڕۆحی سارایان وێران کردبوو، هەروەها بە لایەوە گران بوو شاری سلێمانیی جیٚ هێشتبوو، لەو ڕۆژانەدا سارا زوو زوو بە لاچاو لە ئارۆنی کوڕی دەڕوانی، کاتێک ئارۆن دەگریا، سارا هەردوو گوێیەکانی خۆی بەتوندی دەگرت، یان جێی دەهێشت و لێی دوور دەکەوتەوە.

سالار بەڵێنی ئەوەی بە سارا دابوو کەسێک پەیدا بکات و لەگەڵ ئارۆن بۆ شاری سلێمانی بگەڕێنەوە.

سالار ئەوەی دەزانی گوزەرانی کەتانی دایکی باش نییە و لە ژوورێکی بچووکدا دەژی، لەماڵی ئایشەخانی ژنی شێخ حسێن لە گەڕەکی چوارباخ ژوورێکی بە کریٚ گرتبوو، وەکو جاران دەستی کردبوویەوە بە پیشە کۆنەکەی، کەتان لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە تاکو ئەو تەمەنەی لە باخەکانی بۆگەنەی خوار شار کەوەر و تەڕەتیزەی دەڕنی.

هەروەها لەو ڕۆژەوەی خایمی تاقە کەس و برا گەورەی کەتان لە شەو و ڕۆژێکدا بێسەروشوێن کرا، بەردەوام ماتەمی و بێزارییەک بە ڕووی کەتانەوە دیار بوو، زۆر کەم دەدوا و بەردەوام لەبەرخۆیەوە

نزای دەکرد. سالار دایم بیری لە گوزەرانی کەتانی دایکی و سارای خێزانی دەکردەوە، هەردەم ئەو هیوایەیی لە قووڵایی دڵی خۆیدا هەڵگرتبوو، کە ڕۆژێک بێت سارا و کەتان بە دیداری کەسوکاریان، بەتایبەتی باپیرە خایم، شاد ببنەوە.

کاتێک سالار بیری لێ دەکردەوە و دەیویست بڕیاری ئەوە بدات کوردستان جێ بێڵێت و سارا و کەتانی دایکی بۆ وڵاتی ئیسرائیل بەرێت، لەو کاتانەدا ئازارێک سەرسنگی دادەگرت و هەناسەی لەبەر دەبڕا، پاشان سالار باوەڕی وا بوو سارای ژنی هەمان هەستی هەیە و ڕۆحی بە جۆرێک پابەندە بەو شوێنەوە، کە ناتوانێت لێی داببڕێت.

## ٢٠

کاتژمێر دەی شەو، ڕۆژی پێنجشەممەی مانگی یانزەی ساڵی ١٩٧٧ بوو، سارا لەسەر باڵی سالار گیانی دەر چوو، سالار بێدەنگ و بەنازەوە، دەمی نابووە بناگوێی سارا و بەردەوام بانگی دەکرد، 'سارا، سارا گیان، گوێت لێمە!'

نەیدەویست باوەڕ بەوە بێنێت کە سارا گیانی تێدا نەماوە و مردووە، دوودڵ بوو لە مردنی و تەمەننای ئەوەی دەکرد تەنها کێشەی هەناسەدانی هەبێت، لەپەسا دەستی بە سنگیدا دەهێنا، ئەو شەوە تاکو بەیانی ڕۆژ بوویەوە بە هەمان شێوە و هەمان ڕیتمی دەنگ بەردەوام بانگی لێ دەکرد، سازگاری خێزانی سامی فەرەجی کاتێک خۆی کرد بە چادرەکەدا، تاوێک بوو لە دەرەوەی چادرەکە وەستابوو، بانگی دەکردن، 'کاکە سالار، سارا خان'

سازگار هاتبوو تاکو بزانێت بۆچی بەو بەیانییە ئارۆن لە ناو کەمپەکەدا بە تەنیا و بە پێی پەتی دەگەڕا، کاتێک سازگار هاتە ژوورێ، دەستی ئارۆنی گرتبوو، بینیی سالار لەسەر ئەژنۆکانی و لەسەر ئەرزی ناو چادرەکە بوو، ساراش لەسەر ڕانی سالار ڕاکشابوو، بەهێمنییەکەوە بەسەر سالاردا دانەوییەوە و دەستێکی خستە سەر شانی سالار و وتی، 'ئەوە چییە کاکە سالار، دیسان لە هۆش خۆی چۆتەوە؟'

سالار بەردەوام لەبەرخۆیەوە بانگی دەکرد، 'سارا، سارا' دەنگی بەئەستەم دەر دەهات و زیاتر لە نووزەنووزێک دەچوو،

سالار ئەو شەوە نەگریا، بەڵام بەردەوام بە خەیاڵ دەگەڕایەوە بۆ ڕابردووی، هەروەها بیری لەو گفتانە دەکردەوە کە لەو ڕۆژانەی دواییدا بە سارای دابوون، کە گوایا دەگەڕێنەوە بۆ شاری سلێمانی یان دەچنە تاران و لەوێوە بۆ یەکێک لە وڵاتەکانی ئەورووپا دەڕۆن.

سازگار لە تەنیشتی سالارەوە هاتبووە سەر چۆک و خۆی بەسەر لاشەی ساردوسڕی سارادا چەماندەوە و سەری خستە سەر مەمکی لای چەپی و تاوێک بێدەنگ گوێی لە دڵی گرت، پاش ئەوەی ڕاست بوویەوە و بەسەرسووڕمانێکەوە لە سالاری ڕوانی، پڕی کرد بە مەچەکی چەپی سارادا و تاوێک سەری دوو پەنجەی لەسەر مەچەکی باریک و ساردی سارا دانا، پاش چەند هەناسەیەک سازگار بەپەشۆکاوییەوە هەستایە سەر پێ و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، بەهەڵەداوان لە چادرەکە چووە دەرەوە، زۆری پێ نەچوو لەگەڵ سۆرانی مزەمیددا گەڕایەوە، هەر لە هاتنەژوورەوەیاندا سۆران پرسیی، 'لە کەیەوە وای لێ هاتووە؟

'نازانم، بەڵام وا بزانم دڵیشی لێ نادات!'

لە کاتێکدا سازگار ئەمەی وت، گەیشتبووە لای سارا و دیسان لە تەنیشتیەوە هاتە سەر چۆک و دەستێکی سارای گرت، سۆران و سازگار سارایان لە ژێر دەستی سالار دەر هێنا و لەسەر دۆشەکێک لە سووچێکی چادرەکە ڕایان کێشا، سۆرانی مزەمید بە هەردوو لەپی دەستی هێزی لە سنگی دەکرد و لێوە گەرمەکانی دەنان بە لێوە تەنک و سارد و بێخوێنەکانی ساراوە و زوو زوو فووی بە قوڕگیدا دەکرد، سالار لە جێگای خۆی نەجووڵا و پشتی لە سۆران و سازگار کردبوو، بەردەوام دەنگی لێوە دەهات و لەبەرخۆیەوە نووزەنووزی بوو، لەو کاتەدا ناو چادرەکە سارد بوو، بەڵام سۆران هەموو ئازای گیانی تەڕ بوو، ئارەقەی ناوچەوانی تک تک

بۆ سەر سنگ و ڕووی سارا دەتکان، سۆران دەیزانی سارا گیانی تێدا نەماوە، بەڵام سۆران مانگێک بوو لە شارەوە هاتبووە شاخ و تەمەنی تەنها نۆزدە ساڵ بوو، دڵگەرمیی خۆی و جوانیی سارا کارێکی وایان لە سۆران کردبوو، نەی دەتوانی دەستبەرداری بێت و دەیویست وەک پێغەمبەرێک یان جادووگەرێک ڕۆح بە بەری سارادا بکاتەوە، پاشان سۆران، ناچار بوو، بێهیوا دەستی هەڵبڕی و دەستی کرد بە پاڕانەوە.

سازگار هەستا و لە چادرەکە دەر چوو، کاتێک لەگەڵ سامی فەرەجا گەڕایەوە، دیار بوو زۆربەی دانیشتووانی کەمپەکەیان ئاگادار کردبۆوە، سالار لە بەرپێی ئەو خەڵکەدا ئەژنۆی دادابووە سەر زەوی، سەری داخستبوو زوو زوو لەناو ئەو غەڵبەغەڵبەدا نووزەیەکی لێوە دەهات، چاوی لەسەر کۆشی بڕیبوو، لەو جێگایەی چاوەکانی سارا بۆ دوایین جار لێیان ڕوانی، دوو گەنجی تەمەن بیست ساڵە دەستیان دایە بنباڵی سالار و لە چادرەکە بردیانە دەرەوە، پاشان ژنان پیاوەکانیان لە چادرەکە کردە دەرەوە، دیار بوو هەموو لە مردنی سارا دڵنیا بوون.

پیاوان لە بەردەمی چادرەکەدا لەدەوری سالار کۆ بوونەوە، کە تاکو ئەو دەمەیش لەویادا کزلە لەسەر کۆتەرە دارێک دانیشتبوو، دوو کوڕە گەنجەکە هێشتا لە ڕاست و چەپی سالارەوە وەستابوون، ژنان لە دەرەوەی چادرەکە مەنجەڵی ئاویان خستە سەر سێپا و ئاگریان لە ژێردا کردەوە.

کاتێک سازگاری خێزانی سامی فەرەج بە سەتڵێک خەریکی شیلەتێنکردنی ئاوەکە بوو، سالار ڕاپەڕی و لەناو پیاوەکانەوە بەهەڵەداوان چوو ڕێگای پێ گرت و بەپەشۆکاوییەکەوە بە دەنگی بەرز پێی وت، 'تکات لێ دەکەم سازگار خان بە دەستووری دیانەتی

ئیسلام مەیشۆن و کفنی مەکەن، با لەوە زیاتر ئازاری ڕۆحی نەدەین!'

لە کاتێکدا سالار ئەمەی وت، پیاوەکان هەموو گوێقوڵاخ و بەسەرسامییەوە لە سالاریان ڕوانی، سازگار بە سالاری وت، 'نا، نا، کاکە سالار، دەی مردوو نابێت بشۆرێت و کفن و دفن بکرێت؟'

سالار چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و لەپەسا لێوەکانی لێک هەڵدەگلۆفین، وەک بیەوێت شتێک بڵێت، بەرانبەر سازگار وشک وەستابوو، لەو کاتەدا سامی فەرەج لە بەینیاندا قوت بوویەوە و دەستێکی خستە سەر شانی سالار و ڕووی لە سازگاری خێزانی کرد و وتی، 'سازگار گیان، با بە دەستووری دیانەتی خۆیان بشۆرێت و کفن و دفن بکرێت.'

'جا، دەستووری دیانەتی خۆیان چۆنە، ئێستا ئێمە چی بکەین باشە؟'

سالار، بە چواردەوریدا ڕوانی و بەبێزارییەکەوە چوو بۆ بەردەم چادرەکە و دیسان گەڕایەوە، پاشان ڕووی لە سازگار کرد، 'بە "تەهارا" بەڵێ وەکو تر نا، سارا خۆی وای دەویست، تکات لێ دەکەم، سازگار خان، هەموویان بکەرە دەرەوە و هەر خۆت... بەڵێ، هەر خۆت بەتەنیا، چیت پێ دەڵێم ئەوەم بۆ بکە، دەی خێرا تاکو ڕووتیان نەکردۆتەوە، با هەر جلەکانی خۆی لەبەردا بێت و لەسەر جلەکانیەوە چەند سەتڵێک ئاوی شیلەتێنی پێدا بکە، پاشان گۆرەوییەکانی لە پێ بکەرەوە و جوان بەتانییەکەی خۆی تێوە پێچە، لەوە زیاتر نا، هێواش بە دەستێکت چاوەکانیشیم بۆ دابخە، دەی تکات لێ دەکەم دەستوبرد بکە تاکو ئەو هەموو ژنە چاو نەبڕنە لاشەی بێگیانی سارا، با لەوە زیاتر ئازاری ڕۆحی نەدەین و بێڕێزیی پێ نەکەین.'

سازگار بێدەنگ لە سالاری ڕوانی و چووە ژووری، ئەوەندەی پێ نەچوو، ژنەکان بە بۆڵەبۆڵ بەدوای یەکدا لە چادرەکە هاتنە دەر و بە شانی سالاردا ڕۆشتن، هەموو تووڕە و بێزار دیار بوون، ژنەکان لە بەردەم چادرەکەدا تێکەڵی پیاوان بوون، یەکێک لە ژنەکان، ئافرەتێکی بالابەرزی شەست ساڵە بوو، ڕووی لە سالار کرد و دەستی لێ پان کردەوە و وتی، 'ئەرێ ڕۆڵە گیان چۆن وا دەبێت، بۆ بێڕێزی بەو مردووە دەکەیت، کە کەسێک مرد واجبە جوان بشۆرێت و کفن و دفن بکرێت، وەکو چۆن خوا و پێغەمبەر ڕازییان لەسەرە!'

سالار سەیرێکی کرد و هیچی نەوت، ئەوانەی لەوێدا بوون هیچیان لە مەبەستی ئەو ڕوانینەی سالار تێنەگەیشتن، پێیان وا بوو، ئەو کردەوەیەی سالار لە بیری کۆمۆنیستییەوە سەر چاوەی گرتووە، بێجگە لە سامی فەرەجی هاوڕێی، کەس لە مەبەستی سالار تێنەگەیشت، سالار بێدەنگ و کزۆڵە لە بەردەمی دەرگای چادرەکەدا وەستابوو، سامی فەرەج ڕووی لە خەڵکەکە کرد و پێی وتن، 'دەی هاوڕێیان، خوشکان، بڵاوەی لێ بکەن و هەرکات پێویستیمان پێتان بوو بانگتان دەکەین.'

سالار و سامی فەرەج بەتەنیا مابوونەوە، سازگار دوو جار هاتە دەر بە سەتڵ ئاوی گەرمی برد، بۆ دوایین جار گەڕایەوە لای سالار و وتی، 'کاک سالار بەتانییەکەی چۆن تێوە ئاڵێنم... یانی...؟'

سالار قسەکانی بە سازگار بڕی و پێی وت، 'هەر وەک چۆن منالی مەلۆتکە قوماتە دەکەیت، دەموچاویشی داپۆشە، با هیچ جێگایەکی بەدەرەوە نەبێت، ئەوە من و سامی دەچین چاڵێکی بۆ هەڵدەکەنین و تۆ ئاگات لە سارا بێت، تکایە قبووڵی مەکە کەس پێ بنێتە ناو ئەو چادرەوە، مەبەستم کەس بۆی نییە ئەو مردووە

ببینێت، ئیتر بە هیچ بیانوو و مەبەستێک بێت.'

سازگار سەرێکی بۆ سالار ڕاوەشاند و وتی، 'بەسەرچاو، هیچ خەمت نەبێت.'

سازگار گەڕایەوە ناو چادرەکە و سالار و سامی فەرەج لەوەدا بوون بڕۆن، ئارۆن لەولا چاردەکەوە بەڕاکردن و بە پێی پەتی بەرەو لایان هات و ویستی بەرەو دەرگای چادرەکە بڕوات، سالار بەهەڵەشییەکەوە پەلاماری دا و لەباوەشی گرت، لەو کاتەدا ئارۆن خۆی لە باوەشی باوکیدا ڕاپسکاند و وتی، 'دەچم بۆ لای دایکم، دەچم بۆ لای دایکم.'

سالار بە دەنگێکی نووساو و بەدەم گریانەوە، کە بەردەوام ڕووی لە ئارۆنی کوڕی وەر دەگێڕا و بە مەبەستی ئەوەی هەستی پێ نەکات کە باوکی دەگری، بە ئارۆنی وت، 'دوایی، دوایی.'

کاتێک دەستیان کرد بە ڕۆشتن، سامی فەرەج ئارۆنی لە سالار وەر گرت و دەستی کرد بە قسە و پرسیارلێکردنی، سالار نەیویست کەس یارمەتییان بدات، لەگەڵ سامی فەرەج پاچ و خاکەنازیان هەڵگرت و چوون لە بەرزاییەکی بەرانبەر کەمپەکە بەنۆرە دەستیان کرد بە گۆڕهەڵکەندن، ئارۆنیش تاوێک بوو دایکی لەبیر چووبۆوە و بەدەوری ئەو دوو گۆڕهەڵکەنەدا بەردی لەسەر یەک هەڵدەچنی، چەندین ژن و پیاوی ناو کەمپەکە لە بەردەمی چادرەکانەوە بەردەوام لە دوورەوە لێیان دەڕوانین، دوو پیاو خۆیان هاتن بۆ لای سالار و سامی فەرەج و قۆڵیان لێ هەڵماڵی و گۆڕەکەیان لەگەڵدا هەڵکەندن، دوای ئەوەی گۆڕهەڵکەنەکان بۆ بەردەمی چادرەکە گەڕانەوە، سالار دەستێکی خستە سەر شانی سامی فەرەج و چاوی بە خەڵکەکەدا گێڕا و پێی وتن، 'سوپاسی ئامادەبوون و دڵسۆزیتان دەکەم، ئەگەر ڕوخسەتم پێ بدەن دەمەوێت خۆم بەتەنیا تەرمی

سارا بشارمەوە، پاشان هەموو لایەک بەخێر بێن.'

خەڵکەکە بەنابەدڵییەکەوە سەریان بۆ سالار لەقاند و سامی فەرەج دەستی ئارۆنی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی.

کاتێک سالار خۆی کرد بە چادرەکەدا، سازگار لە سووچێکی چادرەکەوە لەسەر کۆتەرەیەک دانیشتبوو، دیار بوو ئەوەندە گریابوو چاوی سوور هەڵگەڕابوون و ڕوومەتەکانی هێشتا تەڕ بوون، سازگار کاتێک سالاری بینی، هەستایە سەر پێ و بەرەو ڕووی چوو، دەستی بۆ لای تەرمەکەی سارا درێژ کرد و بەدەم گریانەوە وتی، 'کاک سالار ئاوا مەبەستت بوو، یان نازانم چۆن!'

سالار دەستی سازگاری گرت و چاوی لە چاوی بڕی و پێی وت، 'دەستت خۆش بێت، زۆر مەمنوونتم، لەوە باشتر نابێت، مەبەستم ئەوە بوو کە بە دڵی سارا خۆی لەگەڵدا بکەین، ئیتر جێی بێڵە بۆ خۆم و تۆ بڕۆ ئیسراحەت بکە.'

کاتێک سازگار ویستی بڕوات، سالار بانگی کرد، 'ئا، سازگار خان ئەگەر چاوێکت لە ئارۆن بێت... تاوەکو من سارا بە خاک دەسپێرم.'

سازگار سەرێکی بۆ سالار ڕاوەشاند و بێ ئەوەی بتوانێت هیچ بڵێت، لەپەسا دەگریا و هەموو گیانی دەلەرزی، پاشان پشتی کردە سالار و لە چادرەکە دەر چوو.

سارا ئەودەم ئەوەندە لاواز بووبوو کێشی لە چل کیلۆیەک تێنەدەپەڕی، سالار سارای لە باوەش گرت و خێرا لە چادرەکە چووە دەرەوە، هەنگاوی خێرا خێرای دەنا و گەیشتە سەر ئەو گۆڕەی بۆ سارایان هەڵکەندبوو، گۆڕەکەی سارا لەسەر گردۆڵکەیەک و بەسەر کەمپەکەدا دەیڕوانی، پاش ئەوەی تاوێک چۆکی دادابووە سەر لێواری گۆڕەکە، سارای نا بە سنگیەوە و بەدەم گریانەوە

لەبەرخۆیەوە وتی، 'بمبوورە ئازیزەکەم، ئیتر تاوەکو ئێرە لەگەڵم بوویت، بەڵام بە ڕۆح لە یەک دانابڕێین، چونکە تا لە ژیاندا مابم یادی تۆ لە خەیاڵی مندا زیندووە.'

## ٢١

حەفتەیەک دوای مردنی سارا، بەردەوام لە پێشچاو و خەیاڵی سالاردا دەگەڕایەوە ژیان، لەوە دەچوو ئەو مردنەی هێشتا قبووڵ نەکردبێت، زوو زوو پرسیاری لە خۆی ئەکرد، 'بێ سارا من چ ئەرکێکم لە ژیاندا ماوە؟'

تەواوی دانیشتووانی کەمپەکە هەستیان بە بێزاری و ماتەمینیی سالار دەکرد و لە ڕوخسار و ڕەوشتی ڕۆژانەیدا ڕەنگی دابوویەوە، مردنی سارا جێگای خۆی لەلای تەواوی دانیشتووانی کەمپەکە گرت، بەڵام سالار ئازاری لەدەستدانی سارا لەسەر جەستەی وەک جێگا گازی مارێک وا بوو، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئازارەکەی بۆ سەر ماسوولکەی دیوارەکانی دڵی ڕۆ دەچوو، زوو زوو وەک شێت بە دەستێکی گیانی هەڵدەکڕاند و بە دەستەکەی تریشی توند سەر دڵی پێ دەگوشی، ئاسەواری خورانی برینەکانیش لەسەر لەشی وەک جێدەمی مێشوولەیەک بەجێ مابوون.

سەرجەم هاوڕێ و دۆستانی سالار و تەواوی دانیشتووانی کەمپەکە، ئەو ڕۆژە کوور و ماتەم دیار بوون، ئەو حەفتەیە ئەوەندە بێدەنگ بەدیار یەکەوە دانیشتبوون، لە تەماشاکردنی یەک بێزار بووبوون، لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا شەکر و چا لە کەمپەکەدا نەما، دەمەو ئێوارەی ئەو ڕۆژە، سامی فەرەج، سالاری لەگەڵ خۆی بۆ چێشتخانەی کەمپەکە برد، بەو مەبەستەی بەڵکو لە چادرەکەی دەر چێت و لەوێش نانێک بخوات، کاتێک خۆیان کرد بە چێشتخانەکەدا،

پێشمەرگەکانی هەرێمی چوار لەوێ بوون، دیار بوو دوای دەرچوونێکی سێحەفتەیی بۆ ناوچەی قەرەداخ تازە گەڕابوونەوە، بۆنی پاتەی لاسیک و گۆرەوییان تێکەڵی بۆن و بوخاری برنجی چێشتخانەکە بووبوو، سامی فەرەج خێرا لە ڕێگاوە هەواڵی جەمالی لێ پرسین، یەکێک لە پێشمەرگەکان وتی، 'لە شێنێیە و هاکا پەیدا بوو.'

سالار ئاسەواری خەمێکی گران بە ڕووییەوە دیار بوو، چاوی ئاوساو و سوور هەڵگەڕابوو، بێڕەنگ و لاواز ئێسقانی سەر ڕوومەتەکانی دەر پەڕیبوون، هەر لە یەکەم ڕۆژی مردنی ساراوە جامانەکەی نەکردبۆوە سەری و قژی شێواو بوو، پێشمەرگەکان یەک یەک بەرەو ڕووی سالار هاتن و سەرەخۆشییان لێ کرد.

کاتێک جەمال عەلی خۆی کرد بە ژێر کەپری چێشتخانەکەدا، سالار و سامی فەرەج سەرقاڵی نانخواردن بوون، جەمال عەلی کڵاوێکی سەوزی لەسەردا بوو، بلووزێکی ڕەش و شەرواڵێکی خاکیی لەپێدا بوو، کاتێک سالاری بینی خێرا بەرەو ڕووی چوو و وتی، 'سالە گیان زۆر بەداخەوەم، دەی باوکە گیان لەو خەمە گەورەیە، زۆر زۆر بەو هەواڵە دڵگران بووم و هاوبەشی خەمتم!'

سالار کاتێک بە هەڵەداوان بەرەو ڕووی جەمال چوو، بێ ئەوەی هیچ بڵێت، دەستێکی خستە سەر شانی جەمال و سەری خستە سەر سنگی و بەکوڵ دەستی کرد بە گریان، دەنگی هاوار و بانگی گریانی سالار لە دەرەوەی کەپرەکە دەبیسترا، لەو کاتەدا بێجگە لە هاوڕێ نزیکەکانی خۆی، ئەو پیاوانەی لەوێ ئامادە بوون لە ئاسۆری فرمێسکەکانی سالار تێنەگەیشتن.

سالار هەستی دەکرد بارگرانیی ڕووداوەکانی ڕابردوویان، کە چەندین ساڵ بوو لە خەیاڵی ئەواندا پەنگیان خواردبۆوە بووبوونە هۆی

ئەوەی سارا نەخۆش بکەوێت، چونکە لە سەرەتاوە دەیزانی سارای هاوژینی خاوەنی ڕۆحێکی هەستیارە، ڕۆحێک بەردەوام هەستی بە ئازار و بارگرانیی جووەکان دەکرد، کە بەبێ خواستی خۆی یەکێک بوو لەوان، بەردەوام ڕۆحیانەتی باووباپیرانی دەبینی، بێجگە لە ڕۆحی ئەو کوڕ و کچە جوانەمەرگانەی لەسەر سەرەتاییترین بەشیان لە ژیان بێبەری کرابوون.

جارێک جەمال عەلی لە سارای پرسیبوو، 'حەز دەکەیت بچیت بۆ لای کەسوکارت لە ئیسرائیل؟'

سارا لە وەڵامدا وتبووی، 'نەخێر کاک جەمال، ئەگەر مەبەستت لە بینینەوەی کەسوکارمە، ئەوە خەریکم لە عەزرەتدا بەرەو لایان دەفڕم، بەڵام وەکو چوونم بۆ ئیسرائیل ئەوەیان باوەڕ ناکەم دڵم بەرایی بێنێت وڵاتەکەی خۆم جێ بێڵم، ئیتر هەست دەکەم ئیسرائیل هەموو شتێکی پیرۆزی لە من سەندەوە و ژیانی لە من تاڵ کرد، هەر لەبەر ئەو هۆکارەیە ئەو پیرۆزییەی جارانی لە لای من نەماوە، ئێمە هاوشێوەی نەمامێکین ڕەگمان لەسەر ئەم خاکە داکوتاوە، لێرە بڕۆین بێڕەگ دەبین و باوەڕ ناکەم جارێکی تر لە هیچ جێگایەک سەوز بینەوە. من وەکو خۆم تەمەننام ئەوەیە ئەم نیشتیمانە ببێتە دوانزرگەم.'

'سارا خان، ئێمە لەپێناوی ئەو خەونەی تۆدا پێشمەرگەین.'

'خۆ سالاریش زوو زوو وام پێ دەڵێت، بەڵام نازانم بۆچی دڵم ئارام ناگرێت!'

دڵنیام ڕۆحیانەتی سارا لە سنووری نیشتمانەکەی خۆی دەر نەچووە، وەکو خۆی چۆن بەردەوام تەمەننای ئەوەی کردبوو، کە بە مردوویش نایەوێت لە زێدی باووباپیرانی دوور بکەوێتەوە، ئەو خۆشەویستی سالار و باپیرە خایم بوو، ئەوان هەردەم دەیان ویست بۆ لای ئەو بگەڕێنەوە، بۆ نیشتمانەکەی سارا.

سارا... وەکو چۆن باپیرە خایم وتبووی، 'ئەگەر سارا ئەوەندە لە دڵی مندا شیرین بێت ئەوا ئەو جێگایەی ئەوی لێیە نیشتیمانمە و تەمەننا دەکەم دوانزرگەی منیش بێت.'

# ١

ئەمڕۆ دایکم گێچەڵی ئەوەی بە باوکم دەکرد و پێی دەوت، "باشترە لە گەڕەکی جوولەکان بگوێزینەوە و بچین لە گەڕەکێکی تێکەڵدا بژین."

باوکم لە وەڵامدا، "ژیانی من بەستراوەتەوە بە کنێسەتەکە و بەم ماڵ و گەڕەکەوە، ئێمە ئەگەر لەم گەڕەکە بڕۆین ئەسڵی خۆمان ون دەکەین و تەنانەت ناتوانین پەیڕەوی دین و ئوسووڵی خۆشمان بکەین."

ئیتر خۆ ئەم بەزم و باڵۆرەیە نابڕێتەوە، هەموو ئێوارەیەک لەسەر سفرەی نانخواردنەکەوە دەست پێ دەکات، خەون دەمانباتەوە و دەچینە ناو جێگاوە، تاکو نیوەی شەو گوێم لێیانە و بێوچان دەنگ و لێدوانیانە.

وا بزانم باوکم زیاتر خەمی ئێمەیەتی، من و مەحموودی برام لە خوێندن و لە کنێسەتەکە دانەبڕێین، باوکم گەلێک جار بە ڕووی دایکمدا هەڵ دەشاخێت و پێی دەڵێت، "ئێمەی جوو بە درێژاییی مێژوو هەر وا ژیاوین و خوای گەورە هەر ئەوەندەمان پێ ڕەوا دەبینێت، ئێمە زیاتر لە هەزار ساڵە لەلایەن کوردە موسوڵمانەکانەوە وەکو قەومێکی زەلیل و داڵدەدراو حسابمان بۆ دەکرێت."

باپیرە خایم هەموو جارێک بە باوکم دەڵێت، "ئێستا وەکو جاران نییە و لەم نزیکانەدا هەموو شتێک لە سلێمانیدا دەگۆڕێت و فەرق و جیاوازی لەنێوان جوویەک و مەسیحییەک و موسوڵمانێکدا نامێنێت، ئەوەی ئێستا لەگۆڕێیە، ئەوە عەرەبە شۆڤێنیستەکان و زایۆنستەکان بەرپایان کردبوو، کۆتایی دێت، کوڕی خۆم کۆتایی دێت، ئیتر ئێمە دەبێت سەبرمان بێت."

## ٢

ئەوە دوو ڕۆژە گوێزاومانەتەوە و لە گەڕەکی جوولەکان ڕۆیشتووین، کێ دراوسێمانە و ماڵەکەمان دەکەوێتە کوێی شار، جارێکا باش نازانم، ئەوەندە دەزانم ئێستا لە گەڕەکێکی تێکەڵین و ناوی گەڕەکەکە سابوونکەرانە، ئێستا دەرگای هۆڵەکەم کردۆتەوە و نازانم چەند دەبێت لێرەدا بەرامبەری دەرگای حەوشەکە وەستاوم، دەرگای حەوشەکەشم خستۆتە سەر پشت، دایکم تۆزێک پێش ئێستا هات بۆ لام و پێی وتم، 'وریا بە سارای من دڵت نەفرێت؟'

ئەمڕۆ دوو شت تەواوی خەیاڵیان داگیر کردووم و لە دوێنێوە بێئاگام لەوەی لەم ماڵەدا چی دەگوزەرێت.

یەکەم، ئەمڕۆ چاوەڕوانی سالارم و پڕ بە دڵم خوازیاری بینینیم، دڵم وەختە لە سنگم بەرەو گەڕەکی جوولەکان بۆ لای دەفڕێت.

دووەم، سبەینێ دوای پشووی هاوینێکی گەرم و بێزارکەر، قوتابخانە دەست پێ دەکاتەوە، ئەوەی زۆر دڵم پێی خۆشە، دەچم بۆ ناوەندی و لە قوتابخانەی گوێژەی کچان دەخوێنم.

چوونم بۆ قوتابخانە، ئەوە سبەینێیە و ئێستا و لە کاتی نووسینی ئەم یادداشتەمدا، چاوەڕوانی دڵخوازەکەم دەکەم و حەز دەکەم بە پێ تاکو سەرا، یان تاکو بەردەرگای ماڵی خۆیان لە گەڕەکی جوولەکان بە پیریەوە بچم، ئیتر ئێستا چاوەڕوانم.

## ٣

بەردەوام هەمان خەون دەبینم، لەو خەونەمدا تەمەنم شەش بۆ حەوت ساڵانە و ونبووم و پرسیاری باپیرە خایم لە هەمووان دەکەم. لە دەستپێکی ئەو خەونەمدا بەتەنیا بەڕێوەم، گەڕەک بە گەڕەکی شاری سلێمانی بە پێی پەتی و بە هەڵەداوان کۆڵان بە کۆڵانی دەگەڕێم، لە دەرگای هەموو ماڵەکان دەدەم، کەس وەڵامم ناداتەوە، یان وەڵامێکی دروستم پێ ناڵێت، خەڵکی ڕووی خۆیانم لێ وەر دەگێڕن، زۆربەی ماڵەکانی شار دەرگاکانیان قوفڵ داوە و ژەنگ کونی کێلونی قوفڵەکانی گرتووە، دیوار و سەربانی زۆرینەی ماڵەکان داڕووخاون، شار بۆتە وێرانە و پەردەی ڕەشی ئەستوور بە ڕووی پەنجەرەی ماڵەکاندا گیراوە، دیواری حەوشەکان چەندین مەتر بۆ حەوا هەڵکشاون، هەر کەسێک دەبینم جلی ڕەشی قەترانیی پۆشیوە، سلێمانی وەکو ئەو سەردەمە وەهایە، کە باپیرە خایم بۆی دەگێڕاینەوە، ئەو ڕۆژانەی گرانیی گەورە جەستەی ئەم شارەی داڕزاندبوو.

بەردەوام ئەم خەونە نەگریسە دەبینم، کاتێک لەو خەونەم ڕادەپەڕم، هێشتا چاوم پڕن لە فرمێسک و دڵم پڕە لە ئازار، هەموو ئازای گیانم نیشتۆتە سەر ئارەقە و زۆر بێزار و ماندووم و دڵم پڕە لە ترس، پاشان ناوێرم لەناو جێگاکەی خۆمدا بمێنمەوە، هەموو جارێک لە ترساندا هەڵدێم و دەچم بۆ ژوورەکەی دایکم و باوکم و بێدەنگ خۆم دەخەمە ناو باوەشی دایکمەوە.

کاتێک دایکم لێم دەپرسێت، 'ئەوە چییە سارا؟'

زۆر بەئەسپایی و لەژێر لێوەوە، 'هیچ، هیچ نییە دایکە.'

## ٤

ئەمڕۆ ڕۆژی نەورۆزە، تاوێک پێش ئێستا لە سەیران گەڕاینەوە، لەگەڵ سالار و مەحموودی برامدا چووبووین بۆ پیرمەنسوور، زۆربەی خەڵکی شاری لێ بوون، هاوڕێکانی قوتابخانەم و زۆربەری گەنجانی شار هاتبوون، کچانی قوتابخانەکانی تریش تەمسیلی حەپسەخانی نەقیب و مەستوورەی ئەردەلانییان پێشکەش کرد، نەجاتی مەحوی دەوری مەستوورەی دەبینی، ئەوەی زۆر بەلامەوە جوان بوو، تەمسیلی کاوەی ئاسنگەر و زوحاک بوو، دوای ئەوە لەگەڵ سالار و هاوڕێکانیدا ئەوەندە هەڵپەڕین هەموو گیانمان کەوتبووە سەر ئارەقە، سالار و مەحموود هیلاک نەدەبوون و بە درێژاییی ئەو دوانیوەڕۆیە بەردەوام هەڵپەڕین، من زوو زوو هەناسەم توند دەبوو، ناچار دەستم بەر دەدا و دەچووم لە لای شەمسەی شێخ مستەفا و ئەرخەوانی حەسەن موفتییەوە دادەنیشتم، ئەرخەوان بەردەوام چاوی لەسەر مەحموودی برام بوو، کاتێک ئەو دەشتەی پیرمەنسوور خەریک بوو چۆڵ دەبوو، ئێمەیش لە گەڕانەوەدا بووین، ئەرخەوان نامەیەکی وەکو نوشتە پێچابووەوە و خستیە ناو دەستم، ئەوەتا ئێستاش لەناو لچکی فەقیانەکەمدایە و نەمداوە بە مەحموود، بەتەمام نەیدەمێ تاکو خۆم نەیخوێنمەوە.

## ٥

دوێنێ لە نیوەی شەودا بوو، لە دەنگی لێدانی شووشەی پەنجەرەی ژوورەکەم بەخەبەر هاتم، لە سەرەتاوە ویستم لە ترساندا لە ژوورەکەم هەڵبێم و بۆ ژوورەکەی دایکم و باوکم بڕۆم، نازانم چ هەستێکم بوو ئەو توانایان خستە بەرم، تاکو سووچێکی پەردەکە لا بدەم و لێیەوە لە دەرەوە بڕوانم، کاتێک بینیم سالار دەموچاوی نابوو بە شووشەی پەنجەرەکەوە و هەوڵی دەدا لە ژوورەوە بڕوانێت، بە هەردوو دەستی توند ئاسنی قەراغی پەنجەرەکەی گرتبوو، ئیتر چۆن توانیبووی بێتە ئەو جێگایە، لە کاتێکدا پشیلەکان بەئەستەم دەیانتوانی بە قەراغی ئەو گوێسەبانە باریکەدا بڕۆن، لە ترساندا دڵم داخورپا و خەریک بوو لە هۆش خۆم بچم، شەوێکی مانگەشەو بوو، کاتێک پەنجەرەم لێ کردەوە، لێی تووڕە بووم و پێم وت، 'تۆ زۆر چاوقایمیت، ئەوە بۆچی هاتوویت؟'

ویستم زیاتر خۆمی لێ تووڕە بکەم، یان هەرچۆنێک بووە ڕازیی بکەم بڕوات، سالار هیچی نەوت، بەڵام بەهێواشی دەستێکی لە شیشی تەیمانی پەنجەرەکە بەر دا و خستییە سەر دەستم، لە ئەنجامی کاریگەریی ئەو بەریەککەوتنەدا خێرا گەرم داهاتم و برووسکەیەک بە گیانمدا هات، بێجگە لەوەی بێدەنگ لە چاویم دەڕوانی، نەمتوانی هیچی تری پێ بڵێم.

سالار پێی وتم، "ئەگەر بچمە خوار، دەرگای هۆڵەکەم بۆ دەکەیتەوە؟"

## ٦

دایکم و باوکم، مەحموود و باپیرە خایم نەیان ویست شاری سلێمانی جێ بهێڵن، بەڵام بەبێ خواستی خۆیان ئەو بڕیارەیان پێ درا و بۆ هەتاهەتایە لەم شارەیان دوور خستنەوە، ئەو شارەی تێیدا لەدایک بوون و تێیدا گەورە بووبوون، ئێستا ئەم شارە بۆ من بێ ئەوان بۆتە شاری غەریبان و چاوم بە کووچە و کۆلانەکانی هەڵنایەت، هەست دەکەم ئێستا ئێمە لێرە لە سەر زێدی باووباپیرانی خۆمان زیاتر هەست بە غەریبی و تەنیایی دەکەین، چونکە ئەوان لە وڵاتی ئیسرائیل پێکەوەن، کۆچی ئەوان بۆشاییەکی خستۆتە ژیانی ئێمەوە، کە بە هیچ شتێک جێگایان پڕ نابێتەوە، لەبیرم دێت، باپیرە خایم هەموو جارێک سەفەری دەکرد و ڕۆژێک یان زیاتر لەم شارە دوور دەکەوتەوە، کاتێک دەگەڕایەوە، چەند جارێک لەبەرخۆیەوە دەیوت، "ئاخ شارەکەم هیچ جێگا و شوێنێک نییە لەم دونیایەدا بەقەد تۆ دڵگیر و خۆش بێت."

ئێستا ئەو لەم شارە دوورە و بە جۆرێک مەجبوور کرا لێی دوور کەوێتەوە، نازانم دەبێت ئەو ئێستا دوور لەم شارە چەند دڵشکاو و بێزار بێت! دەبێت ئەو بێ سلێمانی چۆن ژیانی بەسەر بەرێت؟

## ٧

ئەمڕۆ ڕۆژی چوارشەممە بوو، لەگەڵ کەتانی خەسوومدا لە گەڕەکی سەرشەقام چووم بۆ حەمامی تازە، شەمسەی شێخ مستەفام بینی، هـاوڕێ کۆنەکەی خۆم و دڵخوازە کۆنەکەی سالار و مەحموودی برام، کە بە قسەی سالار خۆی بێت، بەس دووراودوور چاوبڕکێیان لەگەڵ یەکتردا کردبوو.

شەمسە چۆنیوچاکیی لەگەڵدا نەکردم، لەگەڵ ئەوەشدا دوو ساڵ لە ناوەندیی گۆیژەی کچان لەسەر ڕەحلەیەک و لە تەنیشتی یەکترەوە دادەنیشتین، بەڵام بەردەوام لە یەکترینمان دەڕوانی، بە ڕێکەوت لەلای یەکەوە هەریەکە و گونجێکمان گرت، ئەوەی ویستم لێرەدا لەم لاپەڕە نوێیەی یادداشتنامەکەمدا یادداشتی بکەم، باسوخواست نەبوون لەسەر کاتی هاوڕێیەتیمان، بەڵکو ئەوەی قابیلی نووسینەوەیە، ئەو شەڕە بوو، کە ئەمڕۆ بەبۆنەی شەمسەوە تووشمان بوو، کاتێک کەتان داوای لێ کردم لەگەڵی بچم، بیرم لەوە دەکردەوە، لە دوای ئەوەی کەسوکارم بەجێیان هێشتم، ئـەوە بۆ سـێ ساڵێک دەچێت بۆ حەمامی دەرەوە نەچووبووم.

وا بزانم من خەریکی شۆردنی پشتی خەسووم بووم، لەپڕ لە پشتم و سەرسمتمدا هەستم بە گەرمییەکی ئازاراوی کرد، بە جۆرێک پڕ بە حەمامەکە زریکاندم، خەسووم لەژێر دەستمدا ڕاپەڕی، دوایی زانیم، کە ئەویش بەشێک لە ئاوە گەرمەکەی بەر کەوتبوو، کاتێک ئاوڕم دایەوە شەمسە جامێکی بەتاڵی بەدەستەوە بوو بەرانبەرم ڕاوەستابوو، لە عەزرەتی گیانی خۆم و بێ ئـەوەی خۆم ئەوەم

بویت سابوونە ڕەقییەکەی دەستم توند گرتە دەموچاوی، دوای ئەوەی ئەویش زریکەیەکی کرد، پێی وتم، 'خوا بەزیادی خێری نەکا، خۆ پریشکی چڵکاو و پیسییەکەتان بەر ئێمە دەکەوێت!'

بەدەم قسەکردنەوە بەتووڕەییەوە، جامێک ئاوی کوڵاوی تری پڕ کرد و ویستی بەرەو ڕوومان بیپرژێنێت، خێرا پەلاماریم دا و ئاوی جامەکەم ڕژاندە بەر پێمان، ئاوەکە ئەوەندە گەرم بوو هەردووکمانی لێک جیا کردەوە، خەسووم پڕ بە قورگی هاواری کرد، خەجێ، خەجێ، بانگی لە ناتری حەمامەکە دەکرد، لەو کاتەدا من بە تووڕەیی و بێدەنگ لە شەمسەم دەڕوانی، لە ڕاستیدا تاکو ئێستایش وەکو گاڵتەیەک دێتە بەرچاوم، وەکو ئەو گاڵتە و گەپانەی، کە لە سەردەمی تەلەبایەتیماندا پێکەوە دەمان کرد، کاتێک ئاوە گەرمەکەم بەر کەوت و ئاوڕم لێ دایەوە، زانیم شەمسەیە، ویستم پێی بڵێم، ئاخر بێئەقڵ ئەوە کەی سوعبەتە، ئاوەکە زۆر گەرم بوو، کاتێک شەمسە جامە فافۆنەکەی دەستی تێگرتم و پێی وتم، 'هەی جوولەکەی پیس، لەوساوە پریشکی ئاوەکەتان بەر ئێمە دەکەوێت، کێ ئەوە قبووڵ دەکات، ها، ها؟'

ئەوسا تێگەیشتم، حەمامەکە زۆر قەرەباڵغ بوو، بێجگە لەوانەی لە تەنیشتی گونجەکانەوە دانیشتبوون، چەندین ئافرەت و کچ و منداڵی تر بە پێوە وەستابوون، دوای ئەوەی شەمسە ئەمەی وت، بێدەنگییەک حەمامەکەی داگرت، تەنانەت گوێت لە دەنگی ئاو و جامە فافۆنەکانیش نەدەبوو، هەموو لە ئێمەیان دەڕوانی، باشترە بڵێم هەموو لە منیان دەڕوانی، منیش بەشەرمێکەوە چاوم بە هەمووواندا گێڕا، تەمومژی ناو هۆڵی حەمامەکە تاکو دەهات زیاتر بۆ بنمیچەکە هەڵدەکشا و منیش باشتر لە چاوی هەمووانەوە دیار دەبووم، لە خەیاڵی خۆمدا لە گەڕاندا بووم بۆ وەڵامێک، وەکو جاران، کاتێک

دەکەوتمە بەر هێرشی لەو جۆرە، دایم بە دەنگی خۆمەوە دەهاتم و بۆ ئەو کەسانە وەڵامێکی گونجاوم پێ بوو، بەڵام هەستم دەکرد لە کاتی ڕۆیشتنی دایک و باوکمەوە، بە تایبەتی باپیرە خایم، لەم شارەدا بە جۆرێک هەست بە تەنیایی دەکەم، کە وەکو منداڵێک بێدایکوباوک کەوتبێت، ڕۆژانە ئەوەندە هێز لە جەستەمدایە تاکو بتوانم هەناسە بدەم و لەسەر پێکانم بوەستم.

لەو کاتەدا دەستم توند لە یەکتری هەڵدەگلۆفین و پێڵووی چاوم دەلەرزین، نازانم دڵۆپەی تەڕی و شێی ناو حەمامەکە بوو یان فرمێسکەکانم بوون بەخوڕ بەسەر ڕوومەتەکانمدا دەهاتنە خوار و تکانە سەر گۆی مەمکەکانم، لە کاتێکدا شەمسە زۆر لەوە زیاتری وت و بە دەنگی بەرز هاواری بەرەو ڕوومان دەکرد.

ئاگام لێی نەما و گوێکانم کپ بوون، باپیرە خواجە خینۆ و سارای دایەگەورەم بینی، هەرچەندە ئەوان لە سەردەمی مندا نەژیابوون و من دەربارەی ئەوانم تەنها لە حیکایەتەکانی باپیرە خایمەوە بیستبوو، لەناو ئەو خەڵکەدا باڵیان گرتم، 'وەرە ڕۆڵە گیان لە پێشچاوی ئەو عەشامە بەزەلیلی مەوەستە، تاکو دڵت نەبووە بە خوێن و ڕۆحت لە عەزرەتدا لە جەستەت بێزار نەبووە.'

ئەوان ئێمەیان هێنایەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام تۆزێک پێش ئێستا، بە خەسووم وت، 'باش بوو، باپیرە خواجە خینۆ و سارای دایە گەورە فریامان کەوتن.'

خەسووم لە وەڵامدا وتی، 'کوڕە تازە ئەوان سەد ساڵە مردوون چ کارێکیان بەسەر ئێمەوە هەیە، بەخوا خەجێی ناتر نەبووایە شەمسە و دایکی قژیان بەسەرەوە نەدەهێشتین.'

# ٨

دوو هاوڕێی سالار گیراون، دەڵێن یەکێکیان فەلاحە، کە لە تیپی ئاری پێکەوە لەگەڵ سالار یاریی دەکرد، ئەوی تریشیان پێ دەچێت مامۆستا یاسین بێت، یاسین چەند ڕۆژێک لەمەوپێش لە ماڵی ئێمە ڕۆیشت، دوای ئەوەی سێ حەفتە بەنهێنی لەلای ئێمە بوو، شێوازیم لە پێشچاو ون نابێت، قسە خۆشەکانی لە بەر گوێمدا دەزرنگێنەوە، لەم چەند ڕۆژەدا چەندین جار بە دڵ بۆی پاڕامەوە و نزام لای خوای نەوەی ئیسرائیل بۆ کرد، کە ئەو پیاوە تووشی هیچ نارەحەتییەک نەبێت و جارێکی تر بە دیداری شاد ببینەوە، ئەوا چەندین ڕۆژە بێسەروشوێن کراون و کەس هەواڵیان نازانێت، سالار بەتەواوی باری دەروونیی تێک چووە، دوێنێ جەمالی هاوڕێی هەواڵی بۆ سالار ناردبوو، گوایا ناوی ئەوانیش لە دەزگای ئاسایش هەیە و پێویستە خۆیان بشارنەوە یان بە زووترین کات لە شار هەڵبێن، سالار پێی وتم، "سارا، ئەگەر بڕیاری ئەوەم دا هەڵبێم و لە شار دەر بچم، ئەوە بێ تۆ لەم شارە ناڕۆم."

خەسووم وەک من نیگەرانە و بڕیاری داوە لەگەڵماندا بێت، سالار پێی وایە، کە ئەوکات دەربازبوونمان زۆر ئەستەم دەبێت. چونکە سەرجەم ڕێگاکان گیراون و ناتوانین بە ئۆتومبێل دەر بچین، بە پێش بڕۆین تووشی دەردیسەری دەبین، بەهۆی ئەو بەفرە زۆرەی لە دەرەوەی شار باریوە.

ئەمڕۆ چەند جارێک خەسووم لە باوەشی گرتم و تێر بەسەر یەکتریدا گریاین، بە دێژاییی ئەم دوانیوەڕۆیە بێدەنگییەکی ترسناک

کەوتبووە نێوانمان، کاتێک لە یەکتریمان دەڕوانی، تەنها بە فرمێسک وەڵامی یەکتریمان دەدایەوە.

ئەوە ئێستا خەسووم زۆپا زەیتییەکەی داگیرساند وماڵەکە تۆزێک گەرم داهاتووە، شۆربای نیسکێنی لێ نابوو، هەرسێکمان بێدەنگ لەسەر سفرەی نانخواردنەکە دانیشتین، بێجگە لە دەنگی بەریەککەوتنی قاپ و کەوچکەکان، هیچی ترت نەدەبیست، دیار بوو سالار هەواڵێکی بیستبوو، بەڵام هیچکام لە من و خەسووم نەمان دەوێرا پرسیاری ئەوەی لێ بکەین، ئیتر من دڵنیا بووم لەوەی، کە ئەو دوو هاوڕێیەی سالار لە ژیاندا نەماون، چونکە ئەبەد سالار بەو جۆرە پرسەی ماتەمینیی بۆ هاوڕێ شۆڕشگێڕەکانی نەدەگرت.

## ٩

بەردەوام بیر لەوە دەکەمەوە، ئاخۆ ئەو جوولەکانەی لە کوردستان یان عێراق وەکو ئێمە ماونەتەوە و نەڕۆیشتوون، کێ بن و ئاخۆ چۆن ژیانیان دەگوزەرێنن، لە کاتێکدا کنێسەتەکان تێک دراون یان کراون بە مزگەوت، قەبرسانی جووەکان ئاسەواریان نەماوە و تەنانەت ناو و ناونیشان و مێژوویشمان لە کتێبەکاندا سڕاونەتەوە.

هاوڕێکانی سالار، دەرکردنی جووەکان بە پیلان و دوژمنکاری دەزانن، دەڵێن تاوانێکە و بەرانبەر بە گەلی کورد کراوە، نازانم من ئەو قسانەی ئەوان هیچ سوکناییەک بە دڵم ناگەیەنێت، بەڵکو زیاتر برینەکانم قووڵتر و نوێ دەکەنەوە، لە کاتێکدا گوێم لەوان دەبێت هاوخەمیی خۆیان بەرانبەرمان دەر دەبڕن، بەتایبەتی کاتێک گوێم لێیان دەبێت، "ئێمەی کورد هەردەم هاوخەمی ئێوەی جوولەکەین!"

باوکم ڕاستی دەکرد، "ئەم موسوڵمانانە وا دەزانن کوردبوون بەرگێکە و تەنها بە بالای ئەواندا بڕاوە."

لەو دانیشتنانەدا زوو بێزار دەبم و هەموو گیانم دەکەوێتە سەر ئارەقە و پڕ دەبم لە بێزاری و تووڕەبوون، جاری وا هەیە دەمەوێت بەسەریاندا هاوار بکەم، بەڵام لەبەر خاتری سالار دان بە خۆمدا دەگرم و لەتاواندا فەقیانەی کراسەکەم لەناو دەمم دەنێم و بە قەهرەوە دەست دەکەم بە جوینی.

پاشان خەیاڵم دەڕوات بۆ ئەو ڕۆژانەی منداڵ بووم و لەگەڵ دایکم پێکەوە لە گەڕەکی سەرشەقامەوە بۆ گەڕەکی جوولەکان دەگەڕاینەوە، لەبیرم دێت، هەموو جارێک لەلایەن منداڵانی ئەو

گەڕەکەوە بەردباران دەکراین، بۆ پاراستنی من لە بەردەکان، دایکم لە باوەشی دەگرتم و دەینام بە سنگیەوە، لەبیرم نایەت من بەردێکم بەر کەوتبێت، ئەوسا دایکم لە منی دەشاردەوە و پێی نەدەوتم لە چەند لاوە سەری شکابوو یان جێگای بەردەکان کوێیان شین و مۆر کردبووەوە، بەڵام کاتێک دەگەیشتنە ماڵەوە، دادەنیشت و بێدەنگ و کز لەبەرخۆیەوە دەگریا و نزای لێ دەکردن.

دوای ئەو ڕووداوانـە، لە دایکمم دەپرسی، 'دایکە، بۆچی ئەو منداڵانە دوای ئێمە دەکەون و بەردبارانمان دەکەن؟'

ئەو لە وەڵامدا دەیوت، "ئەوانە منداڵی هـەرچی و پەرچین و هەر ڕێبوارێک لەوێوە بڕوات یەخەی پێ دەگرن و بەردبارانی دەکەن."

## ١٠

ڕۆژانە لەگەڵ کەتانی خەسوومدا، بێدەنگ، بێ ئەوەی یەکتری بدوێنین، بەلای یەکتریدا دێین و دەچین، ئەو بێجگە لەوەی ڕۆژی چەند جارێک لەژێر لێوەوە بانگی مێردەکەی، یەعقووب، دەکات و لەبەرخۆیەوە دەیدوێنێت و باسی ئێستای سالاری کوڕیانی بۆ دەگێڕێتەوە. دوای ئەوە تاوێک بێدەنگی دای دەگرێت، لەناکاو دەداتە پرمەی گریان، دوای ئەوەی تەواو ماندوو دەبێت، دەست دەکات بە نزاکردن و خۆلاواندنەوە.

لە دەمەو ئێوارەیشدا بەبێ ئەوەی لێم بڕوانێت لێم دەپرسێت، 'ئەرێ سالار بۆ نەهاتەوە.'

بەو جۆرە ڕۆژەکـان بەسەر دەبەین، من لە خەیاڵی خۆمدا نوقم دەبـم و ئەویش لـە نـاوەڕاسـتی ژوورەکـــەدا دادەنیشێت، ڕۆژانـە چەند تاڵەموویەک لەژێر چەناکەی و سەر ڕومەتی دەر دەهێنێت، بێ ئەوەی لە ئاوێنەکەدا لە خۆی بڕوانێت، بە هەستی سەری پەنجەکانی بەسەر پێستی دەموچاویدا دەگەڕێت، مووەکان بەڕقەوە بە مووکێشەکە دەگرێت، بەڵام چۆن گرتنێک، هەر زۆر توند دەیانگرێت، وەکو ملی دوژمنێکی گرتبێت، هێز دەداتە بەر خۆی و بەحەژمەتێک لە ڕەگەوە دەریان دەهێنێت، بە هێزێک کە هەموو ماسوولکەکانی لەشی گرژ دەبن.

## ١١

پابەندنەبوونی سالار بە کولتوور و باوەڕی جوولەکەوە، تەواو بێزارم دەکات، بەڵام بە هیچ جۆرێک ناتوانم لێی دوودڵ بم یان تەنها بۆ ساتێکیش چییە دەنگی لێ داببڕم، یان بە دەممدا بێت ئەوەی پێ بڵێم، کە لە دڵمدایە، بڕیارم داوە ئازار و ناسۆرەکانم تەنها بۆ خۆم هەڵبگرم و تاوەکو بتوانم بەشی ئەوی لێ نەدەم. هەرچەندە هەموو ڕۆژێک خۆم بۆ ئەوە ئامادە دەکەم و دەمەوێت لەو بارەوە لەگەڵیدا بدوێم، بەڵام کاتێک دەیبینم و گوێم لە دەنگی دەبێت، هەموویم لەبیر دەچێتەوە، چونکە ئەو ئێستا زۆر دڵی بە هەوڵەکانی خۆی خۆشە و بە جۆرێک هەست بە بەختەوەری دەکات، کە باوەڕ ناکەم جارێکی تر ئەو لەژێر سێبەر و لەناو کولتوور و ئایینی باووباپیرانیدا ئەوەی دەست بکەوێت و هەستی پێ بکات، کاتێک دەیبینم لەو بارەوە دەدوێت، تەواو هەستی پێ دەکەم، کە ئەو وەک مەلێکە و ڕۆژانە بەبێ ئەوەی زۆردار و داگیرکەرەکان ببینێت بە سەربەستی بەسەر شاردا دەفڕێت. ئەو ئێستا ئیماندار نییە و تەنها خەمی خۆی بێت تاکو لەدوای مردن بە ژیانێکی ئەبەدی پاداشت بدرێتەوە، نەخێر، وەکو خۆی دەڵێت، ئەو هەڵگری خەمی میللەتێکی زوڵملێکراوە، دڵخۆشم زۆر دڵخۆشم، کە ئەو ئێستا ئەوەندە هەست بە ئاسوودەیی دەکات، هەر لەبەر ئەوەشە نامەوێت بۆ هیچ شتێک، بێگومان نە بۆ دین و نە بۆ کولتووری خۆشمان، نامەوێت تەنها بۆ ساتێکیش چییە لێی بشێوێنم، چونکە دەزانم ئەو چەند بە باوەڕەوە خەریکە، ئیتر من وای دەبینم، کە سالار لەناو ڕۆحی خۆیدا نیشتمان و باوەڕێکی نوێی بۆ خۆی خولقاندبێت.

## ١٢

پەیوەندییەکان سنووردارن و لە دیواری حەوشەی ماڵەکەمان تێناپەڕن، بەردەوام لە هەمووان دەڕوانم و لە پەیوەندیی نوێ دەگەڕێم، سەرەتای هەموو دۆستایەتی و هاوڕێیەتییەکم لە منەوە دەست پێ دەکات، لە یەکەم دیدار و پاشان تاوەکو دەگاتە ئەوەی ناوێرم ڕاستیی ئەوەیان پێ بڵێم، بەلام باپیرە خایم ئاوای فێر کردووم، کە شەجەرەی خۆم لەبیر نەکەم و هەردەم جێگای شانازیم بێت، ئیتر خەڵکی چۆن بیر دەکەنەوە کەیفی خۆیانە و کێشەی من نییە، هەموو ئەوانەی لە تەمەنمدا ناسیومن، کاتێک هاتۆتە سەر ئەوەی وتوومە من جوولەکەم، خێرا ڕەنگی شێواز و تامی دەمیان گۆڕاوە، وەکو بڵێی ئێمەی جوو لە هەسارەیەکی ترەوە هاتبین، بەردەوام ویستوومە ئەوەیان پێ بڵێم، کە باوەڕەکەی من و تۆ هەڵهێنجراوی هەمان بیرن، پەیامبەرەکەی ئێوە دەڵێت، 'جامەکە نیوە پڕە، ئەوی ئێمە پێی وایە، هەمان جام نیوەی بەتاڵە!'

ئیتر نازانم بڵێم ڕاستی لای کامیانە، ئاوا و بەو جۆرە، ئەو بەزم و بالۆرەیە هەزار ساڵە بەردەوامە و ئێمەی مرۆڤ ناتوانین لێی قوتار بین، ئەوەتا ببینە چۆن ئەم نەتەوەیەی لێک دابڕیوە.

خۆزگە لە کونێکەوە چاوم لە هاورێکانی سەردەمی منداڵیم دەبوو، ناتوانم لە یادمیان دەر بکەم و لە چ تەمەنێکدا بووبێتم و لە هەر جێگایەک ژیابم، کورد واتەنی دڵم بەردەوام لایان بووە، هەردەم بەدوای ئەدرەسی ئەواندا گەڕاوم و ویستوومە بزانم لەکوێ دەژین، بەبێ ئەوەی تەنها بۆ جارێکیش چییە نامەیەکیان بۆ بنێرم، بەبیرم نایەت لەوانیشەوە نامەم پێ گەیشتبێت، دیارە تەنها بوونیان لە ژیانی مندا بۆخۆی لە دوورەوە ئاسوودەییم پێ دەبەخشێت، یان واتایەکی تایبەتی هەیە، سەردەمی منداڵیم لە گەڕەک و قوتابخانە زۆر کەسم ناسی، بەڵام چەند کەسێک لە منداڵیمەوە تاوەکو ئێستام بەردەوام دڵم لایان بووە و پەیوەندیم لەگەڵیاندا نەپچڕاوە، دەتوانم بڵێم ئەوان بەردەوام هەوێنی ژیان و پاڵەوانی ناو چیرۆکەکانم بوون.

یەکێک لەو هاورێیانەم مامۆستا ڕەسوڵ بوو، ڕەسوڵی خولە پیران ناوی سیانیی ئەو هاورێیەمە، کە بەس من دەمزانی ئەو پیاوە خوێنەواری نییە و بە تەمەنی ڕۆژێک نەچووبووە قوتابخانە، بەڵام خەڵکی وایان دەزانی مامۆستایە.

هەروەها جەمال عەلی و سامی فەرەج هاورێم بوون، ئەو هاورێیانەم ڕۆژانە و لە دوورەوە هێز دەدەنە بەر ئەژنۆکانم، دوای مردنی سارا، هاورێیەتیی ئەوان و بوونی ئەو پیاوانە منیان لە ژیاندا هێشتەوە، ئیتر بەردەوام ئاوا بیرم دەکردەوە، کە ئەو هاورێیانەم

هەرچەندە لێم دوور بن، جۆرێک لە مافیان بەسەر منەوە هەیە، یان لەوانەیە بوونی منیش بۆ ئەوان بە هەمان شێوە مانایەکی تایبەتی خۆی هەبێت، بەبیرم دێت مامۆستا ڕەسول زوو زوو پێی دەوتم، 'سالار، ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان فت بوویت، ئەوا گیسکێکی گەڕت بۆ دەکەم بە خێر و برادەران دەعوەت دەکەم، ئەوسا بتڵێک عارەقی لێ دەکڕین و لەسەر گۆڕەکەت دەست دەکەین بە گۆشتبرژاندن و عارەقخواردنەوە.'

دوای مردنی من، هەردەم ئەو ڕۆژ و دانیشتنەم بە هاوڕێکانم بە ڕەوا دەبینی، بەڵام دەترسام ئەوەی مامۆستا ڕەسول دەیڵێت لە ڕاستیدا وا نەبێت و مردنی من بۆ ئەوان ئازاربەخش بێت، لەبەر ئەوە خەیاڵی خۆکوشتن و ڕۆیشتنم بەدوای سارادا دوا خست، ئیتر با بوونی ئارۆنی کوڕم و خەمی دابڕانم لە نیشتمان لەولاوە بۆستێت.

## ١

مشكییەكی كۆنی ڕەنگ بۆری شێواوی بە سەریەوە ئاڵاندبوو، ڕیشاڵەكانی بەملاولای شانەكانیدا شۆڕ بووبوونەوە، پاڵتۆیەكی ڕەساسیی لەبەردا بوو، لەسەر گیرفانی لای ڕاستی پاڵتۆكەی بە ڕەنگی سوور شێوازی پۆرترێتێک دیار بوو، یان ڕاستترە بڵێم هێڵكارییەكی شێواوی ڕەنگ سوور دیار بوو، كە لە دووریی دوو مەترێک بەولاوە نەدەبینرا ئایا ئەو ڕەنگە سوورە چی دەگەیەنێت؟ ئاخۆ ماركەی پاڵتۆكەیە یان دەبێت چ فیگورێک بێت، لە ژێریدا بە خەتێكی كاڵەوەبووی ڕەش بە پیتی لاتینی نووسرابوو، *ئارام*.

بەری چاوی ڕاستی بە ئەندازەی هەڵماتێک ئاوساو و سوور هەڵگەڕابوو، كە لێت دەڕوانی، لە پێش سەرجەم ئەندامەكانی تری دەموچاویدا ئەو بڵقە سوورەت دەهاتە پێشچاو، چاوی چەپیشی بەردەوام زەرداوی لێ دەچۆڕا و زوو زوو بە سەرقۆڵی پاڵتۆكەی وشكی دەكردەوە.

دوای ئەوەی مامۆستا ڕەسوڵی هاوڕێی، سالاری لەو جێگایە جێ هێشت، دوو كاتژمێر زیاتر دەبوو لەو تاریكییەدا وەستابوو، بەرەو ئەو جێگایەی دەڕوانی كە مامۆستا ڕەسوڵی لە چاو ون بووبوو، لە خەیاڵیدا ئەو پرسیارەی لە خۆی دەكرد، 'تۆ بڵێی جارێكی تر ئەو هاوڕێیەم ببینمەوە؟'

پاشان كوڕەكەی لە باوەش گرت و توند نووساندی بە خۆیەوە، لە دێی زەڵێوە تاوەكو گەیشتبووە سەر سنوور، ڕێگایەكی دووری

بڕیبوو، هەستی بە ئازاری پێیەکانی دەکرد، لەو تاریکییەدا لەسەر تاشەبەردێک دانیشت و زوو زوو ڕووناکیی لایتەکەی لە دەموچاوی ئارۆن دەدا، کە چەند ڕۆژێک بوو تایەکی گەرمی لێ هاتبوو، دوای ئەوەی ماچێکی سەر ڕوومەتە سارد و زەردهەڵگەڕاوەکەی کرد، پاشان دەستی دەکرد بە گیرفانیدا و چنگێک مێوژی دەرهێنا، دەنک دەنک دەیخستە دەمی کوڕەکەی، ئارۆن لەپەسا هێڵنجی دەدا و دوای ئەوەی مێوژەکەی دەجوی، تفی دەکردەوە، بەردەوام دەکۆکی و پاشان سەری خستەوە سەر باڵی باوکی، سالار کۆڵی نەدا و دەستی کرد بە گیرفانێکی تریدا و کاکڵەگوێزی بۆ دەرهێنا، داوای لێ دەکرد چەند دەنکێکیان لێ بخوات، ئارۆن بەئەستەم دەنگی دەر دەهات و بەبێ ئەوەی بتوانێت سەری لەسەر باڵی باوکی بەرز بکاتەوە شانەکانی هەڵدەتەکاند.

سالار ئەو شەوە لەسەر سنوور چاوەڕوانی عەلی قوتبیی دەکرد، دوو ڕۆژ پێش ئەو شەوە کاتێک یەکتریان بینی، عەلی قوتبی بەڵێنی ئەوەی بە سالار دابوو، کە ڕێبەری بۆ بکات و لەگەڵ ئارۆندا بۆ شاری تارانیان بەرێت.

کاتژمێر دەی شەو، عەلی قوتبی لەگەڵ گەنجێکی باریکەلەی ڕەشپۆشدا گەیشتنە لای سالار، پێش ئەوەی چۆنی و چاکی لەگەڵ سالار بکات، لەڕێوە بە سالاری وت، 'ئەم پیاوە ڕێبەریت دەکات و بۆ تارانت دەبات.'

عەلی قوتبی چەند هەناسەیەک لای سالار مایەوە، دوو جار لەبەرخۆیەوە و بەبێ ئەوەی لە سالار بڕوانێت وتی، 'ئەم کوڕە نموونەی ڕۆڵەی کوردە و جێگای باوەڕە!'

پاشان لە تاریکیی ئەو شـەوەدا چۆن لەپڕ پەیدا بوو، ئاواش خۆی لە سالار ون کرد.

سالار بە ترس و نابەدڵییەوە بەناو ئەو کێو و دارستانەدا دوای گەنجە نەناسەکە کەوت، مامۆستا ڕەسوڵی هاوڕێی بە سالاری وتبوو، 'عەلی قوتبی باوەڕپێکراوی خۆیانە و جێگای متمانەیە!'

بەڵام ئەو شەوە عەلی قوتبی ئەوەندی پەلە بوو، تەنانەت ڕێبەرەکەی بە سالاریش نەناساند، دوای ئەوەی لە ڕێگا سالار لەگەڵ گەنجەکەدا دەستی کرد بە لێدوان، ڕێبەرەکەی بە سالاری وت، 'قوربان، بەندەت تایەر عەزیز و خەڵکی شاری بانەم.'

تایەر عەزیز بە سالاری وت، 'بەڕاستی من خاڵە ڕەسوڵ تەکلیفی لێ کردم، تاوەکو بتگەیەنمە شاری تاران و لەوێ بتبەمە ئوتێلێک.'

سالار دەستی خستە سەر شانی تایەر عەزیز و لێی چووە پێشەوە و لێی پرسی، 'بۆ تۆ خوشکەزای مامۆستا ڕەسوڵیت؟'

'ئەرێ وەڵا ئەو زاتە خاڵۆمە.'

ئەو شەوە، دوای پێنج کاتژمێر بە پێ ڕۆشتن، گەیشتنە دێیەک، دێیەکە تەنها چوار چرای تێدا دەگڕا، بەبێ ئەوەی پشوو بدەن، یان بچنە هیچکام لە ماڵەکان، لە بەردەم ئاواییەکەدا سواری پیکاپێک بوون و بەرەو شاری بانە بەڕێ کەوتن، پێش ئەوەی بچنە ناو شار، گەیشتنە بازگەیەک، کاتێک پیکابەکە وەستا، دوو پاسدار لەلای ڕاست و چەپیانەوە رووی تفەنگەکانیان تێکردن، پاشان لەژێر ڕووناکیی گلۆپێکدا دایان گرتن، پیکابەکەیان پشکنی و پاشان یەکێک لە پاسدارەکان لە سالار هاتە پێشەوە و لە بەتانییە پێچراوەکەی باوەشی ڕوانی، ئەو بەتانییەی سالار لە ئارۆنیەوە ئاڵاندبوو، بە فارسی پێی وت، 'تۆ چکارەیت'

سالار لە تایەر عەزیزی ڕوانی و هیچی نەوت، پاسدارەکە دەستی دایە قۆڵی سالار و لەگەڵ خۆیدا بۆ لای پاسدارەکەی تری برد، گەنجێکی کورتەباڵای چاوزەق بە جلی کوردییەوە پەیدا بوو،

لەبەرخۆیەوە بانگی لە پاسدارەکە کرد، 'عێراقییە؟'

تایەر عەزیز و شۆفێری پیکابەکە بە فارسی کەوتنە پاڕانەوە و ڕێگایان لە پاسدارەکە گرت، پاسدارەکەیش زوو زوو لوولەی تفەنگەکەی تێ دەکردن و بەتووڕەیییەوە داوای لێ دەکردن ڕێگاکەی بۆ چۆڵ بکەن، کابرای کورد هات و سالاری لە دەست پاسدارەکە وەر گرت و بردی لە بن دیواری بازگەکەدا ڕای گرت، لە سالار هاتە پێشەوە و بە چپە پێی وت، 'هیچ خەم مەخۆ و برای خۆت دەبێتە فریادڕەست!'

سالار لە دوورەوە لەو دیمەنانەی دەڕوانی، کە پاسدارەکان زوو زوو میلیان دەهێنایەوە و لوولەی تفەنگەکانیان لە تایەر عەزیز و شوفێرەکە دەکرد، کابرای کورد چەند جارێک دەکەوتە نێوانیان و پاسدارەکانی لێ دوور دەخستنەوە، پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای تایەر عەزیز و شوفێرەکە و قسەی لەگەڵدا دەکردن، کابرای کورد هات بۆ لای سالار و لێی پرسی، 'پووڵت هەس؟'

سالار وەڵامی کابرای نەدایەوە و بێدەنگ لە دوورەوە لە تایەر عەزیزی ڕوانی، کابرای کوردە بەبێ وەڵام بۆ لای پاسدارەکە گەڕایەوە، دوای ئەوەی بە گوێیدا چپاندی، پاسدارەکە بەرەو لای سالار هات و لوولەی تفەنگەکەی خستە سەر سەری، ئەویش سەری داخست و چاوی لە دەموچاوی ئارۆن بڕی، کە لەو کاتەدا لە دووتوێی بەتانییەکەوە لێوەی دیار بوو، لە خەیاڵی خۆیدا وتی، 'سارا، بە ڕۆحی پاکت فریامان بکەوە!'

پاشان توند کوڕەکەی نووساند بە خۆیەوە و پڕ بە سنگی بۆنی پێوە کرد، سەری هەڵبڕی و لە چاوی پاسدارەکەی ڕوانی، پاسدارەکە دەستی داگرت و بێدەنگ تفەنگەکەی کردەوە شانی و بانگی لە کابرای کوردە کرد، دوای ئەوەی پاسدارەکە بە زمانی

فارسی تاوێک لەگەڵ شوفێرەکەدا دوا، شوفێرەکە هات و لەگەڵ سالار چوون لەناو پیکابەکەدا دانیشتن، بەدوای ئەواندا تایەر عەزیز هات و کەوتنە ڕێ، تایەر عەزیز لەبەرخۆیەوە وتی، 'خۆفرۆش!'

گەیشتینە ناو شاری بانە و لە کۆڵانێک، لە بەردەمی ماڵێکدا پیکابەکە وەستا و دابەزین، تایەر عەزیز بە سالاری وت، 'کاکە سالار، ئێرە گەڕەکی سەرایە و ئەمە ماڵی خۆمانە.'

## ٢

دوانیوەڕۆی ڕۆژی چوارشەممەی مانگی یەک، سالار و ئارۆن گەیشتنە شاری تاران، لە میوانخانەی پەروین لە جادەی لالەزار دابەزین، کاتێک تایەر عەزیز ماڵئاوایی کرد و ویستی بڕوات، سالار لەبەر پشتێنەکەیدا پارچەیەک پەڕۆی دەر هێنا و ویستی پارە بە ڕێبەرەکەی بدات، تایەر عەزیز بە سالاری وت، 'نەخێر، نەخێر کاک سالار خوایشت دەکەم، حەتمەن من ئەو کارەم بۆ پووڵ نەکردووە، ئیتر با بۆ خاڵە ڕەسوڵ و عەلی قوتبی بێت، من خاتری ئەوانم زۆر لایە، بەخوا چاکە و پیاوەتیی ئەوانم زۆر زۆر بەسەرەوەیە.'

تایەر عەزیز سالاری لە ژوورێکی دوو نەفەریی ئوتێلەکەدا جێ هێشت، ئەوەشی بە سالار وت، کە خاوەنی ئوتێلەکە خانمێکی کوردە و دەتوانیت متمانەی پێ بکەیت.

لاواز و ڕەنگزەرد بەرامبەری یەکترین دانیشتبوون، پاشان ئارۆن چوو خۆی دا بەسەر ڕەفەی پەنجەرەکەدا و لە دەرەوەی دەڕوانی، پەنجەرەی ژوورەکەیان کەوتبوو بەسەر جادەیەکی جەنجاڵدا و بەردەوام سەیارەی پێدا تێپەڕ دەبوو، سالار لەسەر جێگاکە لەسەر پشت پاڵ کەوتبوو و لە بنمیچەکەی دەڕوانی، هەردووکیان ماندووی ڕێگا بوون و تایەکی گەرمیان لێ هاتبوو.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە، سالار چوو بۆ لای خاوەنی ئوتێلەکە، کە ئافرەتێکی بەساڵاچووی خەڵکی شاری سنە بوو، بیست ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە هاتبوونە تاران و ئەو ئوتێلەیان کڕیبوو، ژنەکە بە سالاری

وت، کە مێردەکەی چوار ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە بە نەخۆشییەکی کوتوپڕ مردووە، کاتێک سالار پێی وت، پێوستیان بە یارمەتییە و خۆی و کوڕەکەی نەخۆشن و زۆریان برسییە، پاشان ئافرەتەکە بە تەلا سوڵتانی خۆی بە سالار ناساند و دەستی خستە سەر شانی سالار و پێی وت، 'ئاغا گیان بەچاوان، تۆ بچۆ، دەی بچۆ، وا من برنج و شێوتان بۆ ساز دەکەم.'

سالار لەگەڵ ئارۆن لە بەزدەمی پەنجەرەکەدا وەستابوون و لە دەرەوەیان دەڕوانی و چاوەڕوان بوون، ئارۆن لە سالاری پرسی، 'باوکە ئێرە شاری سەیارەیە؟'

سالار ویستی وەلامی بداتەوە و باسی شاری تارانی بۆ بکات، پاشان ڕاچلەکی و بەسەرنجەوە لیی ڕوانی، ئارۆنی لە ئامێز گرتوو بەسەریدا نووشتایەوە، تاوێک بێدەنگ لە ڕوخساری کوڕەکەی ڕوانی و هەوڵی دا وەلامی بداتەوە، خۆی پێ ڕانەگیرا و بەدەم قسەکردنەوە فرمێسک بە چاویدا هاتنە خوار. سالار بەو قسەیەی ئارۆن سەرسام بوو، چونکە ئارۆن لەدوای مردنی سارای دایکییەوە، هیچ قسەی نەکردبوو، بێدەنگ لە ئارۆنی کوڕی دەڕوانی و پاشان ماسوولکەکانی دەموچاوی گرژ کردن، لە کاتێکدا ڕوخساری سارای لە رووی ئارۆندا دەبینی، شانی هەڵدەبرین و بە دەستی ڕاستی توند لەسەر جلەکانیەوە سەردڵی گوشی، لەتاو ئازار تاوێک چاوی نووقاند و پڕ بە سییەکانی هەناسەکی قووڵی هەڵمژی.

ئاسەواری بەفرێکی بۆری چڵکن هێشتا لەسەر سەکۆی جادەکە بوو، ژوورەکەیان تا سفر و خوار سفری پلەی سەدی ساردبوو، هەردووکیان تایەکی ئەوەندە گەرمیان لێ هاتبوو، هەموو ئازای لەشیان لە ئارەقەدا خوسابوو، بەردەوام دەکۆکین و بەنۆرە چڵم و تەڕیی لووتیان هەڵ دەلووشی، کاتێک لە دەرگا درا، پێش ئەوەی

سالار بگاته بەردەمی دەرگاکە و بیکاتەوە، تەلا سولتانی بە پالێک دەرگاکەی کردەوە و بە سینییەکەوە هاتە بەردەمی سالار و وەستا و وتی، 'ئاغای سالار، بفەرموو، لەتەک بەچەکەت تێر بخۆن و وەلێ دوایی ئەگەر ڕوخسەتم پێ بیەیت دەکەومە وێزەتان و خاس دەتان شێلم.'

سینییەکەی دەستی دوو قاپی فافۆنی برنج و قاپێکی باغەی قوولی لەسەر بوو، لەسەر مێزی ناوەڕاستی بەینی هەردوو جێگاکەدا دای نا، 'دەی بفەرموون.'

ئارۆن بە چاوی پڕ لە ڕیپۆق و تەڕەوە لە تەلا سولتانیی ڕوانی و ناوبەناو بەسەر باڵی بلووزە خورییەکەی بەری چلمی لووتی دەسڕی، ئەو بلووزەی نەنە کەتان بۆی چنیبوو، سالار بە شەرمێکەوە سوپاسی تەلا سولتانیی کرد، تەلا سولتانی ڕۆیشت و ئەوانیش دەستیان بە نانخواردن کرد، پاش چەند هەناسەیەک بە عەلادینێکی سەوزەوە گەڕایەوە، هێنای لە نێزیکیان دای نا و بێ ئەوەی هیچ بڵێت لە پشتی ئارۆنەوە لەسەر قەراغی جێگاکەی دانیشت و بێدەنگ لە سالاری دەڕوانی، سالار هەوڵی لەگەڵ ئارۆن دەدا تاوەکو نانی دەرخوارد بدات، بە ئاوی تەماتەکە برنجەکەی بۆ خوساندبوو، وەکو ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بدوێت، 'ئەوە چەند ڕۆژێکە هیچی نەخواردووە، ئیشتیهای نییە، ئیتر هەرچی بە زۆر نەبێت!'

تەلا بێ ئەوەی وەلامی سالار بداتەوە، لە ئارۆنی ڕوانی و سەرێکی بۆ لەقاند.

دەمەو ئێوارەی هەمان ڕۆژ، تەلا سولتانی هات و داوای لە سالار کرد لەگەڵ ئارۆنی کوڕی بچێت بۆ یەکێک لەو دوو حەمامەی لە قاتی خوارەوەی ئوتێلەکە بوون، ئوتێلەکەی تەلا سێ نهۆم و لە بیست ژوور پێک هاتبوو، ئەودەم بێجگە لە سالار و ئارۆن

دوو پاکستانییش لە قاتی سێهەم ژوورێکیان لێ گرتبوو، وەکو تر بەهۆی نائارامی و گۆڕینی دەسـەڵات لە ئێران میوانخانەکان کەم کەس ڕووی تێ دەکردن، هەروەها ئوتێلەکەی تەڵا سوڵتانی دەر و ژووری بێخزمەتگوزاریی پێوە دیار بوو، سالار و ئارۆن خۆیان شـۆرد و ژوورەکەیـان گـەرم داهاتبوو، شەو درەنگانێک تەڵا سوڵتانی سـالار و ئارۆنی لەسەر جێگاکانیان پاڵ خست و هەموو ئازای گیانیانی بە ڕۆنی زەیتوون شێلا، پاشان دوو بەتانیی زیادەی بۆ هێنان و گەرم دایپۆشین، تاوێک بەدیار ئارۆنەوە بێدەنگ کزەڵەی کرد و بەخوڕ فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتنە خوار، سالار بەبەزەییەوە لێی دەڕوانی و چەند جارێک ویستی پرسیاری لێ بکات، بەڵام جەنجاڵیی ناو خەیاڵەکانی خۆی بواری ئەوەیان پێ نەدا تەڵا بدوێنێت، دوای ئەو ڕۆژە تەڵا بە سالاری وت، کە تاقە کوڕێکی هەبووە و بووە بە چەکداری پارتی کۆمەڵە و ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە بە دەستی چەکدارەکانی پارتی دیموکرات کوژراوە، تەنانەت دەزانێت بکوژەکانی کێن و خەڵکی کوێن، وەکو تەڵا باسی لێوە دەکرد، گوایا هەمووی شەش مانگێک بووە لە تارانەوە گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و لە پاوە لە تەمەنی بیستوشەش ساڵیدا کوژراوە، تەڵا دەیوت کوڕەکەم بێچەک بووە و لە جانتایەکی پڕ لە دەرزی و دەرمان و کەرەستەی برینپێچی زیاتر، هیچی تری پێ نەبووە، دوای ئەوەی دانشگای پزیشکیی لە تاران تەواو کرد، ئیتر ئەوە پاشەڕۆژی بوو، تەڵا بەدەم گریان و هەنسکهەڵکێشانەوە دەیوت، کە مێردەکەی زۆر بەختدار بووە، کە مەرگی کوڕە تاقانەکەی بە چاوی خۆی نەبینی و پێشوەخت کۆچی دوایی کردووە. تەڵا بەدەم گریانەوە، 'ئیتر بۆ من ئەم ئوتێلە بووە بە نیشتیمان، ئیتر ئاغا گیان، بۆ من کوردستان بەبێ ئەو کوڕە جوانخاسەم چ قیمەتێکی هەس!'

دوای دوو ڕۆژ مانەوەیان لە ئوتێلی پەروین، سالار داوای لە تەلا سولتانیی کرد، ناونیشانی دوو دۆستی بۆ بدۆزێتەوە، کە سالار پێی وا بوو لە شاری تاران دەژیان، بە ناوی خەسرەو و فەرهادی میرزاییی بازرگان، کە دوکانیان لە بازاڕی جیهان هەیە.

تەلا لە وەلامدا بە سالاری وتبوو، 'ناسیاون.'

ئەو ڕۆژە کزەبایەکی سارد کلووی بەفری بە کووچە و جادەکانی تاراندا پێچ دەدا و درەختی سەر شەقامەکانی هێنابووە هەلەکەسەما، تەلا پێش سالار کەوت و هەر لەسەر هەمان جادە و سەد مەترێک لە ئوتێلەکەی تەلا سولتانی دوور کەوتنەوە، کاتێک گەیشتنە بەردەمی بازاڕی جیهان، سالار بەردەوام ئەوەی لە خەیالدا بوو، کە خەسرەو کاتی خۆی بە سالاری وتبوو لە بازاڕی جیهان بە هەر دوکاندارێک بلێیت کۆگای میرزایی یەکسەر بۆ لای ئێمەت دەهێنن.

لە بەردەمی قەیسەریی جیهاندا تەلا سولتانی گەڕایەوە و سالار لەوێدا لە یەکەم دوکانداری پرسی، دوکاندارەکە جل و کەلوپەلی مندالانی بە بنمیچی سەربانی قەیسەرییەکەدا هەلواسیبوو، وەکو دەیان مندالی تەمەن یەک تاکو دە سال بە دیواری قەیسەرییەکەدا هەلزنابن، کابرای دوکاندار، گەنجێکی باریکەلەی ڕێکپۆشی سەروریشهاتوو بوو، تەمەنی نزیکی بیست سالێک دەبوو، بەبێ ئەوەی هیچ وەلامێکی سالار بداتەوە، خێرا دوکانەکەی خۆی جێ هێشت و پێش سالار کەوت، چوار دوکانێکی بڕی و خۆی کرد بە دوکانێکی گەورەی شووشەبەندی ڕووناکدا، کاتێک سالار و ئارۆن چوونە نێو دوکانەکە، ڕەنگ و ڕووناکیی ناو دوکانەکە سەرنجی ڕاکێشان و بێدەنگ بە چواردەوری خۆیاندا دەیان ڕوانی، ڕووناکیی گلۆپەکان لە ڕەنگە تۆخ و گەرمەکاندا دووبارە

دەبوونەوە، ئارۆن دەستی سالاری توند گرتبوو، بێ ئەوەی لە کەس بڕوانن یان لە خەیاڵیاندا بێت بۆچی هاتوونەتە ئەو جێگایە، سەرسام تاوێک بەدەوری خۆیاندا خولانەوە، دوکانێکی گەورە بوو، بە چواردەوریدا بە قوماشی ڕەنگاوڕەنگ داپۆشرابوو، لەو کاتەدا کەسێک سالاری لەو سەرنجدان و خەیاڵەی دابڕی و فەرمووی لێ کرد، سالار سەرنجی لە کابرا دا و بە دەنگێکی تێکشکاو و قوڕگی پڕ لە گریانەوە، 'کاکە خەسرەو!'

کابرایەکی سەروڕیشسپیی باڵابەرز بوو، چاکەت و پانتۆڵێک و کراسێکی سپیی لەبەردا بوو، کاتێک سالار باوەشی کرد بە ملیدا، ئەو سەرسام لە جێگای خۆی وشک وەستابوو، دیار بوو ئەو سالاری نەدەناسییەوە، سالار هێشتا قۆڵی لە ملی کابراوە ئاڵاندبوون و توند خۆی پێوە نوساندبوو، بەدەم گریانەوە وتی، 'من سالاری کوڕی یەعقووبم، خوشکەزای خایم شولومۆم.'

خەسرەو میرزا، کاتێک ئەمەی لە سالار بیست، هەردوو قۆڵی لە ملی سالارەوە ئاڵاند و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، تاوێک بێدەنگ یەکتریان توند بەخۆوە گوشی، ئارۆن سەرسام بە باوکی و خەسرەودا هەڵی دەڕوانی، کاتێک خەسرەو قۆڵی لە ملی سالار کردوە، دەستێکی خستە سەر شانی سالار و ئاماژەی بەرەو ڕووی کوڕە گەنجەکە کرد و وتی، 'ئەوە کامەرانی برازامە، کوڕی فەرهادی ڕەحمەتییە!'

لە کاتێکدا سالار بەسەرسامییەوە لە کامەرانی دەڕوانی، خەسرەو دانەوییەوە و ئارۆنی گرتە باوەش و وتی، 'دەی ئەم پیاوە بچکۆلانەیە کێیە؟'

سالار هێشتا لە خەیاڵی خۆیدا خەریکی بیرکردنەوە و لێکدانەوە بوو، دوای ئەوەی چەند جارێک لە خەیاڵیدا قسەکەی ئەوی دووبارە کردەوە، 'کامەرانی کوڕی فەرهادی ڕەحمەتی!'

پاشان لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئارۆن، کورمە، کاکە خەسرەو!'

سالار ئەمەی وت و بەرەو ڕووی کامەران چوو، ئەملاولای یەکیان ماچ کرد، لەو کاتەدا سالار ویستی هەواڵی فەرهاد بپرسێت، بەڵام خەسرەو بواری پێ نەدا و لەگەڵ ئارۆندا دەستی کرد بە قسەکردن، فەرمووی لە سالار کرد تاوەکو دانیشێت، پاشان ڕووی کردە کامەران و پێی وت، 'بزانە چی دەخۆنەوە و ئەگەر برسییشیانە خواردنیان بۆ بێنە.'

کاتێک کامەران پرسیاری لە سالار کرد، لە وەڵامدا وتی، 'کاکە گیان چا، چایەکی خەست، بۆ ئەم پیاوەش شەربەتێک یان پەرداخێک ئاو.'

کامەران لە دەرگای دوکانەکە چووە دەرەوە، لەو کاتەدا سالار فرسەتی هێنا و لە خەسرەوی پرسی، 'ئەرێ کاکە خەسرەو پێم بڵێ، کاک فەرهاد کەی کۆچی دوایی کرد؟'

لەو کاتەدا خەسرەو میرزا ئارۆنی لەسەر کۆش بوو و بەرانبەر سالار دانیشتبوو، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بێ ئەوەی لە سالار بڕوانێت، بێدەنگ دەستی ئارۆنی لەناو دەستیدا ڕاگرت، هێواش سەری پەنجەکانی بە پشتی دەستە بچکۆلە و پەنجە باریکەکانی ئارۆندا دەهێنا، لەبەرخۆیەوە وتی، 'بەخوا برام نازانم چیت پێ بڵێم، خۆزگە بە دەردی خوا بڕۆشتایە!'

'دەی چۆن و چی ڕووی دا؟'

'سالار گیان، باوکم کاتی خۆی لە دەست زوڵم و زۆر لە شاری سلێمانییەوە هەڵهات، لەجیاتیی ئەوەی وەکو ئەو عالەمە بۆ ئیسرائیل بچێت، بەڕەحمەت بێت ڕووی کردە شاری سنە، خۆی واتەنی هەموو جارێک دەیوت من نامەوێت کوردستان بۆ موسوڵمانە هەوەسبازەکان بەجێ بێڵم، بیست ساڵێک لەمەوبەر

باوکم کۆچی دوایی کرد، من و فەرهاد و گوڵەباخی خوشکم هاتینە تاران، ئەوە گوڵەباخ هەر زوو بە نەخۆشی ماڵئاوایی لێ کردین و هەشت مانگێکیش پێش ئەمڕۆ فەرهاد لەلایەن ئیتلاعاتەوە بە تۆمەتی پشتگیریکردنی کۆمۆنیستەکان تۆمەتبار کرا، ئا لەو خیابانی جمهوورییە لەگەڵ چوار کەسی تر بە پێش چاوی ئێمە و عەشاماتێکی زۆرەوە ملیان بە پەتدا کردن، بەخوا سالار گیان، ئەخیرەن ناچارین هەمووومان هەڵبێین، بچین بۆ وڵاتێک لە وڵاتەکانی ئەورووپا یان بەرەو ئەمریکا بڕۆین، ئیتر خۆمان نەخەڵەتێنین و ئەوەمان قبووڵ بێت کە ئیدی ئێمەی جوو لەم وڵاتانەدا جێگامان نابێتەوە، دەی پێم بڵێ دەنگوباسی ئێوە؟ کاک خایم و دایکت و ئەوان چۆنن؟'

سالار هێشتا بەسەرسامییەوە لە خەسرەوی دەڕوانی، ویستی وەڵامی خەسرەو بداتەوە، بەڵام نەیدەزانی لەکوێوە دەست پێ بکات، لەو کاتەدا کامەران بە سینییەکەوە گەڕایەوە، لەژێر ئەو مێزەی سالار و خەسرەو لە تەنیشتیەوە دانیشتبوون، تەپڵەکێکی دەر هێنا، سینییەکەی دەستی پەرداخێک شەربەتی پرتەقاڵ و دوو پیاڵە چای لەسەر بوو، سینییەکەی خستە سەر تەپڵەکەکە و چووە بەردەمی ئارۆن و دانەوییەوە، بێ ئەوەی هیچ بڵێت لە گیرفانی پانتۆڵەکەی جێبێکی بچووکی باغەی دەر هێنا و بەرەو ڕووی ئارۆن گرتی و وتی، 'ئەوەش بۆ تۆ.'

کامەران وەکو ئەوەی بیەوێت یاری لەگەڵ ئارۆندا بکات، دەستی کرد بە گیرفانەکەی تریدا و چنگێک نوقڵی ڕەنگاوڕەنگی دەر هێنا و هەردوو دەستی بەرەو ڕووی ئارۆن ڕاگرت.

سالار سەیرێکی خەسرەوی کرد و وتی، 'ڕووداو و چیرۆکەکانی لای من بۆ دوایی.'

خەسرەو سەری بۆ سالار ڕاوەشاند و بەدەم قسەکردنەوە لەگەڵ ئارۆندا یەکی دەنکێک لە نوقڵەکانی ناو دەستی کامەرانیان هەڵگرت و دوای ئەوەی لە یەکترینیان ڕوانی، نوقڵەکەیان خستە ناو دەمیان و دەستیان کرد بە پێکەنین.

ئەو ڕۆژانەی سالار لە تاران مایەوە، سەردانیماڵی خەسرەوی نەکرد، چونکە خەسرەو ئەوەی بە سالار وتبوو، کە دڵنیایە ماڵ و دوکانەکەی لەلایەن پۆلیس و ئیتلاعاتەوە چاودێری دەکرێت، سالار ناچار بوو زۆربەی کات لە ئوتێل پەروین بمێنێتەوە و چاوەڕوان بێت، خەسرە و کامەران ڕۆژانە سەردانی ئوتێل پەروینیان دەکرد، دوای سێ مانگ، خەسرەو لە کووچەی عەرەبە پاسپۆرتێکی کڕی و کامەران ناو و وێنەی سالار و ئارۆنی خستە سەر، خەسرەو فیزای هۆڵەندای بۆ سالار و ئارۆن کڕیبوو، بەڵام مانەوە و چاوەڕوانکردنی سالار زیاتر بۆ ئەوە بوو تاوەکو بتوانێت بۆ ئەمریکا بڕوات، پاشان خەسرەو ئەوەی بە سالار وت، کە ئەو لە هۆڵەنداوە دەتوانێت خۆی ئەوە ڕێک بخات و لەوێوە بۆ ئەمریکا بچێت.

## ٣

مانگی چواری ساڵی ١٩٨٠ سالار گەیشتە وڵاتی هۆڵەندا، دوو ڕۆژ دەستبەسەر کرا و لە ئاپارتمانێکی داخراودا هێشتیانەوە، ئەو ئاپارتمانە شوێنی پێشوازیلێکردنی پەنابەران بوو، پاش ئەوەی دوو جار بۆ ماوەی زیاتر لە دوو کاتژمێر لێپرسینەوە و لێدوانیان لەگەڵدا کرد، لە خوارووی هۆڵەندا ناردیانە کەمپی چاوەڕوانی.

پارێزەرەکەی سالار پیاوێکی بەساڵاچووی سوورکار بوو، لە ڕۆژی یەکەمی بینینیدا بە سالاری وتبوو، چاوەڕوان بە و لە ماوەی چوار حەفتەدا وەڵام دەدرێتەوە، هەروەها داوای ئەوەی لە سالار کردبوو، بەڵگەنامەیەک لە عێراقەوە بێنێت، کە بیسەلمێنێت ئەو عێراقییە یان بە ڕەچەڵەک یەکێکە لە جووەکانی ئەو وڵاتەی لێوەی هاتووە، ئەوکات بە زووترین کات مافی پەنابەریی پێ دەدرێت، بەڵام بە پێچەوانەوە سالار بەردەوام نکوڵی لەوە دەکرد و دەیوت، 'من عێراقی نیم و تەنها جوویەکی کوردم.'

ڕۆژی گەیشتنی بۆ فرۆکەخانەی ئەمستردام، ئەو شوناسنامە عێراقییەی ساڵانێک بوو لەگەڵ خۆیدا هەڵی گرتبوو، لەسەری نووسرابوو سالار یەعقووب و ساڵی ١٩٥٢ بۆ تەواوکردنی ناوی سیانی عەلییان پێوە نووساندبوو، هەروەها ئەوەی لەسەر نووسرابوو کە ئەو بە دیانەت موسوڵمانە، پێش ئەوەی لە فرۆکەخانەی ئەمستردام دابەزێت لوولی کرد و کردی بە کونی

تەوالێتی فڕۆکەکەدا، ئەو شوناسنامە عێراقییەی ساڵانێک ئەوی لە گرتن و ڕاوەدوونان پاراستبوو.

لە یەکەم لێدوانیدا وتبووی، ناوم سالار یەعقووب سلێمانە و بە ڕەگەز کوردێکی جوولەکەیە و ساڵی ١٩٥٢ ناچار بوون ناو و ناونیشان و دیانەتیان بگۆڕن. سالار زوو زوو بە موتەرجیمەکەی وتبوو، 'پێیان بڵێ، کە بەسەرهاتی من هاوشێوەی جووەکانی ئەورووپایە، کە چۆن لە کاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا ناو و ناونیشانیان ئەگۆڕی بۆ ئەوەی نازییەکان نەیانگرن!'

دوای ئەوەی قسەکانی سالار هەمووی لەلایەن نووسەرێکەوە تۆمار کران، داوایان لە سالار کرد بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەو بەسەرهاتانەی باسی لێوە کردبوون، پێویستیان بە دۆکۆمێنت هەیە، سالار لە وەڵامدا وتبووی، 'نە ئێستا و نە لە داهاتوودا ناتوانم بەڵگەنامە لە عێراقەوە بێنم!'

دوای ئەو لێپرسینەوانە، موتەرجیمە کوردەکە بە سالاری وتبوو، 'ئەرێ ماڵت بە قوڕ گیرێت، ئەگەر تۆ ڕاست دەکەیت و جوولەکەیت، بۆ ناچیتەوە بۆ ئیسرائیل و چیت داوە لێرە؟'

'ئەرێ برام تۆ چ پێویست دەکات ناماقووڵیی وا بکەیت، کاری تەرجومەی خۆت بکە و حەقت بەسەر منێکی هەژارەوە چییە، چکارەم و لەکوێوە هاتووم و دەمەوێت لەکوێ بژیم!'

کابرای وەرگێڕ بەتووڕەیییەوە لە سالاری ڕوانی و پاشان بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت پشتی تێکرد و ڕۆیشت.

کەمپی شازادە لەناو دارستانێکی چڕ و تاریک و دوور لە ئاوەدانیدا بوو، ئەڵمانەکان لە کاتی داگیرکردنی وڵاتی هۆڵەندادا ساڵی ١٩٤٢ بۆ مەبەستی کۆکردنەوەی جوولەکە هۆڵەندییەکان دروستیان کردبوو، پاشان بە شەمەندەفەر بەناو ئەڵمانیادا بۆ

پۆلۆنیا و لەوێوە بۆ کەمپی بەناوبانگی ئاوسویچ دەبران، هێشتا ئاسەواری هێڵی ئاسنی ئەو شەمەندەفەرە مابوو، کە زیاتر لە بیست هەزار منداڵ و ژن و پیاوی جوولەکەی پێ ڕاگوێزرابوو، دوو هێڵی ئاسنی تەریبی ژەنگگرتوو، بەناو دارستانەکەدا تاکو ناو کەمپەکە و بەردەم ئەو ئاپارتمانەی سالاری تێدا بوو، کشابوو. ئاپارتمانەکە دوو قات بوو و لە دە ژوور پێک هاتبوو، هەر ژوورە و خێزانێک یان زیاتر لە کەسێکی تێدا بوو، دانیشتووانی ئەو کەمپە لە دەیان وڵاتی جیاوازەوە هاتبوون.

حەفتەی یەکەم سالار دوو جار لەگەڵ ئارۆندا سەردانی پزیشکی کەمپەکەیان کرد، ئافرەتێکی تەمەن سی ساڵەی قژزەردی باڵابەرزی چاوشین بوو، بەردەوام بە ئینگلیزییەکی خێرا لەگەڵ سالاردا دەدوا، سالار بێ ئەوەی لە مەبەست و قسەکانی تێبگات، بەردەوام سەری بۆ دەلەقاند و بەڵێی بۆ دەکرد، دوای ئەوەی پزیشکەکە پشکنینی بۆ ئارۆن کرد، مەڵحەمێک و شووشەیەک شرووبی بە سالار دابوو، تاکو بە مەڵحەمەکە ڕۆژیی جارێک سنگ و پشتی کوڕەکەی پێ بشێلێت و ڕۆژیی یەک جار کەوچکەچایەک لە شرووبەکە دەرخواردی ئارۆن بدات، جیاواز لەوەی پزیشکەکە چی بە سالار وتبوو، لە ڕۆژێکدا چوار جار تەواوی جەستەی ئارۆنی بە مەڵحەمەکە دەشێلا و ڕۆژانە زیاتر لە سێ جار بە کەوچکێکی چێشتخواردن شرووبەکەی دەکرد بە قورگی ئارۆندا، ڕۆژانی دوای ئەو ڕۆژە باری تەندروستیی ئارۆن بەرەو خراپتر دەچوو، خواردنی نەدەخوارد و بەردەوام تایەکی گەرمی لێ هاتبوو، بێجگە لەوەی زوو زوو دەرشایەوە و سکی دەچوو.

ئێوارەیەک سالار ئارۆنی لە بەتانییەکی سەوزەوە ئاڵاند و بەهەڵەداوان گەیاندییە ئەو ئاپارتمانەی ئەکەوتە سەر دەرگای

دەرەوەی کەمپەکە، هەروەها شوێنی پێشوازیکردن بوو، دوای دەوام و بەتایبەتی شــەوان، چەند پۆلیسێکی لێ بـوو، ســالار بەشپرزەییەوە گەیشتە ناو هۆڵی پێشوازیکردنەکە، کە بێجگە لە دەرگای هاتنەژوورەوە، دەرگای تری لەسەر نەبوو، لای ڕاست و چەپ چەندین کورسی بە دیوارەکانەوە لکێنرابوون، هۆڵەکە پەنجەرەیەکی شووشەبەندی دەکەوتە سەر و لەو کاتەدا پەنجەرەکە داخرابوو، بەڵام چەند کونێکی بۆ لێدوان تێدا بوو، لەو کونانەوە سەرنشینانی کەمپەکە دەبووایە قسەیان لەگەڵ کاربەدەست یان پۆلیسەکانی کەمپەکەدا بکردایە، شووشەی پەنجەرەکە بەقەدەر لەپی دەستێک ئەستوور بوو، بۆ ئەو مەبەستەی پۆلیس و کاربەدەستانی کەمپەکە لە ڕق و توورەییی ئاوارەکانی ناو کەمپەکە بپارێزێت، پێنج سانتیمەترێک بۆشایی بۆ نامە و گۆڕینەوەی شوناس لەژێر شووشەی پەنجەرەکەدا بوو.

سالار کاتێک گەیشتە بەردەمی پەنجەرەکە، هەناسەی لەبەر بڕابوو، لەو کاتەدا چوار پۆلیس لە ژوورەوە بوون، سیانیان پشتیان لە سالار بوو و تەماشای تەلەڤزیۆنیان دەکرد، کە لەو کاتەدا بە ڕێکەوت یاریی تۆپێن بوو، یەکێک لە پۆلیسەکانیش لە پشتی پەنجەرە شووشەبەندەکەوە دانیشتبوو، کابرایەکی قەڵەوی سوورکار بوو.

سالار جووتێک نەعلی دڕاوی لە پێدا بوو، هەرچەندە لە دەرەوەی ئاپارتمانەکە کزەبایەکی ساردی دەهات و شەوانە ناو ئەو دارستانە بەردەوام تەڕ و شێدار بوو، سالار تیشێرتێکی قۆڵکورتی سپی و دەرپێکورتێکی تاکو سەر ئەژنۆی لە پێدا بوو، قژی درێژ و دوو مانگ دەبوو ڕیشی نەتاشیبوو، وەکو منداڵێکی ساوا ئارۆنی قوماتە کردبوو، لە باوەشیدا بە تەنها دەموچاوی بە دەرەوە بوو، زوو زوو چاوە کاڵ و قاوەیییەکانی هەڵدەبڕی و بەترسەوە لە ڕوخساری

باوکی دەڕوانی، پۆلیسەکە لە سالاری ڕوانی و بەهێمنییەکەوە وتی، 'فەرموو، دەتوانم یارمەتیت بدەم؟'

سالار لە پۆلیسەکەی ڕوانی و بەدیقەتەوە چاوی بە پۆلیسەکانی تردا گێرا، بێدەنگ لە تەلەڤزیۆنەکەی ڕوانی و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، سەری داخست و لە ئارۆنی ڕوانی و دیسان لە پۆلیسەکەی ڕوانییەوە، وەکو بییەوێت بە ئاماژە شتێک بە پۆلیسەکە بڵێت، دیار بوو لە خەیاڵیدا بە زمانی ئینگلیزی ڕستەیەکی گونجاوی بۆ ڕێک نەدەخرا، چەند جارێک بەشەرمێکەوە و لەژێر لێوەوە وەکو لەگەڵ خۆیدا بدوێت وتی، 'ئەم مناڵە، ئەم منالّە!'

سالار بەرامبەر پۆلیسەکە دەمی کردبۆوە و چاوی داچڕیبوو، پۆلیسەکە لێی پرسی، 'چی ئەو منالّە، ئەو منالّە چییەتی، نەخۆشە؟'

'بەڵێ، بەڵێ زۆر زۆر نەخۆشە!'

پۆلیسەکە چەند جارێک سەری بۆ سالار لەقاند و پێی وت، 'بەڵێ، بەڵێ، برۆ لەوێدا دانیشە! یان بچۆرەوە ئاپارتمانەکەی خۆت، ئەوە من تەلەفۆن بۆ پزیشک دەکەم.'

سالار وەکو لە پۆلیسەکە تێنەگەیشتبێت، دیسان بە سەری ئاماژەی بە ئارۆن کرد بە باوەشیەوە و دیسان وتی، 'نەخۆشە، زۆر زۆر نەخۆشە!'

'دەزانم بەڕێز، ژمارەی ئاپارتمان و ژوورەکەت چەند بوو؟'

پۆلیسەکانی تر ڕوویان وەر گێڕابوو و هەرسێکیان لە سالاریان دەڕوانی، پۆلیسی بەر پەنجەرەکە دەستی دایە تەلەفۆنی سەر مێزەکەی بەردەمی و ژمارەیەکی لێدا، لێدوانەکەی چەند هەناسەیەکی خایاند، پاشان پۆلیسەکە ئاماژەی بە کورسییەکانی پشتەوەی سالار کرد و وتی، 'بەڕێز چاوەڕوان بە، پاش پێنج خولەکی دیکە پزیشکەکە دەگات!'

سالار بەتووڕەییەوە چاوی بەسەر پۆلیسەکاندا گێڕا، پشتی تێکردن و بە هۆڵەکەدا دەستی کرد بە گەڕان، زوو زوو دەوەستا و لە ئارۆنی دەڕوانی، ئازارێکی قووڵ لە دڵیەوە بەرەو سەرسنگی کشا، لەتاو ئازار خۆی کووڕ کرد و بەپێوە بەسەر ئارۆندا خۆی نووشتاندەوە، خۆی لەسەر پێکانی بۆ ڕاگیر نەدەکرا و چوو لەسەر کورسییەک دانیشت، خەمی ئارۆن و جەنجاڵیی ناو خەیاڵی و ئازاری دڵی باری دەروونیی ئەویان ئاڵۆز کردبوو، بەبێ خواستی خۆی چەند دڵۆپێک فرمێسک کەوتنە سەر ئەو بەتانییەی لە ئارۆنەوە ئاڵاندبووی.

پزیشکەکە کابرایەکی قـژزەردی کورتـەباڵای لاو بـوو، قەمسەڵەیەکی ڕەشی ئەستووری درێژی تا سەر ئەژنۆکانی لەبەردا بوو، جانتایەکی چەرمی بەدەستەوە بوو، کاتێک گەیشت، چوو لە بەردەمی پەنجەرەکەدا وەستا، پۆلیسەکە ئاماژەی بۆ لای سالار کرد، سـالار وەکـو لە هـۆش خـۆی چووبێت، بێدەنگ چەمابۆوە و سەری بەسەر ئارۆندا داهێشتبوو، کاتێک پزیشکەکە چوو لە تەنیشتیەوە وەستا و دەستێکی خستە سەر شانی، سـالار وەک لە خەونێکی قووڵ ڕاپەڕیبێت، شڵەژا و خۆی ڕاست کردەوە و لە دەموچاوی پزیشکەکەی ڕوانی، پزیشکەکە دەستی بەرەو ڕووی سالار درێژ کرد، پێش ئەوەی سالار تەوقەی لەگەڵدا بکات، وتی، 'من دکتۆر یانسنم.'

دوکتۆر یانسن دەستی دایە بنباڵی سالار و هەستایە سەر پێ، پاشان پێکەوە بۆ ژوورەکـەی خۆی گەڕانەوە، لەوێ ئارۆنی لە باوەشی سالار دەر هێنا و پشکنینی بۆ کرد، دوای ئەوەی لەسەر کاغەزێک چەند دێرێکی نووسی و لەسەر مێزی ژوورەکە دای نا، پاشان ویستی ئەوە بۆ سالار ڕوون بکاتەوە، کە هیچ مەترسییەک

لەسەر ژیانی منداڵەکەی نییە، سالار بێدەنگ لە پزیشکەکەی دەڕوانی، بەبێ ئەوەی لە قسەکانی دوکتۆر یانسن تێبگات، کاتێک یانسن ویستی جێیان بهێڵێت، سالار خۆی تووڕە کرد و بە زمانی نیوە کوردی و ئینگلیزی هاواری بەسەر پزیشکەکەدا کرد، 'ئەو کوڕە نەخۆشە زۆر نەخۆشە و گیان دەر نابات!'

تاوەکو ناو دەرگای دەرەوەی ئاپارتمانەکە دوای دوکتۆر یانسن کەوتبوو. یانسن چەند جارێک دەستی سالاری گرت و بە سالاری وت، 'ترست نەبێت، نەخۆشیی کوڕەکەت کوشندە نییە.'

ڕۆژی دوایی سالار چوو لە دەرمانخانەی کەمپەکە شووشەیەک شرووبی بۆ وەر گرت، دوو ڕۆژی بەسەردا تێپەڕی و تەندروستیی ئارۆن زیاتر بەرەو خراپی دەچوو، لە زمان کەوتبوو، بەئەستەم دەیتوانی چاوی هەڵبێنێت.

دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە سالار سەردانی دوکتۆر یانسنی کرد، یانسن بە سالاری وتبوو، 'ئەو منالە بەهۆی جێگۆڕکێ و هەواگۆڕکێوە نەخۆش کەتووە و تەنها پێویستیی بە پشووە.'

ئێوارەی هەمان ڕۆژ سالار بە شێوەی جاری پێشوو، ئارۆنی لە باوەش گرت و بۆ ئاپارتمانی پێشوازیلێکردنەکە بردی، پۆلیسەکان داوایان لێ کرد هێواش بێت و ئەوان تەلەفۆن بۆ پزیشکی کەمپەکە دەکەن، بەڵام بێزاری و تووڕەیی سالار بە بەڵێن و لەسەرخۆیی پۆلیسەکان هێواش نەدەبوویەوە، ئەو دوو شووشە شرووبەی بە دەستیەوە بوو توند دانی بە ڕووی پەنجەرەکەی نێوان خۆی و پۆلیسەکاندا، شرووبەکان بە جۆرێک بە شووشە ئەستوورەکەی پەنجەرەکەدا بڵاو بووبوونەوە بەئەستەم سالار پۆلیسەکانی لێوە دیار بوو، لەو کاتەدا ئارۆنی لەناو بەتانییەکدا لەسەر دوو کورسی پاڵ خستبوو، خۆیشی بەو هۆڵەدا وەکو ئاژەڵێکی بریندار

دەخولایەوە و بەردەوام لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد و جنێوی دەدا، زۆری نەخایاند پێنج پۆلیسی تایبەت بە جلی ڕەشەوە خۆیان کرد بە هۆڵی پێشوازیکردنەکەدا و پەلاماری سالاریان دا، دوای ئەوەی قۆڵبەستیان کرد، هەڵیان گرت و بردیان و خستیانە پشتی پاسێکی ڕەشی داخراوەوە، یەکێک لە پۆلیسەکان ئارۆنی لە باوەش گرت و چوو لە پێشەوەی پاسەکەدا دانیشت، دوای ئەوەی پاسەکە بەرەو پۆلیسخانەی شاری بریێدا و نزیک کەمپەکە کەوتە ڕێ، پۆلیسەکانی کەمپەکە کەوتنە پاککردنەوە و سڕینی ئەو پەنجەرەیەی ئەوانی لەو توورەبوونەی سالار پاراستبوو.

## ٤

ئەو سەرچەفەی درابوو بەسەر جێگاکەدا، هێشتا نەشێوێنرابوو، دوو خاولیی بەقەدکراوی لەسەر دانرابوو، تەوالێتێک و مەغسەلێکی دەستشۆردن و تەلەڤزیۆنێک بەرامبەری جێگاکە بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو، پێش سێ ڕۆژ، دوو پۆلیس سالاریان هێنایە ئەو ژوورە، کاتێک هێنایان، لە سووچێکەوە و لەسەر ئەرزەکە لێی دانیشت، پاڵی بە دیوارەکەوە دابوو، هەردوو دەستی لەبەر ئەژنۆی هەڵپێکابوون، چەند جارێک لە بێهێزیدا بە لادا هات و زوو زوو چاوی دادەخست و خەوی لێ دەکەوت، بەو جۆرە سێ ڕۆژی لەو بەندینخانەیە بەسەر برد، ئەو خواردنانەی بۆی دەهات، بەبێ ئەوەی لێیان بڕوانێت، بە نووکی پێی لە خۆی دوور دەخستنەوە، دوانیوەڕۆی ڕۆژی سێهەم، کابرایەکی قەڵەوی ڕەشتاڵەی سەرسپی هاتە بەردەمی دەرگای ژوورەکەی سالار و بە زمانی کوردی بانگی لە سالار کرد، 'کاک سالار، من موتەرجیمم، دەتوانم چەند قسەیەکت لەگەڵدا بکەم.'

لەو کاتەدا سالار لەسەر زەویی ژوورەکە لەسەر لای چەپی خۆی گرمۆڵە کردبوو، چاوی لێک نابوون و نووزەی لە خۆی بڕیبوو، یەکێک لەو دوو پۆلیسەی لە شانی ڕاست و چەپی کابراوە وەستابوون دەرگای ژوورەکەیان کردەوە، کاتێک کابرا چووە ژوورەوە، پۆلیسەکان چوون لەملاولای جێگاکەی سالارەوە وەستان، دوو پۆلیسی تریش بەدوای ئەواندا هاتنە ژوورەوە، کابرا

چوو لە تەنیشت سالارەوە دانیشت و بەهێواشی دەستێکی خستە سەر شانی، کاتێک سالار چاوی هەڵبڕی و ویستی خۆی ڕاست بکاتەوە، پۆلیسەکان لە سالار نێزیک بوونەوە و خۆیان ئامادە کرد بۆ بەرپەرچدانەوەی، کابرا دەستی بەرەو ڕووی سالار درێژ کرد و وتی، 'من وشیار بابانم و موتەرجیمم.'

سالار خۆی ڕاست کردەوە و پشتی نا بە دیوارەکەوە، پاش ئەوەی بەبێزارییەکەوە لە وشیار بابانی ڕوانی، لەژێر لێوەوە وتی، 'ڕووی بابی تۆ و ئەوانیش ڕەش بێت، ئەوە نەبێت تۆش لەوان شەریفتر بیت!'

وشیار بابان، بێ ئەوە خۆی تێک بدات و دەستی بگێڕێتەوە، بەپێکەنینەوە دەستی خستە سەر ئەژنۆی سالار و وتی، 'هەرچییەک دەڵێیت قبووڵمە و لەسەر سەرم، تۆ ڕێزت هەیە، من لەبەر خاتری تۆ هاتووم بۆ ئێرە، نەک بە ئەمری ئەوان.'

'کوڕە خۆ ئەمانە لە بەعس پیسترن!'

'خەمت نەبێت، من هیچ لەو قسە نابەجێیانەی تۆیان بۆ تەرجومە ناکەم!'

'دەی، منەتت بە قۆنەرەکانم، ناپیاو، پێیان بڵێ، ئەو چوار سەگەی بەپێوە وەستاون، لە دڕندە بەعسییەکان بێڕەوشت و زاڵمترن.'

'نەخێر کاکە گیان من بۆ ئەوە نەهاتووم، تاوەکو کێشەی زیاترت بۆ دروست بکەم، بە پێچەوانەوە، من هاتووم یارمەتیت بدەم.'

'یارمەتی چی و تەڕەماشی چی؟ ئا لەو سەگانەم بۆ بپرسە، کوا کوڕەکەم؟ کوڕەکەمیان بۆ کوێ بردووە و ئێستا لای کێیە؟'

'کوڕەکەت، ئارۆن، ئەم بەیانییە خۆم لەلای بووم و پێکەوە قسەمان کرد و گوزەرانیشی زۆر باشە، ئێستا لە نەخۆشخانەیەکە دە دەقەیەک لێرەوە دوورە، لەلایەن کەمپەکەوە دایەنیان بۆ گرتووە

و بەردەوام لە لایەتی و خزمەتی دەکات.'

سالار بەسەرنجەوە گوێی لە وشیار بابان گرتبوو، پاشان سەری داخست و تاوێک بەبێدەنگی لەبەینی ڕانەکانیەوە لە بەرپێی خۆی ڕوانی، وشیار بابان بەردەوام بوو و وتی، 'ئەگەر پێت باشە ئەوە ئێستا من و تۆ بۆ لای ئارۆنی کوڕت دەچین، پاشان هەر خۆشم بۆ کەمپەکەت دەبەمەوە!'

'دەی ئەم سەگانە؟'

سالار لە کاتێکدا ئەمەی وت، کە بەتەوسێکەوە بە پۆلیسەکاندا هەڵی ڕوانی، 'تۆ تاوانێکی ئەوەندە گەورەت نەکردووە تاکو لەوە زیاتر لەسەری بەند بکرێیت.'

'مادام کوڕەکەم لە نەخۆشخانەیە و لەژێر چاودێریدایە ئیتر...'

سالار قسەکەی بۆ تەواو نەکرا و سەری بەسەر کۆشیدا شۆڕ کردەوە و دایە پرمەی گریان، وشیار بابان خۆی لێ نزیک کردەوە و دەستێکی خستە سەر شانی و وتی، 'نا برا، خۆت دڵتەنگ مەکە و هەستە با بڕۆین.'

لە کاتێکدا وشیار بابان سالاری پێش خۆی دا و لە پۆلیسخانەکە دەر چوون، سالار سەری داخستبوو و هیچی بە پۆلیسەکان نەوت، وشیار بابان سوپاسی پۆلیسەکانی کرد، بە سەیارەکەی وشیار بەرەو نەخۆشخانەی یولیانا کەوتنە ڕێ.

لە ڕێگا وشیار بابان پرسیاری ئەوەی لە سالار دەکرد، ئایا لە سلێمانی کێ دەناسێت و دانیشتووی چ گەڕەکێک بووە، سالار لە وەڵامدا وتی، 'چوارباخ،' پاش چەند هەناسەیەک بەردەوام بوو وتی، 'نەخێر، نەخێر، جوولەکان، باووباپیریشم هەر لەو گەڕەکەدا لەدایک بوون.'

'بەڕاست، چۆن؟ خۆ ئێوە جوولەکە نین؟'

'بەڵێ.'

'هەر بەڕاست یان...!'

'قابیلە لێرەش لە ترسی گیانی خۆم و بۆ ڕازیکردنی دڵی جەنابت، بڵێم موسوڵمانم!'

'نا، من وام زانی کە... جا کەواتە خەمت چییە، ئێوە لە هۆڵەندا وەزعتان باشە و بەخوا هەر بڵێیت جوولەکەم خێرا ئیقامە وەر دەگریت.'

'وەزعمان باشە! جا قیمەتی چییە، ولاتێکی بێگانە ڕێزت لێ بگرێت یان نەیگرێت، خۆزگە لە ولاتەکەی خۆمان ڕێزمان لێ دەگیرا و جێگامان پێ لێژ نەدەکرا.'

'ولاتی خۆتان؟ کورە برا ئێوە کولفیکولن، وەڵا ئێوە هەر بە نێرەکەری فەلەستینتان داگیر کرد و ئیسرائیلتان بۆ خۆتان دروست کرد، ئەوەتانێ، ئێستا دنیا پشتیوانتانە!'

'چی... کوێ؟'

'ئیسرائیل، قوڕ بە سەر ئێمەی کورد، بزانە کەسێک ئاوڕێکمان لێ دەداتەوە!'

'بەداخەوە، لەوانەیە پەیوەندیی بە هەڵە و نەزانیی خۆتانەوە هەبێت'

'جا چ قەومێک بە ئەندازەی کورد قوربانیی داوە و قارەمانە؟'

'قارەمان، قارەمان، ئیتر ئەم بەزم و بالۆرەیە نەبڕایەوە!'

'دەی چۆن برا، ئازایەتی ڕۆڵەی کورد لە دنیادا بێوێنەیە!'

'ئا ئەوەیە نەزانی، مەگەر تەنها ئازایەتی بۆ بەدەستهێنانی مافەکانت بەس بێت!'

دوای ئەوەی سالار ئەمەی لەژێر لێوەوە وت، وشیار بابان لە سالاری پرسی، 'وتت چی؟ بمبوورە باش گوێم لێت نەبوو!'

سـالار هیچ وەڵامێکی نـەدایـەوە، لـەو کاتـەدا لـە پەنجەرەی لای ڕاستی سەیارەکەوە لەو دارانـەی دەڕوانـی، کە لە قەراغی جادەکەدا ڕوابوون، وەکو ئەوەی هەوڵ بدات بیان ژمێرێت، بەڵام بێخەوی و بێخۆراکیی ڕۆژانی ڕابردوو بێهێزیان کردبوو، تاوێک بوو هەردووکیان بێدەنگ بووبوون، کاتێک گەیشتنە بەردەمی خەستەخانەکە، وشیار بابان دەستی بۆ لای سـالار درێژ کرد، کاتێک سالار دەستی خستە ناو دەستی وشیار بابانەوە، پێی وت، 'کاک سالار، ئیتر من دەبێت بڕۆم و ئێرە نەخۆشخانەی یولیانایە و ئارۆنی کوڕت لێرەیە، پرسیار بکە و بەئاسانی ژووری کوڕەکەت دەدۆزیتەوە، هیوادارم ئیتر شەڕ و ئاژاوە نەنێیتەوە و سەری خۆت کز بگریت!'

سـالار بەسەرسامییەوە لـە وشـیـار بابانی ڕوانـی، ویستی سوپاسی بکات و داوای لێبووردنی لێ بکات، سالار ویستی پێی بڵێت، 'هیوادارم بە قسەکانم دڵگران نەبووبیت!' بەڵام ڕووی لێ وەر گێڕا و خێرا دەستی لەناو دەستی دەر هێنا، کاتێک لە سەیارەکە دابەزی، لەژێر لێوەوە وتی،

'باشە، سوپاست دەکەم ماندووم کردیت.'

'نەخێر، چۆن؟ بە پێچەوانەوە، خوات لەگەڵ.'

سالار لەوە زیاتر هیچی نەوت، کاتێک لە سەیارەکە دابەزی، دەرگای سەیارەکەی دانەخست و چوو لەسەر سەکۆی شەقامەکە پاڵی دا بە دارگڵۆپێکەوە، ڕووی لە وشیار بابان وەر گێڕا و لە بالاخانەی نەخۆشخانەکەی دەڕوانـی، پاشان وشیار بابان خۆی لار کردەوە و دەرگای سەیارەکەی داخست، دوای ئەوەی وشیار بابان ڕۆیشت، سالار چوو لەسەر کورسییەک لە بەردەم دەرگای نەخۆشخانەکەدا دانیشت، ئەنیشکەکانی لەسەر ڕانەکانی دانابوون

و سەری بەسەر ئەژنۆکانیدا شۆڕ کردبوونەوە و لە کاشییەکی ڕەنگدێزی بەرپێی خۆی ئەڕوانی، زیاتر لە نیو کاتژمێر بێدەنگ لەویادا دانیشتبوو، وەکو پەیکەرێکی ناوازە و بێگیان لە بەردەم ئەو نەخۆشخانەی منالانەدا بوو، لە خەیاڵی خۆیدا گەڕانێکی خێرا و پچڕپچڕی کرد بەسەر یادەوەرییەکانی ڕابردوویدا، بێ ئەوەی بچێتە ناو قووڵایی هیچ یەکێک لەو یادەوەرییانەی، ئەو بێدەنگی و سڕبوونەی بە هەناسەهەڵکێشانێک کۆتایی پێ هێنا و هەستا و لە دەرگایەکی بەکرەییەوە بۆ ناو هۆڵی پێشوازیی نەخۆشخانەکە چوو.

کاتێک لە پرسگەکە پرسیاری کرد، بە سالاریان وت، ئەو نەخۆشە لە نهۆمی یەکەم و ژووری ژمارە چواردە کەوتووە، ئەو ژوورەی ئارۆنی لێ بوو، ژوورێکی دوونەفەریی فراوان بوو، سالار چووە ژوورەوە و بینیی ژنێکی قژزەردی باریکەلەی پێستسپی، لەسەر قەراغی جێگاکەی ئارۆن دانیشتبوو، کتێبێکی بەداخراوی لەسەر کۆش بوو، پشتی لە سالار و لە پەنجەرەی ژوورەکەوە بێدەنگ لە دەرەوەی دەڕوانی، لەو کاتەدا ئارۆن لەسەر پشت ڕاکشابوو، چاوەکانی لێک نابوون و خەوی لێ کەوتبوو، کانیۆلایەک لە باڵی ڕاستیدا بوو، سۆندەیەکی سپیی باریکی بەسەر شانیدا لێوە تێپەڕ دەبوو، بە پشتی سەریەوە دوو کیسە ئاوی دڵۆپێنەر هەڵواسرابوون.

سالار بێدەنگ لە ئارۆنی دەڕوانی، کاتێک گەیشتە نزیک جێگاکە، بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەو ئافرەتەی بەدیار ئارۆنی کوڕیەوە بوو، لەبەرخۆیەوە دوو جار نەرمەکۆکەیەکی کرد، کاتێک ژنەکە ئاوڕی لە سالار دایەوە، ڕاپەڕی و لە جێگای خۆی هەستایە سەر پێ و بەرانبەر سالار وەستا، خێرا دەستی بۆ لای سالار درێژ کرد و وتی، 'من، خێردا سلاوسم'

سالار، بەبێ ئەوەی لە خێردا بڕوانێت، دەستی خستە ناو دەستی
و پێی وت، 'سالار یەعقووب.'
'باوکی ئارۆن؟'
'بەڵێ دەزانم.'

ئەگەر بەیانی لە خەون هەڵسایت، ئەوە بزانە چام بۆ لێناویت و لە لاتەوە دانیشتووم، نانی گەرم و جامێک هەنگوین لەسەر مێزی نانخواردنەکەیە، تاوێک لە ناوچاوی یەکترین دەڕوانین و هەموو دوودڵییەک دەڕەوێنینەوە، پاشان داوات لێ دەکەم خەیاڵت لای ڕابردووت نەبێت، ئێستاشت بە من بسپێرە، چاوت لێک بنێ و بیر لە یەک شت بکەرەوە، تەنها ئەوەی تۆ لە پێناویدا ژیاویت.

کاتێک ویستمان بڕۆین و من ناوی نیشتمانم لەلا هێنایت، وەکو جاران مەشلەژێ و پێڵاوەکانت لەپێ مەکە و دیسان بەدوای ڕانکوچۆغە کۆنەکەتدا مەگەڕێ، ئەمجارەیان خۆم دەتگۆڕم و ڕێبەریت بۆ دەکەم و پێکەوە دووبارە سنوورەکان دەبەزێنینەوە، دەزانم ڕێگاکان سەختن و تۆش ماندوویت، دەزانم ناونیشانی ماڵەکان گۆڕاون و دەرگای ماڵە کۆنەتان لە گرێژنەوە دەر هێنراوە.

لە خۆتم بیست هاوڕێکانت هیچیان لە ژیاندا نەماون، جەمال عەلی، کورد وتەنی براکانی خۆیان کوشتیان، مامۆستا ڕەسوڵ لە ڕۆژانی براکوژیدا کەوتە داوی دووبەرەکییەوە و وەکو پارتی لە زیندانی یەکێتیدا دڵی شکا و بەناسۆرەوە وەک خیانەتکارێک مرد، سامی و سازگاری ژنی لە وڵاتی ئەمریکا دەژین.

ئیتر تۆ ئەوان لە نیشتمان نابینیتەوە، بەڵام ئێمە هەر دەڕۆین، لە گەڕانەوە دوودڵ مەبە و من ناونیشانی منداڵەکانی ئەوانم لەلایە،

یان دەچینە ماڵی نەوەی حەمەجان و ساشا، لە نیشتمان پەکمان ناکەوێت، ئیتر تۆش کاتێک بەڕێ کەوتین مەشڵەژێ و بەدوای کەوش و جلە کوردییەکانتا مەگەڕێ، دڵنیا بە لە دڵ و خەیاڵمدا هەڵت دەگرم و لەگەڵ خۆمدا بۆ نیشتمانی سارات دەبەمەوە.

# ١

'هەشت ساڵ بیرکردنەوە و ئاخهەڵکێشان بەدوای پیاوێکدا کە لە ژیاندا نەماوە، پیاوێک تەنها لە ڕابردومدا و بە خەیاڵ بوونی هەیە، ئەوە بۆ ئافرەتێک لەم تەمەنەی مندا گرانە، هەست دەکەم پێویستیم بە کەسێکە جێگای ئەو پڕ بکاتەوە.'

'کەس ناتوانێت جێگای ئەو لە دڵی تۆدا بگرێت، دەی منداڵەکانت، ناتوانن تۆزێک سەبووری بە دڵت بدەن؟'

'وا بزانم لە مەبەستم تێنەگەیشتیت!'

'چۆن؟ خۆ تۆ بەتەنها نیت و کەسانێک هەن سەبووری بە دڵت بدەن؟'

'وەکو کێت مەبەستە؟ دەڵێم سالار، کەی هەردووکمان تەواو مەست بووین تێت دەگەیەنم، کە مەبەستم لەو تەنیاییە چییە!'

'دەڵێم خێردا منیش!'

'چی تۆیش؟'

'ئیتر منیش ئازیزم، منیش کاتێک ئارۆن یەت بۆ لای تۆ، یان دەچێت بۆ قوتابخانە، زۆر هەست بەو تەنیاییە دەکەم.'

'سالار، تۆ پێویستە هەوڵ بدەیت باشتر فێری زمانی هۆڵەندی ببیت!'

'ئەگەر پێویست بکات خۆم فێر دەکەم!'

'لەبەر خاتری من، یانی تۆ خاتری من بە پێویست نازانیت!'

'باش تێنەگەیشتم لە مەبەستت!'

خێردا دوای ئەوەی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، لە سالاری ڕوانی و لەبەرخۆیەوە وتی، 'دەڵێم پێکێکی تر شەرابت بۆ تێبکەم؟'

'بەڵێ، شەرابەکەی زۆر باشە.'

خێردا کاتێک ویستی پرسیارەکەی دووبارە بکاتەوە، ئارۆن لەگەڵ ئێلینی هاوڕێیدا هاتنە ژوورەوە، ئارۆن دوای ئەوەی باوکی و خێردای ماچ کرد، لە لای خێرداوە دانیشت و وتی، 'ئەگەر بەشمان نەخورابێت، ئێمەش بۆ شەرابخواردنەوە هاتووین.'

سالار هەڵسا و چوو دەستی ئێلینی گرت، لێی ڕوانی و پێی وت، 'دێیت یارمەتیم بدەیت، تۆ تەنها دوو پەرداخ بۆ خۆت و دڵخوازەکەت بێنە و منیش دەچم لە گەڕاجەکە دوو شووشە شەراب دەهێنم.'

ئێلین تەنها سەری بۆ لەقاند و دوای سالار کەوت، کاتێک پێکەوە گەیشتنە چێشتخانەکە، سالار شانی ئێلینی گرت، لێی ڕوانی و بەپێکەنینەوە پێی وت، 'ئەرێ ئێوە لەکوێوە پەیدا بوون، بۆچی بۆ جێگایەک یان یانەیەکی شەوانە ناچن؟'

ئێلین بەشەرمێکەوە لە سالاری ڕوانی و هیچی نەوت، پاشان بە دەستی بەتاڵ بۆ ژووری دانیشتنەکە گەڕایەوە و چوو لەلای ئارۆنەوە دانیشت، لەو کاتەدا ئارۆن و خێردا پەیکەرێکی داریان بە دەستەوە بوو لێیان دەڕوانی.

سالار گەڕایەوە و لە لای خێرداوە دانیشت و لە ئێلینی ڕوانی، ئەویش دەستی خستە سەر شانی ئارۆن و بەنازێکەوە پێی وت، 'با بڕۆین، دایکم چاوەڕوانی ئێمەیە!'

ئارۆن پەیکەرەکەی دەستی لەسەر مێزەکە دانا و ئاوڕی لە ئێلین دایەوە و پێی وت، 'چۆن؟ ڕۆیشتنی چی، دەی ئێمە بەنیازی چی بووین؟'

'بمبوورە ئارۆن لەبیرم چوو پێتی بڵێم، گفتم بە دایکم دابوو

ئەمشەو بۆ لای ئەو بچین.'

کاتێک ئێلین بە لاچاوێک لە سالاری ڕوانی، سالار لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئارۆن بێدڵیی ئێلین مەکە.'

ئارۆن ماسوولکەی ناوچاوانی گرژ کرد و لە سالاری ڕوانی، 'دەی ئەگەر نەڕۆین دانیشتنەکەتان لێ تێک دەدەین؟'

سالار لە ئارۆنی ڕوانی و چاوێکی لێ داگرت، پاشان ئارۆن لە جێگای خۆی هەڵسایە سەر پێ و دەستی بۆ لای ئێلین درێژ کرد و لێی پرسی، 'ئازیز، بڕۆین؟'

گەیشتبوونە ناو دەرگای ژووری دانیشتنەکە، ئارۆن گەڕایەوە و پەیکەرەکەی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و دایە دەستی باوکی، 'ئەوە ئەو پەیکەرەیە کە زیاتر لە هەشتا ساڵ لەمەوپێش باپیرە خایم لە کوردستان لە داری بەڕوو بە دەستی خۆی تاشیویەتی، پیشانی گەڵێک هونەرمەند و کەسانی شارەزام داوە و هەموویان زۆر سەرسام بوون بە توانای ئەو هونەرمەندەی ئەو پەیکەرەی تاشیوە، کارێکی ئەبستراکتی لەو شێوەیە و لەو سەردەمەدا و لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئیتر بزانە کێ دەڵێت منیش لە سرووشتەوە ئەو بەهرەیەم تێدا نییە، بەڵام تۆ مەجبوورم دەکەیت بە خوێندن و پیشەیەکی تر.'

'ئاخر...'

سالار ویستی وەڵامی بداتەوە، ئارۆن قسەکەی بە سالار بڕی و بە دەنگی بەرز چاوی بەسەر خێردا و سالاردا گێڕا، 'ئەگەر گەورەکان تەنها خەیاڵیان لای خواست و ئارەزووی خۆیان بێت، ئەوا بچکۆلەکان ئەبەد تێگەیشتنیان بۆ ژیان نابێت.'

کاتێک ئارۆن ئەمەی بە دەنگێکی گڕ و دڵی پڕەوە وت، خێردا گەیشتبووە بەردەمی ئارۆن و دەستی خستە سەر شانی و پێی

وت، 'پێویست ناکات دڵی خۆت تەنگ بکەیت، هەروەها من ڕازی نابم لێت هەموو هۆکاری خەمەکانی خۆت بخەیتە ئەستۆی من و باوکت، ئێستا، یان وەرە لەگەڵمان دانیشە تاوەکو باسی خەمەکانی تۆ بکەین، یان لەگەڵ ئێلین بڕۆ، ئیتر بەسەرپێییەوە گلەیی لە کەس مەکە.'

دوای ئەوەی خێردا ئەمەی وت، ئارۆن و ئێلین لە دەرگای ماڵەکە چوونە دەرەوە و خێرداش چەند هەناسەیەک بوو گەڕابۆوە و لە لای سالارەوە دانیشبوو، ئەو بێدەنگییەی ئارۆن و ئێلین لەدوای خۆیانەوە بەجێیان هێشت، درێـژەی کێشا، خێردا دەستی دایە پەیکەری کەمتیارە دووگیانەکە، ئەو بێدەنگییەی شکاند و لە سالاری پرسی، 'ئـارۆن وتی باپیرە خایم ئەم پەیکەرەی وەکو پۆرترێتی خۆی ناساندووە، لە کاتێکدا جەستەیەکی تێکەڵە، سەر و دەموچاوی ئاژەڵ و شێوازی وەستانەکەی و شان و دەست و پێکانی مرۆڤن، چەند کەسێک بە ئارۆنیان وتووە ستایلەکەی کوبیسمە، منیش وای دەبینم.'

سالار خۆی لە خێردا نزیک کردەوە و پەیکەرەکەی لە دەستی وەر گرت،

'باپیرە خایم پەیکەری زۆری تاشیوە، لە ئیسرائیل کاتێک چوومە ماڵەکەی، پڕ بوو لەو جۆرە کارانە، هەروەها بە بیرم دێت کاتێک منداڵ بووم، بەردەوام خەریکی پەیکەرتاشین بوو، ئارۆن ڕاست دەکات، من وام دەزانی خوێندنی یاسا ئەو بەختەوەر دەکات، بەڵام...'

'بەڵام چی؟ ئیتر ئێمەی مرۆڤ هەمووومان بەردەوام بە خەمێک دووگیانین، هاوشێوەی ئەو پەیکەرە.'

'ئێمە هەمووومان بە خەمێک دووگیانین، ئەوە من قەیناکا، بەڵام ئارۆن بۆچی؟'

'سالار ئەو کورە گەنجە و خەریکی خۆدۆزینەوە و گەڕانە بەدوای خۆی و ڕەچەڵەکی خۆیدا، پێویستی بە کاتە و پاشان هەموو شتێک باش دەبێت.'

'خێردا، تۆ باشتر لە و کورە تێدەگەیت.'

'پێویستە تۆ ئارۆن ئازاد بکەیت و ئیتر با بۆ خۆی بڕیار لەسەر ژیانی خۆی بدات، هەروەها ئەو کورە کاریگەریی ڕابردووی زۆر بەسەرەوەیە، زۆر جار هەست دەکەم هەڵسوکەوت لەگەڵ پیاوێکی پیری بەتەمەندا دەکەم، هەرچەندە تاوەکو چوار ساڵی تەمەنی ئەو نەهامەتییانەی کوردستانی بینیوە، بەڵام ئەوەی من هەستم پێ کردبێت لە ناخەوە وەکو تۆ وێرانە.'

'پێت وایە؟'

'بێگومان.'

'بەداخەوەم!'

'جا ئیتر تۆ زەمبت چییە، خۆ تۆ سەرپشک نەبوویت لە شوێن و جێگای لەدایکبوونت، تاوەکو چارەنووسی ئەویش بگۆڕیت.'

'زوو وا نەبوو، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا هەستم پێ کردووە، کە ئەویش هەڵگری هەمان ئەو خەمانەی منە.'

'من لە منداڵییەوە هەستم بەوە کردووە، کە ئارۆن بەردەوام خەمێکی هەیە و لە شتێک دەگەڕێت.'

'مردنی سارای دایکیەتی.'

'هەر دەبێت ئەوە بێت.'

لەدوای ئەم وەڵامەی خێرداوە، سالار پەرداخەکانی پڕ کردەوە لە شەراب، پەرداخەکانیان بە دەستەوە گرت و هەستانە سەر پێ، سالار لە خێردای ڕوانی و لێی پرسی، 'پێت چۆنە دوای ئەم پێکە پیاسەیەک بکەین؟'

کاتێک هەردووکیان گەیشتبوونە دەرەوەی ماڵەکەیان و بەلای دەستی ڕاستی ماڵەکەی سالاردا بەڕێ کەوتن، خێردا لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئێستا هەست بە کاریگەریی ئەو شەرابە خراپەی تۆ دەکەم.'

'گرنگ ئەوەیە مەستی کردبین.'

ئاخر کێشەی شەرابی خراپ لەوەدایە، تەنها مەستت ناکات، بەڵکو سەرت ئێشێ و بەدمەستت دەکات.'

'خێردا، زۆر لەسەری مەڕۆ، ئەگینا دەکەویتە زەمکردنی خاوەنەکەیشی.'

'خاوەنەکەی، ئەو پیاوە... ئەوە من زیاتر لە پانزە ساڵە شەرابی لەگەڵدا دەخۆمەوە، بەبێ ئەوەی بتوانێت تەنها جارێک چییە دڵم ڕازی بکات!'

خێردا دوای ئەوەی ئەم قسەیەی کرد قۆڵی لە قۆڵی سالار هەڵپێکا و خۆی پێوە نووساند، بۆ چەند هەناسەیەک بێدەنگ پێکەوە دەڕۆیشتن، لە ماڵی سالارەوە ڕاستەشەقامێک بە درێژاییی پێنج کیلۆمەتر دەیگەیاندنە ناو باخێک، خێردا بەردەوام سەری پەنجەکانی بەسەر پێستی دەستی سالاردا دەهێنا، سالار هیچی بە خێردا نەوت، بێجگە لەوەی جارێک دەموچاوی خستە ناو قژە ئاڵۆزکاوە زەردەکەی خێردا و پڕ بە سییەکانی بۆنی پێوە کرد، پاشان وەکو ئەوەی شەرم لەو کردەوەیەی خۆی بکات، وەکو ئەوەی بیەوێت لە دەستی ڕابکات، زوو زوو هەنگاوەکانی خێرا دەکرد، لە کاتێکدا دەستی توند گرتبوو، خێرداش دەستی توند دەگوشی و لەژێر لێوەوە پێی دەوت، 'هێواش ئەو ڕاکەڕاکەیەت لە چییە!'

## ٢

سالار و خێردا لەنێوان خۆیاندا مانگانە پێداویستیی ژیانی ئارۆنیان دابین دەکرد.

کاتێک لەگەڵ ئێلین لە شاری ئەمستردام دەیان خوێند و پێکەوە دەژیان، هەردووکیان لە دواساڵی خوێندندا بوون، ئەوەی ئارۆنی لە شاری ئەمستردام هێشتبۆوە خوێندنەکەی نەبوو، بەڵکو یانەی ئەجاکس بوو، کە حەفتانە لەگەڵ ئێلین پێکەوە دەچوون سەیری یارییان دەکرد، هەرچەندە ئێلین هیچ خۆشی لە سەیرکردنی تۆپێن نەدەهات، بەڵام هەستی دەکرد ئارۆن بەبێ ئەو لە چوونە دەرەوە و خواردنەوەدا بەردەوام سنوور دەبەزێنێت و هیچ بەزەیی بە خۆیدا نایەتەوە، خێردا و سالار بەردەوام پەیوەندییان پێوە دەکرد و داوایان لێ دەکرد ئاگاداری ئارۆن بێت.

'باشە بۆچی خوێندنی یاسات هەڵبژارد، خۆ کەس زۆری لەسەرت نەبوو؟'

'ئەگەر بە ڕای خۆم بووایە هەرگیز ئەم بژاردەیەم نەدەکرد، چونکە ئەوکات نەمتوانی دڵی باوکم بشکێنم.'

'دەی ئەگەر خوێندنی یاسای نێودەوڵەتیت هەڵنەبژاردایە، ئێستا سەرقاڵی چی بوویت؟ یان بۆ چی دەتخوێند؟'

'لەوانەیە لە ئەکادێمیای هونەری شێوەکاری بوومایە!'

'چۆن؟ بۆ لەو بوارەدا لە خۆت دڵنیایت؟'

'ناتوانم بڵێم زۆر دەسترەنگینم، بەڵام هەستەکانم لە لەزەتی هونەر تێر نابن و زۆر پێی بەختەوەرم.'
'ئێستا تۆ لە نیوەی ساڵی چوارەمدایت، دوای هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر، من پێم وایە وازهێنان کارێکی گونجاو نییە!'
'لە توانامدا نییە بەسەرکەوتوویی تەواوی بکەم.'
'لە هاوڕێکانتم بیست، کە هەموو ڕۆژێک مەستیت، ئایا مادەی هۆشبەر بەکار دەهێنیت؟'
'نازانم، باوەڕ ناکەم ئەوە هۆکار بێت، من زۆر لە شاری ئەمستەردام بێزارم و دەمەوێت بۆ ماڵەوە بگەڕێمەوە!'
'هەست دەکەم تۆ کێشەی دەروونییت هەیە، ئایا پێت باش نییە لەگەڵ پزیشک لەو بارەیەوە قسە بکەیت؟'
'بەڕێز تۆماس، من هاتووم تاوەکو لێرەدا و هەر ئەمڕۆ واز لەم خوێندنە بێنم، من منداڵ نیم تاوەکو تۆ ئامۆژگاریم بکەیت، تکایە خۆم بڕیار لەسەر پاشەڕۆژی خۆم دەدەم.'
'بەمبوورە من لەم بوارەدا شارەزایی سێ ساڵم هەیە، دەزانم زۆر جار قوتابییەکان بە هۆی کێشەیەکی بچووکەوە ڕەنج و ماندووبوونی چەندین ساڵەی خۆیان لەدەست دەدەن، چونکە نایانەوێت لە کێشەکانیاندا هاوکاری بکرێن.'
کاتێک لێپرسراوی کاروباری ئارۆن لە زانکۆی ئەمستردام ئەمەی وت، بێدەنگی کەوتە نێوانیان، لە کافتریای زانکۆ لەسەر مێزێکی دوونەفەری دانیشتبوون، لەو کاتەدا تۆماس هەڵسایە سەر پێ و لە ئارۆنی ڕوانی و پێی وت، 'قاوەیەک دەخۆیتەوە؟'
'بێگومان.'
تۆماس گەڕایەوە و سینییەکی بەدەستەوە بوو، لەسەر سینییەکە دوو کووپی سپیی قاوەی لەسەر بوو، دوای ئەوەی لەسەر مێزەکە

داینا، لە ئارۆنی ڕوانی، 'ڕێگام پێ بدە تاوەکو هاوکاریت بکەم!'

ئارۆن بێ ئەوەی لێی بڕوانێت، دەستی برد و لەسەر سینییەکە کووپێک قاوەی هێنایە بەردەمی خۆی، دوو کڵۆ شەکر لەسەر لێواری ژێر کووپەکەدا بوو، خستنیە ناو قاوەکە و دەستی کرد بە شێواندنی، پاشان تۆماس بەردەوام بوو و لە ئارۆنی پرسی، 'ئایا کەسوکارت ئاگادارن؟'

'نەخێر.'

'دەی پێت وا نییە مافیان بەسەرتەوە هەیە تاوەکو کێشەکانت بزانن.'

'نەخێر.'

'جا ئەگەر تۆ لێدوانەکانمان بگەیەنیتە بنبەست، ئەوا من مەجبوورم پەیوەندی بە باوک و دایکت یان کەسێکی نێزیکتەوە بکەم.'

'پێویست ناکات!'

'ئاخر منیش لێپرسراوم هەیە و هەر ئاوا بەئاسانی ناتوانم ڕێگات پێ بدەم تۆ لە بێزاریتەوە کۆتایی بە خوێندنەکەت بێنیت، پاشان منیش تووشی لێپرسینەوە دەبم.'

'ئەگەر من ئیمزام کرد، ئیتر تۆ بۆچی بەرپرسیاریت، خۆ من دەمێکەیە هەژدە ساڵیم تێپەڕاندووە، پێم وتیت خۆم بەرپرسیارم لە ژیانی خۆم.'

ئارۆن دوای ئەوەی ئەمەی وت، بەتوورەییەوە هەڵسایە سەر پێ و بە هەردوو دەستی قەراغی مێزەکەی گرت و کەمێک نووشتایەوە و لە چاوی تۆماسی ڕوانی و پێی وت، 'ئیتر من تاقەتی ئەو چەلەحانێیەم نییە،ماڵت ئاوا بێت بۆ دڵسۆزیت و پێویستیم پێی نییە!'

هێشتا قومی لە قاوەکەی نەدابوو، خێرا هەستایە سەر پێ و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، پشتی کردە تۆماس و لە کافتریاکە چووە دەرەوە.

## ٣

له باخی پشتەوەی نەخۆشخانەی دەروونیی حەیفا، لەسەر کورسییەک دانیشتبوو، کلیلی ئاپارتمانەکەی توند لەناو دەستی بوو، قاز و مراویی ناو گۆماوی باخی نەخۆشخانەکە وەکو لە بەرزیی دارسنەوبەرەکانەوە بازیان دیبێت، قیرەقیریان سەرنجی نەخۆش و میوانانی باخەکەیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشابوو، لە چواردەوری ئەو کورسییەی ئەوی لەسەر دانیشتبوو، چەند دەروون نەخۆشێک بەتەنیا یان لەگەڵ چاودێری کەرەکانیاندا بوون، لەو کاتەدا خایم لێی دەڕوانین و لە خەیاڵیدا خۆی بۆ ئەوە ئامادە دەکرد، کە چۆن هەواڵی مردنی حەکیم بە مەحموودی کوڕەزای بڵێت، لە کاتێکدا مەحموود خۆی نەخۆشیی دەروونیی هەیە و بێجگە لەوەی چەندین ساڵە بە مادەی هۆشبەرەوە گیرۆدەیە.

وتنی جۆری ڕوودانی مردنەکەی حەکیم بەلای خایم خۆیەوە زۆر گران بوو، دەیویست خاتری مەحموودی کوڕەزای بگرێت و پێی نەڵێت، کە شەش مانگ پێش ئێستا باوکت لە باڵاخانەیەکی پێنج قاتەوە خۆی فڕێ داوەتە خوارەوە، هەروەها ساباتی دایکیشت بۆ کوردستان گەڕاوەتەوە، خایم لەم خەیاڵانەدا بوو، کاتێک لە دەرگای پشتەوەی نەخۆشخانەکەوە کارمەندێک مەحموودی لەسەر عارەبانەیەک بەرەو لای ئەو پاڵ پێوە ئەنا، لە دوورەوە مەحموودی کوڕەزای ناسییەوە، چونکە ئەو ساڵەی مەحموود لەو نەخۆشخانەیە بوو، خایم تاکە کەس بوو دوو حەفتە جارێک

سەردانی دەکرد، کاتێک بینی، دڵی پڕ بوو لە قوڵپەی گریان و فرمێسکەکانی بەسەر ڕوومەتە چرچ و تووکنەکانیدا هاتنە خوار، لە خەیاڵیدا بە خۆی ئەوت، 'تەمەندرێژی ئەوەی ناخۆشە، کە شایەتحاڵی مەرگ و زەلیلیی هەمووان دەبیت!'

کاتێک کارمەندی نەخۆشخانەکە مەحموودی بۆ بەردەم خایم هێنا، تاوێک بێدەنگ لە یەکترینیان ڕوانی، مەحموود لە پیاوێکی بەساڵاچووی پەککەوتە دەچوو، پێستی دەموچاوی بە ئێسقانی ڕوومەتەکانیەوە نووسابوون، ڕەنگی پێستی زەرد و چاوی تەڕ بوو، دوای ئەوەی خایم سوپاسی کارمەندەکەی کرد، دەستی خستە سەر دەستی مەحموود و بەبێ ئەوەی لێی بڕوانێت لەبەرخۆیەوە وتی، 'کوڕێ گیان هاتووم دەنگوباسی دایک و باوکت پێ ڕابگەیەنم.'

مەحموود، کاتێک لە قاز و مراوییەکانی دەڕوانی، لەبەرخۆیەوە وتی، 'دەربایس نیم!'

'ئەزانم تۆ دەربایسی هیچ نیت، بەڵام بە ئەرکی سەر شانم زانی بێم بۆ لات و پێتی ڕابگەیەنم.'

'ئیتر سەگوەڕەکان کۆتاییان پێ نایەت و مرۆڤ تاوەکو ئەتۆپێت لە چەلەحانێ ناکەوێت، باپیرە من ئازادم لەوەی بمەوێت گوێت لێ نەگرم!'

'دەزانم، مەحموود گیان ئەوەتانێ بە ڕوخسار و گوزەرانتا دەیبینم، کە تۆ دەربایسی بیستنی ئەو هەواڵانە نیت، بەڵام...'

'دەی دەی بڵێ، دایم هەمان باڵۆرەیە لای تۆ، بۆ کەس هەیە بتوانێت لە دەستت قوتار بێت!'

'باوکت مردووە.'

دوای ئەوەی خایم ئەمەی بە مەحموود وت، تاوێک بوو بێدەنگ

هەردووکیان لە پیاوێکی نەخۆشیان دەڕوانی، کە بە دوو کارمەند بۆیان ڕام نەدەکرا و بەردەوام دەستی لێ بەرز دەکردنەوە و تفی لێ دەکردن.

خایم دەستی مەحموودی توند گوشی و پێی وت، 'ساباتی دایکیشت بۆ کوردستان گەڕاوەتەوە!'

'باوکم مردووە و دایکیشم سەری خۆی هەڵ گرتووە، هەردوو هەواڵەکە بێ زیاد و کەم لە جێگای خۆیایەتی، ئەوە تەمەنێکە ئەو دوو نەگبەتە هەڕەشەی ئەوە لە یەکترین دەکەن!'

'ئیتر ئەوە هەواڵ و بەسەرهاتەکان بوون.'

'کەواتە هیوای هەردووکیان هاتە دی، بە بیرم دێت کاتێک شەڕیان دەبوو، باوکم دەی وت، دەبێت لە داخی تۆ خۆم بکوژم، دایکم لە وەڵامدا بە باوکمی دەوت، جا کوا تۆ ئەوەندە ئازا بوویتایە و ڕزگارم بووایە لە دەستت، ئەوسا ڕۆژێک لێی نەدەوەستام و دەچوومەوە بۆ ئەو جێگایەی لێی لەدایک بووم.'

'کوڕێ گیان، ئەوە قەدەری ئەوان بوو!'

'قەدەر، قەدەری چی و تەڕەماشی چی، ئەرێ باپیرە تۆ وا قەڕنێک ژیاویت، ئێستاش باوەڕت بە قەزا و قەدەر هەیە!'

'باوەڕ، نازانم، ئەوەی ئێستا باوەڕم پێیەتی ئەم ساتەیە کە لەگەڵ تۆدام، هەرچەندە ئەم ڕۆژە و گوزەرانەی ئێستا من و تۆی تێداین بە خواستی خۆمان نەبووە، کەواتە قەدەر و بەختمان ئێمەی بەمرۆمان گەیاندووە.'

'ناحەقت ناگرم، ئیتر تەمەنت زۆرە و هەست دەکەم خەڵەفابیت!'

'تۆ ڕاست دەکەیت، پێ دەچێت من خەڵەفابم، بەڵام ئەوە بۆ سی ساڵ دەچێت من و تۆ چۆن ژیاوین، من وەکو قەلەڕەشێکی تەنیا لە کولانەیەکی بەرز و لە باڵاخانەیەکدا بەبێ هیچ پەیوەندی و

هاودەنگێک ژیام، بەردەوام پەیکەرم تاشیوە و شەرابم خواردۆتەوە و بە خەیاڵ لە جادە و کۆڵانەکانی سلێمانی بووم، تۆش لەوەتەی لە لاوێتیتەوە هاتوویتە ئەم وڵاتە لە نیگارکێشان و عارەقخواردنەوە زیاتر هیچی ترت نەکردووە، کەواتە من و تۆ هەمان کێشەی دەروونییمان هەیە، کەواتە خۆمان داڕێژەری ئەم ژیان و پاشەڕۆژە نەبووین. هەروەها ئەو جۆرە ژیانە مانای ئەوە دەگەیەنێت من و تۆ بەم ژیانەمان ناڕازی بووین، بەڵام خۆی لە ڕاستیدا من و تۆ مەحکووم کراوین بە ژیانێک کە ئەبەد پێی ڕازی نەبووین، جا لەبەر ئەوە هیچی تری تێدا نەماوەتەوە لەوە زیاتر، کە بڵێم ئەوە قەدەری ئێمەیە، چونکە خەریکە هەموو خەون و خەیاڵێک کۆتاییی دێت.'

'خۆزگە کۆتاییان دەهات!'

'هەموو شتێک کۆتاییی دێت، هیچ شتێک لەسەر ئەم گۆی زەوییە دروست نەبووە، تاوەکو ئەبەد بمێنێتەوە.'

'بەڕاستە، ئەوە هەواڵێکی خۆشە و من ئەوەم نەزانیبوو!'

دوای ئەوەی مەحموود ئەمەی وت، پاشان دایە قاقای پێکەنین و لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئیتر با بە دڵی تۆ بێت، لەبەر خاتری ئەوەی تۆش بە قەزا و قەدەر باپیرەمیت، ئەوە منیش دەڵێم ئەوە قەدەری ئێمەیە.'

'من و تۆ و حەکیمی باوکت بەو قەدەرە ڕازی بووین، هەر بۆیە گۆشەگیر و جۆرێک لە مردنمان هەڵبژارد، بەڵام ساباتی دایکت لە هەموومان عاقڵتر بوو، ئەوەتا بەو پیرییەی دوای خەونەکانی کەوت و هێنایە دی، بە درێژاییی تەمەنی ئەوان حەکیم دەیویست ئەو هیوایە لە دڵی ساباتدا بکوژێت، بەڵام نەیتوانی.'

پاش ئەوەی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، هەستایە سەر پێ و پشتی کردە مەحموود و لە قاز و مراوییەکانی ناو گۆمەکەی

دەڕوانی، وەکو ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بدوێت، لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئێمەی مرۆڤ هەموو شتێک لەلای ئەوانی تر نادرکێنین و دایم نهێنییەک بۆ خۆمان پاشەکەوت دەکەین.'

کاتێک خایم ئەمەی وت، مەحموود بێدەنگ گوێی لە باپیرەی گرتبوو، دەستی لەسەر کۆشی لە یەک هەڵدەسوین و بەسەرنجەوە لە باڵای باپیرەی ڕوانی، پاشان لەبەرخۆیەوە پرسیی، 'ئێ ئەوە باس و خواستی حەکیم و سابات، دەی ئێستا ئێمە چی بکەین؟'

'گوێ لە دڵمان دەگیرن.'

'جا دڵمان بەبەریەوە ماوە؟'

'دەی ئەوە نییە لە ژیاندااین!'

'باپیرە، تۆ بەنیازی چیت؟'

'دەگەڕێمەوە!'

'دەگەڕێیتەوە! تێناگەم، بۆ کوێ دەگەڕێیتەوە؟'

'بۆ نیشتمان، بۆ لای سارا!'

## ٤

'ئارۆن، ئارۆن، وەرە، باپیرە خایم دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات.'

سالار لەناو دالانەکەدا وەستابوو و لە قاتی سەرەوەی دەڕوانی، 'ئەریّ چیت کرد، باپیرە چاوەڕێتە!'

ئارۆن، بە قاڵدرمەکاندا هاتە خوار و ئێلینی هاوڕێی لەگەڵدا بوو، سالار لێی ڕوانین، 'ئاوا، وام زانی بەتەنیایت!'

'باپیرە خایمە؟'

'بەڵێ، دەڵێت ئەمشەو کاتژمێر شەشی ئێوارە لە فڕۆکەخانەی ئەمستەردام دەبێت، ئەوەتا خۆت قسەی لەگەڵدا بکە.'

ئارۆن لە سالاری ڕوانی و تەلەفۆنەکەی لە دەست وەر گرت، باپیرە خایم ئەوەی لەگەڵ ئارۆنیشدا دووبارە کردەوە، کە دوای دوو کاتژمێر لە فڕۆکەخانەی یورشەلیمەوە بەرەو هۆڵەندا بەڕێ دەکەوێت، ئارۆن زۆر بەکورتی پێی وت، ئێمە لە کاتی خۆیدا لەوێ دەبین و چاوەڕوانت دەکەین.

کاتێک ئارۆن قسەی لەگەڵ باپیرە خایمدا دەکرد، سالار تەوقەی لەگەڵ ئێلین کرد، ڕایکێشا بۆ لای خۆی و بێ ئەوەی هیچی پێ بڵێت سەری ماچ کرد، قۆڵەکانی لە ملیەوە ئالاند و توند بە خۆیەوە نووساندی.

شەوی ڕابردوو ئارۆن لەگەڵ ئێلین تاکو نیوەی شەو لە کافتریایەک بوون و کاتژمێر سێی شەو کاتێک کافتریاکە داخرابوو، پێکەوە بە پیاسە بەرەو ماڵەوە گەڕابوونەوە، ئێلین چەند جارێک

بێدەنگ دەستی ئارۆنی گرتبوو، کاتێک گەیشتبوونە بەردەمی ماڵی ئێلین، بە ئارۆنی وتبوو، لە دواساڵی قوتابخانەی سەرەتاییەوە هەستێکی زۆر تایبەتم بۆ تۆ هەبووە، بە جۆرێک، کە لەو دە ساڵەی ڕابردوودا بەردەوام حەزم کردووە بتبینم و پەیوەندیت پێوە بکەم، کاتێک ئارۆن بەسەرنجەوە گوێی لێ گرتبوو، ئێلین باوەشی کردبوو بە ئارۆندا و بەدەم گریانەوە پێی وتبوو، 'ئیتر ناتوانم لەوە زیاتر چاوەڕوانی تۆ بکەم و ئەوەی لە دڵمدایە بەرامبەرت بیشارمەوە،'

ئارۆن لە وەڵامدا بە ئێلینی وتبوو، 'من تاکو ئێستا هەستم بەوە نەکردووە و تەنها وەکو هاوڕێیەک تەماشام کردوویت.'

ئێلین دەنگی هەڵبڕیبوو، بەتووڕەییەوە، 'جا تۆ قەت بواری ئەوەت بە من داوە باسی دڵی خۆمت بۆ بکەم، زۆر جار ویستوومە ئەو باسەت لەگەڵدا بکەمەوە، بەڵام تۆ دایم باسێکت هێناوەتە پێشەوە و منیش توانای دەربڕینیم نەماوە، نازانم تۆ ئاگاداری ئەوەیت، کە زۆرینەی کات تۆ قسە دەکەیت و منیش گوێت لێ دەگرم، بەڵام ئێستا کاتی ئەوەیە من ڕای دڵی خۆم بڵێم.'

لەسەر شۆستەی بەردەرگای ماڵی ئێلیندا بەرامبەری یەکتری وەستابوون و تاوێک بوو بێدەنگ لە یەکترینیان دەڕوانی، گڵۆپێک بەسەر دەرگاکەوە زەرد دەگرا، تەنها ئەوەندی ڕووناکیی پێ دەبەخشین تاکو ڕوخساری یەکتری ببینن، ئێلین چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و سەر ڕوومەتەکانی تەڕ دیار بوون، هێشتا توند بە هەردوو دەستی قەراغی چاکەتەکەی ئارۆنی گرتبوو، ئارۆن بەسەرنجەوە گوێی گرتبوو، بێدەنگ لێی دەڕوانی و تەواوی جەستەی کەوتبووە سەر ئارەقەیەکی سارد و زوو زوو مووچڕکەیەک جەستەی ئەهەژاند، بەترسەوە دەستی برد و ئەو چەند تاڵە قژەی لەسەر ڕوومەتەکانی ئێلین لا دا، کە تەڕیی فرمێسکەکانی بە ڕوومەتیەوە

نووساندبوونی، له کاتێکدا ئێلین به چاوه شین و تەڕەکانی بێ ئەوەی بیانترووکێنێت لێی ڕوانی، ئارۆن له خەیاڵی خۆیدا گەڕایەوه بۆ ڕابردووی و بەخێرایی بەسەر دیمەنی ئەو کاتانەدا چوویەوه، که لێدوان یان هەرچ پەیوەندییەکی لەو جۆرەی لەگەڵ ئەودا هەبووبوو، بۆ تەنها ئاماژەیەک دەگەڕا، به خەیاڵ گەڕایەوه بۆ ئەو ڕۆژەی بۆ یەکەمین جار چوو بۆ قوتابخانه و به ڕێکەوت لای ئێلینەوه دانیشت، ئەو ڕۆژانەی پێکەوه به پاسکیل دەچوون بۆ قوتابخانه و پێکەوه بۆ ماڵەوه دەگەڕانەوه، گەلێک جاریش دوای قوتابخانه له ماڵی یەکێکیان تاکو درەنگانێک یارییان دەکرد.

بەڵام ئەوسا ئەوان منداڵ بوون و هەموو شتێک تەنها دەربارەی پلانی یارییه منداڵانەکانی ئەوان بوو، ئارۆن ئەوەی بیرکەوتەوه، که ئەوان گەلێک جار له کاتی یاریدا خۆیان به ژنومێرد لەقەڵەم داوه، تەنانەت یاریی ماڵەباجێنەکانیان دەگەیشته ئەوەی پێکەوه منداڵیان لەنێواندا هەبوو، زۆر جار دەگەیشتنه ئەوەی تەمسیلی سەردەمی پیرییشیان دەکرد، ئێلین دوای ئەوەی چوار ساڵ له زانکۆی ئەمستردام خوێندی، له ناخەوه له خوێندنەکەی ڕازی نەبوو، تەنها لەبەر ئەوەی له دڵخوازەکەی نێزیک بێت شاری ئەمستردامی جێ نەهێشت، چوار ساڵ ئەو تەنها کاری ئەوه بوو چاودێریی ئارۆن بکات، کاتێک ئارۆن بۆ ساڵێک خوێندن له یاسای نێودەوڵەتیدا بۆ لەندەن چوو، به هۆی ڕووداوێکەوه خوێندنەکەی به ئەنجام نەگەیاند و بۆ هۆڵەندا گەڕایەوه، که بەتەواوەتی نزیکەی هەشت مانگ له لەندەن ژیا، به درێژاییی ئەو هەشت مانگه ئێلین لەگەڵیدا دەژیا و له کافترِیایەک کاری دەکرد، کاتێک ئارۆن درەنگانی شەو لەو کافتریایەی ئێلین کاری لێ دەکرد بۆ ماڵەوه دەگەڕایەوه، لەلایەن چەند گەنجی ئینگلیزەوه پەلامار دەدرێت، به جۆرێک لێی دەدەن،

ئەو شەوە تاکو بەیانییەکەی پێش خۆرکەوتن لەناو خوێناوی خۆیدا جێی دەهێڵن، کاتێک ئێلین لە نەخۆشخانە سەردانی دەکات، ئارۆن ئەو ناناسێتەوە.

دوای دوو ڕۆژ سالار و خێردا ئەو هەواڵە دەزانن، دەچن بۆ لەندەن و دوای دوو حەفتە ئارۆن لەگەڵ خۆیاندا دێننەوە، ئەو ڕۆژانەی ئارۆن لەناو جێگادا کەوتبوو، ئێلین بەردەوام بەدیاریەوە بوو، ئارۆن وای ئەبینی کە ئێلین ئەو چەندین ساڵە وەکو هاوڕێیەکی دڵسۆز هاودەنگ و پشتیوانی ئەو بووە، هەرچەندە کاتێک پێکەوە مەست دەبوون سنووری ئەو هاوڕێیەتییەیان دەشکاند و بە دڵی خۆیان تێکەڵی یەکترین دەبوون، دوای ئەوەی هۆشیان دەهاتەوە بە بەر خۆیاندا، خۆیان لێ بێدەنگ دەکرد و باسیان لێوە نەدەکرد، ڕاگرتنی ئەو پەیوەندییە زیاتر بە خواستی ئێلین بوو.

ئەو شەوە لە بەردەم دەرگای ماڵی خۆیاندا ئێلین توند ئارۆن ڕادەوەشێنێت و لە خەیاڵەکەی دای دەبڕێت پێی دەڵێت، 'دەی، شتێکم پێ بڵێ!'

'نازانم بەو کوتوپڕییە چیت پێ بڵێم!'

'ئێستا، ئێستا چیت لە دڵدایە، ئەوە، تەنها ئەوەم پێ بڵێ.'

'سبەینێ، سبەینێ قسەی لەبارەوە دەکەین.'

ئێلین سەری بە لای ڕاستدا دەخات و لە چاوی ئارۆن دەگەڕێ تاکو لێی بڕوانێت، ئەویش لە دەرگای ماڵەکەی ئەوانی دەڕوانی، وەکو بیەوێت بە ئێلین بڵێت، لە دەرگا بدە و بچۆرە ژوورەوە و ئێستا هیچ وەڵامێکم بۆ تۆ پێ نییە، دوای چاوەڕوانییەکی زۆر و لێکڕوانینی بێدەنگ، ئێلین ناچار بوو ڕووی لە دەرگاکە بکات و دەستەکانی بخاتە گیرفانی چاکەتەکەی و دەست بکات بە گریان، ئارۆن دەستێکی خستبووە سەر شانی و پاشان بەهێواشی شانی

گوشیبوو، پاشان لەبەرخۆیەوە پێی وتبوو، 'سبەینێ دەتبینمەوە،'

پاشان پشتی تێ دەکات و بەسەر شۆستەی بەر ماڵەکەی ئەواندا دەڕوات، لەوێوە بۆ سەر جادەکە و بە دەستی چەپیدا، بێ ئەوەی ئاوڕی لێ بداتەوە ئێلین بەجێ دەهێڵێت.

چی بوو، بۆ ئەوەندە دڵڕەق بوو؟ بۆ لەگەڵیدا کەمدوو بوو؟ دەبێت لە کەیەوە ئەو خەیاڵە ڕۆحی بخوات؟ تۆ بڵێی ئەو هەستەی ئەو لە یەکەم ڕۆژی یەکترناسینیانەوە بووبێت؟ یان دواتر لەو ڕۆژەوەی کە... بەڵام کام ڕۆژ؟ بۆچی ئەم هەستی پێ نەکردبوو، یان ئەو لە ڕابـردوودا ئەوەندە بە باس و خواستەکانی خۆی و باوکی و کەسوکار و ڕابردووی خۆیەوە خەریک بووبوو، پێ دەچێت هەستی مرۆڤانەی خۆی لـەدەسـت دابێت، ئـارۆن ئـەوەنـدە بەقووڵی ڕۆ چووبووە ناو ئەم خەیاڵانەیەوە، لەو تاریکییەدا ئارەقەیەکی سارد ڕژابووە سەر پێستی و زوو زوو مووچڕکێک لە تەپڵی سەریەوە تاکو بەری پێی دەکشا.

کاتێک ویستبووی لە سەرماندا زنجیری چاکەتەکەی دابخات دەستی لەرزیبوو، زوو زوو لەژێر ڕووناکیی دارگڵۆپەکان نزیک دەبووەوە، بەڵام خۆی لێ دەپاراستن و سنووری نێوان ڕووناکیی گڵۆپەکان و تاریکیی ژێر دارەکانی نەدەبەزاند. بەردەوام بە دەستی چەپی لەناو گیرفانی چاکەتەکەیدا پێستی سـەر دڵـی دەگوشی، بەردەوام هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا، کاتێک ئەو دوو سەد مەترەی نێوان ماڵی ئێلین و خۆیانی بڕی و گەیشتە بەردەمی ماڵی خۆیان، ئەوە بە تەمەنی ئەو بۆ یەکەمین جار بوو گڵۆپی هۆڵ و ژووری دانیشتنەکە کوژاوە بن، دیار بوو سالار لە چاوەڕوانیکردنی ئارۆن کۆڵی دابێت، چونکە سالار بە درێژاییی تەمەنی کاتێک ئارۆن لە ماڵ دەر دەچوو، تاکو دەگەڕایەوە چاوەڕوانی دەکرد، یان بە دزییەوە

دەچوو بۆ ئەو جێگایەی ئارۆنی لێ بوو، هەر وەکو چۆن دەیان جار ئارۆن لەناو حەوشەی زانکۆ یان لەناو هۆڵەکاندا ڕێکەوتی باوکی کردبوو، ئارۆن لە دڵەوە بێزار بوو بەو خووەی باوکی، زوو زوو داوای لێ دەکرد دووبارەی نەکاتەوە، ئەوسا سالار بە ئارۆنی دەوت، 'لە دەسەڵاتی مندا نییە، من مەلائیکەتم و بە فەرمانی خوا و سارا بەدواتەوەم.'

ئارۆن گەیشتبووە بەردەمی دەرگاکەی ماڵی خۆیان، کاتێک لە پەنجەرەکەوە لە ژووری دانیشتنەکەی ڕوانیبوو، بینیبووی باوکی لەسەر قەنەفەکە خەوی لێ کەوتبوو، دەستی هەڵبڕیبوو و ویستبووی لە پەنجەرەکە بدات، پاشان دەستی بەهێواشی بە ڕووی شووشەی پەنجەرەکەدا هێنابوو، پاش تاوێک بیرکردنەوە بە هەمان ڕێگادا بەپەلە بەرەو ماڵی ئێلین گەڕابوویەوە، دەستی لە گیرفانی دەرهێنا بوو کردبووی بە ڕاکردن، کاتێک گەیشتبووە بەردەمی ماڵی ئێلین و شۆستەی ناو باخەکەیانی بۆ بەردەمی دەرگاکە بڕیبوو، بینیبووی هێشتا ئێلین لەسەر شۆستەی بەردەمی دەرگاکە دانیشتبوو، لە بەرپێی خۆی دەڕوانی و جگەرەیەکی لەناو دەست بوو، زوو زوو مژی لە جگەرەکەی دابوو، ئارۆن چووبوو لە لایەوە دانیشتبوو، پاشان لەبەرخۆیەوە پێی وتبوو، 'لە کەیەوە جگەرە دەکێشیت؟'

'لەو کاتەوەی لە تۆ بێهیوا بووم!' ئێلین لە کاتێکدا ئەمەی پێ وتبوو، جگەرەکەی فڕێ دابووە بەر پێی و توند نووکی پێڵاوەکەی نابووە سەری، پاشان هەستابووە سەر پێ و پاش ئەوەی خۆی ڕێک کردبۆوە و دەستێکی بە سەروقژیدا هێنابوو، دوو جار لە جەڕەسی دەرگاکەیانی دابوو، ئارۆن لە پشتەوە دەستەکانی بەسەر شانیدا شۆڕ کردبوونەوە و بە ناو قژیدا چپاندبووی، 'ئەوە لە جەڕەست دا، دەی با وەکو جاران ڕاکەین!'

ئێلین لە کۆدی قسەکانی ئارۆن تێگەیشتبوو، کاتێک خێرا ئاوڕی لێ دەداتەوە، ئارۆن بەردەوام دەبێت و پێی دەڵێت، 'خێراکە دەی، تا نەیانکردۆتەوە، کەی ڕام کرد وەکو جاران دوام کەوە، ئێلین بێ دوودڵی دوام کەوە!'

دەستی ئارۆن دەگرێت و لێی دەڕوانێت و پێی دەڵێت، ' دەی بۆ وەستاویت؟'

ئارۆن بەدوای خۆیدا ئێلینی ڕاکێشابوو، پاشان بەڕاکردن و بەدەم پێکەنینەوە گەیشتبوونە سەر جادەکە و خۆیان لە تاریکیی نێوان کۆمەڵێک سنەوبەردا ون کردبوو، گوێیان لێ بووبوو دەرگاکە کرابووەوە، کاتێک بەئەستەم لە بەینی دارەکانەوە ڕوانیبوویان، باوکی ئێلین تاوێک بە لای ڕاست و چەپدا ڕوانیبووی و پاشان بێدەنگ دەرگاکەی داخستبوو، ئێلین لە کاتێکدا هێشتا دەستی لەناو دەستی ئارۆندا بوو، توند دەستی دەگوشێت و پێی دەڵێت، 'دەی ئێستا؟'

'هیچ، یەک جار بەسە، باوکت گوناحە.'

'مەبەستم ئەوە نەبوو!'

'ئیتر، پێویست ناکات هیچ بڵێین.'

'وەکو ئەو دە ساڵەی ڕابردووت مەبەستە؟'

'ئەمشەو چ شەوێکە؟'

'بۆ، کاتەکەی ناوەختە؟'

کاتێک ئێلین بەتەوسێکەوە ئەمە دەڵێت، ئارۆن توند دەستی دەگوشێت، 'هەر ناوەختە!'

'شتێک هەیە من نەیزانم؟'

'بۆ تۆ وا هەست دەکەیت هەموو شتێکی من دەزانیت؟'

'تاکو ئێستا دڵم وای پێ وتووم.'

'باوەڕت پێیەتی.'

'هەردەم، مەگەر تۆ...'

ئارۆن دەچێتە بەردەمی و لێی دەڕوانێت و پەنجەیەک دەخاتە سەر لێوی ئێلین و خۆی لێ نزیک دەکاتەوە و بەهێواشی پێی دەڵێت، 'دەمت داخە.'

دوای ئەوەی ماچێکی لێوی کردبوو و باوەشی پێدا دەکات، ئارۆن هەست دەکات ناتوانێت ئەو بەربەستە بشکێنێت، کە زیاتر لە ١٥ ساڵ هاوڕێیەتی لە نێوانیاندا دروستی کردبوو، دەستی خستبووە ناو پرچە زەردەکەی و دەمولووتی بە گەردنیەوە نووساندبوو، هەستی بە لێدانی خێرای دڵی ئێلین کردبوو، بە جۆرێک، کە هەموو ئازای گیانی لەرزیبوو، بێ ئەوەی هیچی پێ بڵێت، دەستی دەگرێت و بەدوای خۆیدا ڕای دەکێشێت، پاشان بەڕاکردن بەرەو ماڵی ئارۆن دەڕۆن.

کاتژمێر شەشی ئێوارەی ڕۆژی دوای ئەو شەوە، ئارۆن لەگەڵ باوکی و ئێلیندا لە فڕۆکەخانەی ئەمستردام لە هۆڵێکی جەنجاڵدا لە شانی یەکترییەوە وەستابوون و چاوەڕوانی باپیرە خایمیان دەکرد، ئێلین قۆڵی لە قۆڵی ئارۆن هەڵپێکابوو، زوو زوو لێی دەڕوانی و زیاتر خۆی لێ نزیک دەکردەووە و سەری لەسەر شانی دانابوو، سالار لە پانتاییی چەند مەترێکدا بەردەوام دەهات و دەچوو، دەستەکانی لێک هەڵدەگلۆفین و هەناسەی قووڵی هەڵ دەکێشا و لە دەرگای هاتنەدەرەوەی گەشتیارەکانی دەڕوانی، چەند جارێک لەبەرخۆیەوە وتی، 'چۆتە تەمەنەوە و ئەو گورجوگۆڵییەی جارانی نەماوە.'

بۆ ٣٢ ساڵ دەچوو سالار باپیرە خایمی نەدیبوو، لە خەیاڵیدا

دیمەنەکانی ڕابردووی بەتێکەڵی دووبارە دەبوونەوە، ئەوەی ئەوی بێزار کردبوو، دیمەنی سارا بوو، کە بەردەوام لەگەڵ ناوهێنانی باپیرە خایمدا بە خەیاڵیدا گوزەری دەکرد، لە دوای مردنی ساراوە، دوو جار بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ دایک و باوک و مەحموودی برای سارادا کردبوو، بەڵام بەردەوام پەیوەندیی لەگەڵ باپیرە خایمدا هەبووبوو، چەند جارێک باپیرە خایم داوای لێ کردبوو تاکو لەگەڵ ئارۆندا پێکەوە سەردانی ئیسرائیل بکەن، چەندیین جار سالار گفتی ئەوەی پێ دابوون، بەڵام بەبێ سارا نەیدەتوانی جارێکی تر چاوی بەوان بکەوێتەوە، چەند جارێک لەگەڵ باپیرە خایمدا باسی ئەوەی کردبوو، خایم لەوە دڵنیای کردبووەوە، کە ئەوان بە هیچ شێوەیەک تۆمەتی ئەوە ناخەنە پاڵ ئەو، کە دابڕانی سارا لەوان هۆکارەکەی سالار بووبێت، چونکە ئەوە قەدەری ئەوان بووە و دەبووایە ڕووی بدایە.

باپیرە خایم کاتێک لە دەرگای هاتنی گەشتیارانەوە دەر کەوت، جانتایەکی بچووکی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا، پیرێکی سەروڕیشسپی و باڵادرێژ، لە دوورەوە بەسەر ئەو خەڵکەدا لەوانی دەڕوانی، لەگەڵ سالاردا خێرا یەکرینیان ناسییەوە و بەرەو ڕووی یەکتری چوون، تاوێک بەگەرمی باوەشیان بە یەکتردا کرد و هەردووکیان بەخوڕ فرمێسکیان لە چاوان دەڕشت، ئارۆن و ئێلین بەدیاریانەوە وەستابوون و لێیان دەڕوانین، ئەوان ئەوەندە توند یەکتریان لەباوەش گرتبوو و قووڵ بەسەر یەکتریدا دەگریان، دیار بوو ئاگایان لە چواردەوری خۆیان نەمابوو، سالار بێدەنگ بوو، باپیرە خایم چەند جارێک لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئێتر ئەوە قەدەرمانە براگەل!'

کاتێک ئارۆن لەوانی دەڕوانی، بێدەنگ فرمێسکەکانی بەسەر

ڕومەتیدا گل بوونەوە، ئێلین دەستی برد و لەژێر چاکەتەکەیەوە هێواش هێنای بە پشتیدا، هەستی بەوە کردبوو، کە ئارۆن زۆر گەرم داهاتووە و ئازای جەستەی ئارەقەی کردبوو.

سالار خۆی لە باپیرە خایم جیا کردەوە و دەستی گرت، پاشان بە دەستەکەی تری ئاماژەی بەرەو ڕووی ئارۆن کرد، 'ئەوە ئارۆنە.'

'دەزانم.'

## ٥

سێ ڕۆژ بەسەر هاتنی باپیرە خایمدا تێپەڕی، قسەوباسەکانی نێوان سالار و خایم کۆتاییان نەدەهات.

ئەو چەند شەو و ڕۆژە بەردەوام سەریان نابوو بە یەکەوە و قسەیان دەکرد، زۆربەی قسەکانی ئەوان بۆ ئارۆن ئالۆز بوون، بەڵام هەر کاتێک ناوی سارایان دەهێنا، ئارۆن بە سەرنجەوە لێی دەڕوانین، زۆربەی کات گوێی لێ دەگرتن و زۆربەی باسەکانی ئەوان ڕێگایان بەو نەدەدا پرسیار یان بەشدارییان لەگەڵدا بکات، کاتێک باپیرە خایم لە سالاری پرسی، 'تۆ بڵێی گۆڕەکەی سارا ئاسەواری مابێت؟'

'سابات مانگێک پێش ئەمڕۆ چووبوو، دەڵێ ئەو شوێن و دێهاتانەی جاران ئاسەواریان نەماوە، بەڵام ئەگەر بەوردی بگەڕێیت، لەوانەیە جێگای قەبرەکەی سارا بدۆزیتەوە.'

'چی بکەین ئەگەر نەشمان دۆزییەوە! ئیتر قەدەری ساراش وەکو ئەوانی تر.'

ئارۆن بەبێزارییەکەوە لە باوکی ڕوانی، 'بۆ نازانیت لەکوێ ناشتووتە؟'

'چۆن نازانم! بەهۆی ئەوەی ئەو ناوچەیە دەیان ساڵ ئاوەدانیی تێدا نەبووە، پێ دەچێت گژوگیا دایپۆشیبێت. نا، نا چۆن، هەر دەیدۆزمەوە.'

باپیرە خایم دەستی خستە سەر دەستی سالار، 'دەڵێم، تەلەفۆنێک

بۆ سابات بکەین، تاکو ئاگاداری بکەینەوە و لای خۆی جێگا و ڕێگامان بۆ دابین بکات.'

'دەزانێت و چاوەڕێمانە.'

ئارۆن بەپەشۆکاوییەکەوە هەستایە سەر پێ، پشتی کردە ئەوان و چوو تاوێک بێدەنگ لە بەردەمی وێنەکەی دایکیدا وەستا و توند دەستەکانی لێک هەڵگلۆفین، گەڕایەوە بۆ لای باوکی و باپیرە خایم و دەستی خستە سەر شانی باوکی، دوای ئەوەی توند بەرقەوە شانی گوشی، 'ئەو شتانەی ئێوە چەند ڕۆژێکە باسیان لێوە دەکەن، من هیچ لە بارەیانەوە نازانم!'

'چۆن کوڕێ گیان، دەتەوێت چی بزانیت؟' باپیرە خایم کاتێک ئەمەی وت، دەستی ئارۆنی لەسەر شانی سالار گرت و بۆ لای خۆی ڕایکێشا و بۆنێکی پشتەدەستی ئارۆنی کرد و ماچی کرد، سەری هەڵبڕی و لێی ڕوانی، 'دیارە باوکت ویستوێتی تۆ لەو هەموو دەردیسەرییە بەدوور بگرێت!'

'بەڵێ ئەوە زۆر ڕاستە.'

'لەوەتەی بیرم کردۆتەوە بەردەوام خەونی ناخۆش دەبینم، ناسۆری دەیان برین لەسەر ڕۆحم هەست پێ دەکەم، بەبێ ئەوەی بزانم هۆکاریان چییە، تۆ قەت بیرت لەوە نەکردۆتەوە، کە تۆ بە ئاگایی و بێ ئاگایی لە هەموو خەمەکانی خۆت بەشی منت داوە؟'

سالار هەستایە سەر پێ و هات لە تەنیشت ئارۆنەوە ڕاوەستا و دەستی خستە سەر شانی، 'ئیتر، تاکو ئێستا شتەکان چۆن هاتبن ئەوە تازە ڕابورد، بە ئەقڵی خۆم وام بە باش زانیوە و بڵێم لێیان پەشیمانم... نازانم بڵێم چی! ئایا هیچ لە مەسەلەکان دەگۆڕێت؟'

قۆڵی لە ملی ئارۆنەوە ئاڵاند و توند نووساندی بە خۆیەوە و بەردەوام بوو و وتی، 'تۆ نازانیت بۆ من چەند گران بووە، هەردەم

زۆر بەئاگاییەوە هەڵسوکەوتم لەگەڵ تۆدا کردووە، بەو هیوایەی ئاخۆ چۆن سارا تەمەننای کردبێت!'

دوای ئەوەی سالار ئەمەی وت، دەستی لە ئارۆن بەر دا و چوو لە بەردەمی پەنجەرەکەدا ڕاوەستا و بێدەنگ لە دەرەوەی دەڕوانی، باپیرە خایم دەستی ئارۆنی لەناو دەستەکانی ڕاگرتبوو، سەری پەنجەکانی بە ڕووی پێستیدا دەهێنا، ئارۆن قووڵ چووبووە ناو بیرەوەرییەکانیەوە تایەکی گەرمی لێ هاتبوو، ئەو چەند ڕۆژە ئەوەندە بەدیار باوکی و باپیرە خایمەوە دانیشتبوو، گوێی لە چیرۆکەکانی ئەوان گرتبوو، بێهێز و ڕەنگزەرد دیار بوو، بێجگە لەوەی هەستی بە خوێنێکی گەرم دەکرد لە دڵیەوە بەردەوام شەپۆلی بەرەو دیوارەکانی جەستەی دەدا، بەردەوام لەناو خۆیدا لە شەڕێکی سەختدا بوو، چیرۆکی ڕابردووی باوک و دایکی تەواوی خەیاڵی ئەویان داگیر کردبوو، لەو کاتەدا بێدەنگییەکەی نێوانیان درێژەی کێشا و هەرسێکیان لەناو خەیاڵی خۆیاندا نوقم بووبوون، خێردا وەکو پیشەی دایمیی خۆی، لە دەرگای حەوشەی پشتەوە و ناو باخەکەوە هاتبوو لە بەردەمی پەنجەرەکەدا ڕاوەستابوو، لە پەنجەرەکەوە بەرامبەر سالار وەستابوو لێی دەڕوانی، سالار لەو کاتەدا دەستی لێک هەڵپێکابوون و چاوی نووقاندبوو، کاتێک خێردا هێواش لە ڕووی پەنجەرەکەی کوتا، سالار چاوی هەڵبڕی و لێی ڕوانی، خێردا بە ڕوویەکی خۆشەوە هاتە ژوورەوە و بەخێرهاتنی باپیرە خایمی کرد و ئەو بێدەنگییەی نێوانیانی شکاند، زۆری پێ نەچوو لەگەڵ ئارۆندا چوون تاوەکو کەرەستە بکڕن و ئەو ئێوارەیە پێکەوە خواردن دروست بکەن، خێردا چەند جارێک پرسیاری ئەوەی لە ئارۆن کرد، گوایا بۆچی ئەوەندە بێزار و بێدەنگ دیارە، لە ڕێگا باسی پەیوەندیی نێوان خۆی و ئێلینی بۆ کرد، خێردا لە

وەلامدا پێی وت، 'دەزانم.'

'چی دەزانیت؟'

'ئەو دەمێکەیە بەنیاز بوو ئەوەت پێ بڵێت!'

'بۆ پێشتر لای تۆ ئەوەی باس کردبوو؟'

'دەی چۆن، چەند جارێک ویستم لەگەڵتا باسی بکەم، بەلام...'

'بەلام چی؟'

'نازانم، وا بزانم کاتێک ویستم ئەوەت پێ بڵێم، تۆ باسی پەیوەندیی خۆت و ئەو کچەی ترت بۆ کردم!'

'کام کچ؟'

'کچە ئەڵمانییەکەی لە ئەمستردام لەگەڵتا دەیخوێند، ناوی چی بوو؟'

'ئەنیتا، نا نا، لەگەڵ ئەودا هیچی وا لە نێوانماندا نەبوو!'

'ئەرێ ئارۆن بەیارمەتیت، خۆ نەتدەتوانی تەنها بۆ شەوێک چییە دەستبەرداری بیت!'

'بۆ سێکس!'

'ئێ ئێ، پیسوچەپەڵ، بەلام کاتی خۆی، تۆ بە جۆرێکی تر بۆ منت باس کرد.'

'ئێلین بەوەی زانیبوو؟'

'دەی چۆن.'

'تۆ بۆت باس کرد، یان خۆی...'

'نەخێر، بەڵکو ئەو بۆ منی باس کرد، تۆ واز لەوە بێنە، دەی ئێستا بەتەمای چیت؟'

'هەست ئەکەم ئەوە چەند ڕۆژە پەپوولەیەک بەردەوام بەناو قەفەزەی سنگمدا دەفڕێت، بەلام...'

'بەلام چی؟'

'هاتنی باپیره خایم و زوو زوو ناوهێنانی سارا و باسکردنی ڕووداوەکانی ڕابردوویان، بەتایبەتی ئەم گەشتەی بۆ کوردستان دەیکەین، نازانم، تیا ماوم خێردا، خۆت دەزانیت چەندین ساڵە لە شەڕدام لەگەڵ قبووڵکردنی ئەو ڕابردووەمدا، چوونم بۆ کوردستان بۆتە هەنگاوێکی زۆر گەورە و هەست دەکەم قاچەکانم توانای داهێنانەوەی ئەو هەنگاوە زلەیان نییە، بێجگە لەوەی لەناو خۆمدا چەندین شتی ئاشکرا و شاراوە گوشار دەخەنە سەر ڕۆحم و وزەیان لێ بڕیوم، با ئێلینیش لەولاوە بۆستێت، هەست دەکەم لە کاتێکی ناوەختدا یەخەی گرتووم.'

'ئازیزم، خۆشەویستی وەکو گرتنی پەتا وایە و کات و ناکاتی بۆ نییە، هەروەها ئێمە دەمێکە باس لەو گەڕانەوەیەی تۆ دەکەین، ئیتر گرانە، دەزانم تۆ لە چی دەترسیت، بۆ کردنەوەی ئەو گرێکوێرەیە گرنگە تۆ ئەو بڕیارە بدەیت، سارا و سالار و کوردستان، ئیتر، نیشتیمانی ئەبەدیی ناو ڕۆحی تۆن و ناتوانیت لەبیری خۆتیان بەریتەوە، بڕۆ خێرا بڕۆ و لەناو دڵ و لە ژیانتا جێگایان بدەرێ، زۆر شت لای تۆ تەنها خەیاڵن، یان خەیاڵی ئەوانی ترن و تۆ بە هیی خۆتت کردوون، ئەوە چەندیین جار باسمان لێوە کردووە!'

پێکەوە لە بەردەمی ڕەفەیەکی بەرزی مارکێتەکەدا وەستابوون، خێردا دوای ئەوەی ئەمەی بە ئارۆن وت، لێی ڕوانی و باوەشی پیا کرد و ڕوومەتی ماچ کرد، 'حەز ناکەم شتەکان ئەوەندە بەقورسی بگریت.'

'ئیتر، خۆیان زۆر قورسن!'

ئارۆن و خێردا بەنیازی دروستکردنی یاپراخ بوون، سالار و باپیرە خایمیش لەگەڵیاندا لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانیشتبوون و باسیان لە سالانی پەنجاکانی شاری سلێمانی دەکرد، ئارۆن لەگەڵ

ئەوەیشدا، کە لەگەڵ خێرداداا بە زمانی هۆڵەندی دەدوا و خەریکی پێچانەوەی یاپراخەکە بوو، گوێی لە قسەکانی ئەوان ڕاگرتبوو، زوو زوو پرسیارێکی ئاراستە دەکردن، هەر جارێک ئارۆن بە کوردی قسەی بکردایە، باپیرە خایم لەبەرخۆیەوە دەیوت، 'ئافەرم سالار، بۆ ئەو کوردییەی فێرت کردووە!'

کاتێک مەنجەڵەکەیان نایە سەر ئاگر و چاوەڕوانی کوڵانی یاپراخەکە بوون، سالار بە ئارۆنی وت، 'تەلەفۆن بۆ دەسگیرانەکەت بکە بابێت نانمان لەگەڵدا بخوات.'

'کام دەسگیران؟'

'حەبیّ!'

باپیرە خایم دەستی خستە سەر دەستی ئارۆن، 'بۆ کوڕێ گیان، دڵخوازەکەت کوردە؟'

'نا نا باپیرە، باوکم مەبەستی لە ئێلینە!'

## ٦

شەوی پێش ئەو ڕۆژەی بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، باپیرە خایم دوو دەفتەری کۆنی لە جانتاکەی دەر هێنا و دایە دەستی ئارۆن، بەرگەکانیان لە چەندین لاوە پینە کرابوو، ڕەنگی پەڕەکانیان زەرد هەڵگەڕابوو، لە بەردەمی خۆیدا داینان و لەو کاتەدا سالار هات بەسەر سەریەوە ڕاوەستا، 'چییان تێدا نووسراوە؟'

'یادەوەری و دەردیسەریی ژیانی خۆم!'

بەرگەکانیان هیچیان لەسەر نەنووسرابوو، کاتێک ئارۆن بەرگی یەکەم دەفتەری هەڵدایەوە، شیعرێک لەسەر لاپەڕەی دوای بەرگەکەی نووسرابوو، سالار دانەوییەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی:

"زۆرینە مەعمووری جەهل و خەرابن
جەخارمە لەجەم خودا ئەوان حیسابن
شێخ و مەلا و واعیز، ئەهلی هەوەس
بێقیمەت وەتەن لەکن هزنی ئەوان"

کاتێک سالار لە خوێندنەوەی شیعرەکە تەواو بوو، 'ئەوە ڕۆژی شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ لەسەر نووسراوە.'

ئارۆن بەسەرنجەوە لە باپیرەی ڕوانی، 'باپیرە، ئەوسا تەمەنت چەندبوو؟'

'ساڵی ١٩٠٠ لەدایک بووم، یانی ئەو ڕۆژانە ٣٠ ساڵ بووم.'

'بەڕاستە باپیرە؟ یانی تۆ ئێستا تەمەنت ٩٦ ساڵە؟'

'دەزانم کوڕێ گیان!'

باپیره خایم هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دەستی برد و دەفتەرەکانی لەژێر دەستی ئارۆن دەر هێنان و وتی، 'ئەوە بۆ زیاتر لە بیست ساڵ دەچێت، نەم خوێندوونەتەوە و هیچم تیا نەنووسیوون، بە مەبەستی ئەوەی بتوانم تاوێک خەیاڵم لەو ڕابردووەی ئەوسای کوردستانم داببڕم، بەڵام دیارە ئەوە کارێکی زۆر ئەستەمە. لەو ٣٢ ساڵەی ڕابردوودا بەردەوام بە خەیاڵ گەڕاومەتەوە بۆ ئەوێ و غەریبیی ماڵە کۆنەکەمان و گەڕەک و شار و هاوڕێکانم کردووە، تاکو ئەم تەمەنەشم لە نهێنیی شوێنی لەدایکبوون و گەورەبوون تێنەگەشتووم، ڕۆحم زۆر پابەندە پێوەی، باوەڕم پێ بکەن، لە ٢٠ ساڵی ڕابردوودا دوو جار دوختۆر پێی وتووم، کە ئەوپەڕی چەند مانگێکم لە ژیاندا ماوە، ئەو سەرەتانە نەگریسە هەموو ئازای گیانمی تەنیوە و بەقەدەر دارهەڵووژەیەکی بەردار لوو بە گیانمەوەیە، بەڵام هەست دەکەم لەلایەن کەسێکی دڵپاکەوە نزام لێ کراوە و لەلای خوداش گیرا بووە، ئەویش بەدیهاتنی ئەو خەونەمە، کە تەنها بۆ یەک جار بۆ زێدی باووباپیرام بگەڕێمەوە، بەردەوام بە ترس و لەرزەوە بۆ خەوتن چوومەتە ناو جێگاوە، هەردەم ترسی ئەوەم هەبووە بمرم و ئەو ئاواتەم نەیەتە دی. بەتایبەتی کە دەمبینی ئەوانەی لەگەڵ مندا لە کوردستانەوە بۆ ئیسرائیل هاتبوون، هەموو بڵاوەیان لێ کرد، حەکیمی کوڕم...'

باپیرە خایم لە ئارۆنی ڕوانی و بەردەوام بوو و وتی، 'کە باوکی دایکی تۆ بوو، چەند مانگێک پێش ئەمڕۆ بەبێ ماڵئاوایی کۆتاییی بە ژیانی خۆی هێنا، دوای مردنی حەکیم، ساباتیش بۆ کوردستان گەڕایەوە، مەحموودیش لە گەنجێتییەوە جێی هێشتین و چوو بۆ ئورشەلیم و لەوێ ئالوودە بوو، پاشان تووشی نەخۆشیی دەروونی بووە و ئێستا لە نەخۆشخانەیە، دوختۆرەکان پێیان وتم،

که تەنها چەند مانگێکی لە ژیاندا ماوە، چونکە ئۆرگانەکانی جەستەی داوەشاون و چارەسەر ناکرێت، ئیتر ئاوا، ئەو کەسانەی جێگام لەناو دڵمدا بۆ گرتن، وەکو ڕێبوارێک تێپەڕین و لەپێش چاوم ون بوون، بەڵام جێگاکانیان بەبەتاڵی لەناو دڵی مندا هەر ماوە، هەموو ڕۆژێک یادی یەکبەیەکیان دەکەمەوە، لە سەرەتاوە تەمەنناى ئەوەم دەکرد، تووشی نەخۆشیی لەبیرچوونەوە ببم، حەزم دەکرد ئیتر ئەو ڕابردووە و یادی کەسوکارم لەبیر بچێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە... لە ئێستادا کە تەمەنم ٩٦ ساڵە، دەتوانم ناوی هاوڕێکانی سەردەمی منداڵیمتان یەک بە یەک پێ بڵێم.

کاتێک لە کنێسەتەکەی گەڕەکی جوولەکانی شاری سلێمانی دەمانخوێند، دەرس و دەوری سەرەتایی و پاشان بە دوانزە ساڵی چوومە یەشیڤا. وانەکانمان هەمووی بە زمانی عەرەبی و تەرجوم بوون، من تاکو تەمەنم بوو بە ١٥ ساڵ و لە یەشیڤایش دەر چووم، زمانی کوردیم زۆر کەم دەزانی، دوای ئەوەی بووم بە هاوڕێی حەمەجانی حاجی سەلیم و خەسرەوی حاجی ئاغا و فوادی صالح قەفتان و گەلێکی تر، پاشان پێکەوە لەلای عەبدوڵڵا ئەفەندی و دوایی چەند جارێک لەلای حاجی تۆفیق وانەی زمانی کوردیمان خوێند. بێجگە لەوانە، بەبیرم دێت کاتێک لە ساڵانی گرانی و جەنگدا چەندین جار سەرانە لە دوکاندارەکانی قەیسەریی نەقیب سەندرا، دەیانوت ئەوە پیتاکە و بۆ غەزا لە دژی ڕووس و ئینگلیزەکان خەرج دەکرێت، بە درێژاییی ساڵانی گرانییە گەورەکە دەرگای زۆربەی دوکانەکانی قەیسەریی نەقیب داخرابوون، بێجگە لە دوکانی جووەکان، کە ئەوانیش بەتاڵ بوون و ئەگەر مشتەرییەک بهاتایە ئەوا دەچووین لە مەخزەن یان لە ماڵەوە شتمان بۆ دەهێنا، ڕۆژانــە ســەربـازە تورکەکان بەناو بــازاڕ و کۆڵانەکانی شــاردا

دەگەڕان و سەرانەیان لە خەڵکی دەسەند. باش بەبیرم دێت، ئەو ڕۆژەی لەشکر بەرەو کەرکووک بەڕێ کەوت، لەگەڵ خامیێ لەسەر چەمی قلیاسان بووین، کاتێک سوار و پیادەکان بە لاماندا تێپەڕین، هەموو تفەنگلەشان و فیشەکدانیان لە خۆیان بەستبوو، ژمارەیان چوار سەد کەسێک دەبوو، بێجگە لە سوارە کوردەکان، سەربازە تورکانەی لە پێش و پاشیانەوە بوون، ڕۆژێک پێش ئەو ڕۆژە، زۆربەی پیاو و گەنجانی شار لە بەگزادە و ئاغا و مزگێنەکان لە بەردەمی ماڵی شێخ مەحمووددا کۆ بووبوونەوە، مەلاکان لە مزگەوتەکان و لە ناوبازاڕدا خەڵکیان هان دەدا تاکو بچن بۆ شەڕ، دەیانوت، غەزا لە دژی ئینگلیزی خاچپەرست!'

باپیرە خایم تاوێک بێدەنگ بووبوو، لە بەرگی دەفتەرەکەی دەڕوانی و دەستی پێدا دەهێنا، پاشان بەردەوام بوو وتی، 'خامێی موشێی عەتاری هاوڕێم، لە حەیفا، گەنجێکی عەرەبی موسوڵمان لەناو دوکانەکەی خۆیدا بە چەقۆ کوشتی، کاتێک ناشتیشیان، من نەچووم، چاوم بەرایی نەدا!'

## ٧

'دەڵێم باپیرە خایم، تۆ لە دوێنێ ئێوارەوە قڕوقەپت لێ کردووە، دوای ئەوەی تەلەفۆنت بۆ ئیسرائیل کرد، وا بزانم پێت وتم قسەت لەگەڵ سیمانەی هاوڕێت کردبوو، پێم بڵێ سیمانە کێیە و باسی چیتان کرد؟ ئەوا...'

'کوڕێ گیان، هەواڵی مردنی مەحموودی برای دایکتم بیست، ئەوە زۆر دڵتەنگی کردووم و کەمێک هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەم، چونکە گفتم بە مەحموود دابوو هەرچۆنێک بووە جارێک بۆ سلێمانیی بەرمەوە، ئیتر بۆمان ڕێک نەکەوت و ئەوەتا ئەو بەو داخەوە سەری نایەوە!'

'بەڕاست، کەی مردووە؟'

'دوێنێ، لە نەخۆشخانەی دەروونیی حەیفا تووشی جەڵدەی دەماخ بووە، مەحموود گوزەرانی زۆر خراپ بوو!'

'ئەرێ باپیرە، دەی لە ڕابردوودا کەسێک نەبوو بیگرێتە خۆی و دەستگیرۆیی بکات؟'

دەی چۆن سالار گیان، من دوو جار بۆ ماوەی چوار-پێنج ساڵ هێناومەتە لای خۆم و لای من ژیاوە، بەو مەبەستەی بتوانم کاریگەریم لەسەری هەبێت، بەڵام بێسوود بووە، دایک و باوکی دەمێک بوو دەستیان لێ شۆردبوو، لە ڕاستیدا ئەو ڕەشبینییەی لە دەروون و قووڵاییی ناخی مەحموودا هەبوو، وا بزانم ساراش هەمان کێشەی هەبوو، پێم وا بێت ئەوە پەیوەندیی بە جۆری ژیان و

بێهیوایی ئێمەی جووەوە هەبێت، مەحموود لەوەتەی لە ئیسرائیلە لە عارەقخواردنەوە و وێنەکێشان زیاتر هیچی تری نەکردووە، هەست دەکەم کاتی خۆی و لە سەردەمی منداڵیدا شتێک لە ناخی ئەو و سارای خوشکیدا شکاوە، چونکە هەردووکیان هەمان کێشەی دەروونییان هەبوو!'

'چۆن؟ بۆچی دایکیشم هەمان کێشەی هەبووە؟'

لە کاتێکدا ئارۆن ئەمەی لە باپیرە خایم پرسی، سالار دەستی خستە سەر شانی ئارۆن و لێی ڕوانی و پێی وت، 'بێگومان ساراش هەمان کێشەی هەبوو!'

ئارۆن دەستی باوکی لەسەر شانی لا برد و بەبێ ئەوەی لێی بڕوانێت لەبەرخۆیەوە وتی، .'دەبێت ئێمە شتێک... ئیتر مەبەستم لە هیوایەکە تاوەکو لە پێناویدا بژین، ئەگینا هەموومان وەکو سارا و مەحموود بەرامبەر بە ژیان ڕەشبین ئەبین.'

دوای ئەوەی ئارۆن ئەمەی وت، بێدەنگی کەوتە نێوانیان و هەموو لە خەیاڵی خۆیاندا خەریکی لێکدانەوە و هۆکاری ئەو ڕەشبینییەی ناخی خۆیان بوون، پاشان ئارۆن لە باپیرە خایمی پرسی، 'بۆ خاڵە مەحموودت لەگەڵ خۆت نەهێنا؟'

'وەکو بۆم باس کردیت، باری تەندروستیی ئەوەندە ئاڵۆز بوو، بەکەڵکی سەفەر نەدەهات، بێجگە لەوەی دەبووایە بۆ ئەویش پاسپۆرتمان بە ناوێکی ترەوە درووست بکردایە، ئیتر لە ڕاستیدا ئارۆن گیان خۆشم زۆر لە گەڕانەوەم دڵنیا نەبووم، ئێستاش کێ دەڵێت ڕێگامان پێ دەدرێت بۆ کوردستان بگەڕێینەوە!'

'باپیرە خایم تۆ هیچ خەمی ئەوەت نەبێت، سبەینێ دەچین بۆ دەنهاخ و لە سەفارەتی عێراق و بە ناوی ترەوە پاسپۆرتت بۆ وەر دەگرین.'

مانگی شەشی ساڵی ١٩٩٦ لە فڕۆکەخانەی بەغداد دابەزین، سالار بە ئارۆنی وت، 'ئەرێ تۆ پەیوەندیت بەو هاوڕێیەتەوە کرد، تۆ بڵێی لە کاتی خۆیدا بێت بەدواماندا؟'

'بەڵێ.'

'دەی پێت وت ئێمە سێ کەسین؟'

'دەی چۆن.'

باپیرە خایم سەری لار کردەوە و لە ئارۆنی پرسی، 'کوڕێ گیان ئەو هاوڕێیەت کێیە؟ ئایا جێگای باوەڕە؟'

'کەسی خۆمانە!'

'چۆن؟ بۆ کەسی خۆمان لە کوردستان ماوە؟'

'سالار دەستی خستە سەر شانی باپیرە خایم و پێی وت، 'زەکیی کوڕی حەمەجان و ساشا.'

کوڕە سالار گیان ئاوا نەڵێیت، من لە غەریبی هەواڵی مردنی حەمەجانم بیست، ئیتر لە ساشا و منداڵەکانی بێخەبەرم.'

'ساشا لە ژیاندا نەماوە، بەڵام زەکی و وەنەوشە لە سلێمانی دەژین.'

سالار کاتێک ئەمەی وت، قۆڵی لە قۆڵی باپیرە خایم هەڵپێکابوو، دوای تاوێک بێدەنگی، باپیرە خایم بە چواردەوری خۆیدا ڕوانی و لەبەرخۆیەوە وتی، 'زەکی و وەنەوشە.'

دوای ئەوەی ناوی ئەوانی هێنا، لە سالاری ڕوانی، 'خۆشترین کاتی تەمەنم لەم شاری بەغدادە لەگەڵ حەمەجانی هاوڕێمدا بەسەر بردووە، بێجگە لەوەی گۆڕی کانیشای هاوسەرم لە گۆڕستانی گەڕەکی تەوراتە، ئەرێ کوڕگەل گیان، دەڵێم دەتوانین چەند ڕۆژێک لێرە بمێنینەوە؟'

سالار شڵەژا و خێرا دەستی خستە سەر شانی باپیرە خایم و

پێی وت، 'باپیرە خایم مانەوەی چی! تازە کاتی ئەوەمان نییە و زەکی لە بەیانیی زووەوە لە سلێمانییەوە بەڕێ کەوتووە، پێ دەچێت ئێستا لە گەراجی فڕۆکەخانە بێت، لەبیرت نەچێت لەم شارەدا زاڵمترین ڕژێم حاکمە و سەگ و گورگیان زۆرە، دەبێت زۆر ئاگامان لە خۆمان بێت!'

ڕۆژێک دوای ئەوەی گەیشتبوونەوە سلێمانی، لەسەر شیوەکەی جوولەکان ڕاوەستابوو، قۆڵی لە قۆڵی ئارۆن هەڵپێکابوو، دەیزانی بەبێ هێز و هاوکاریی ئەو پێکانی هێزیان تێدا نییە هەنگاو هەڵبێننەوە، بە دەستەکەی تری گۆچانێکی داری چەماوەی بە دەستەوە بوو، توورەکەیەکی ڕەنگ بۆری لە شان کردبوو، زیاتر لە نیو کاتژمێر لەوێدا بە بێدەنگ لە ئاو و لیتاوی شیوەکەی دەڕوانی، لەو کاتەدا ئارۆن دەستێکی گرت بە بەری لووتیەوە و لەبەرخۆیەوە، 'ئەوە ئەو بۆنە ناخۆشە چییە؟'

باپیرە خایم بەبێ ئەوەی لە ئارۆن بڕوانێت، 'بۆن، بۆنی چی؟'

'بۆنی ئەو میز و گوواوە!'

'کام میز و گوواو؟ بۆ کوڕێ گیان پێی قەڵسیت؟'

لەو کاتەدا بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی ئارۆن بکات، ڕووی وەرگێڕا و گۆچانەکەی بەرز کردەوە، 'دەڵێم بچین بۆ کنێسەتەکە؟'

کاتێک گەیشتنە کۆڵانی کنێسەتەکە، باپیرە خایم لە نووسینی سەر دەرگای کنێسەتەی ڕوانی و لەبەرخۆیەوە لە ئارۆنی پرسی، 'ئەرێ کام شێخ عەباس، ئەو عەباسە کێیە و چ کارەیە، تاوەکو لەم شارە شوێنێکی ئاوا پیرۆزی بە ناوەوە ناو بنێن؟'

لە بەردەمی دەرگاکەدا وەستا و دەستی کرد بەناو توورەکەکەی شانیدا و بەردێکی پڕ بە مشتی لێ دەر هێنا و وتی، 'کوڕێ گیان من چاوم بەرایی ناهێنێت بێمە ژوورەوە، با لەوە زیاتر ڕۆحم ئازار

نەچێژێت، بڕۆ ئەو بەردەم بۆ بەرە و لە حەوشەکەدا لە سووچێکەوە بۆم دابنێ.'

زەکی بە پیکابێکی سپییەوە لە بەردەمی مزگەوتی شێخ عەباسدا وەستا، کاتێک دابەزی، پێش ئەوەی بگاتە لای باپیرە خایم، لەبەرخۆیەوە وتی، 'لە گەڕان تەواو بوون.'

باپیرە خایم بەتەنیا شانی نابوو بە دەرگای مزگەوتەکەوە، لە زەکیی ڕوانی، 'ئا، ئا، تەواو ئەوەی ویستمان بیبینین، ئاسەواری نەماوە!'

بە درێژاییی ئەو ڕۆژە دەگەیشتە هەر جێگایەک تاوێک بێدەنگ دەوەستا و چاوی دادەخست، لەبەرخۆیەوە دەیوت، 'ئێمەش لێرە بووین، ئێمە لێرە بووین کاتێک هەمووشتێک لێرە ڕووی دەدا.'

ناوی ئەو شوێنانەی بە ئارۆن نووسیبوو کە دەیویست بۆیان بچێت، بەردەوام دەکۆکی و سەری بە لای شانی ڕاست و چەپیدا دەکەوت، ئارەقە لە دەموچاوی دەچۆڕا، ئارۆن زوو زوو بە باپیرە خایمی دەوت، ئیتر تۆ و سالاری باوکم ئاووهەوای کوردستانتان پێ ناکەوێت. باپیرە خایم بەبێ ئەوەی لە ئارۆن بڕوانێت لەبەرخۆیەوە دەیوت، 'نامەوێت باوەڕ بەو قسەیەت بکەم!'

کاتێک گەیشتنەوە ماڵی زەکی، وەنەوشە و سالار لە بەردەرگاکەدا چاوەڕوانیان بوون، باپیرە خایم ئەوەندە ماندوو بوو، نەیتوانی لە سەیارەکە دابەزێت، لە سالاری ڕوانی و بە دەنگێکی گڕ و بەدەم کۆکینەوە وتی، 'ویستم بۆ سەرا و قەیسەریی نەقیبیش بچم، بەڵام وا بزانم کاتم نییە، مردن خەریکە زەفەرم پێ دەبات، ئیتر هەرچۆنێک بووە بمبەن بۆ ئەو جێگایەی ئەوسا گۆڕی مردووانی باووباپیرانمی لێ بوو، ڕازیم ئەگەر بەوێیش ڕابگەم!'

هەموویان پێکەوە گەیشتبوونە سەر ئەو ڕاستە شەقامەی چل

ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە بەناو گۆڕستانی جووەکانی شاری سلێمانیدا تێپەڕیبوو، باپیرە خایم، کاتێک سالار و ئارۆن چوونە ژێر باڵی و لە سەیارەکە دایان بەزاند، لە بێهێزیدا لەسەر سەکۆی شەقامەکە دانیشت و دیسان دەستی کرد بە توورەکەکەی شانیدا و بەردێکی دەر هێنا و لەسەر چیمەنتۆی سەکۆکە دای نا، چاوی داخستبوو کاتێک لەبەرخۆیەوە وتی، 'لە ڕەقی و تەمەنی ئەبەدیەتی خۆتا یادی ئێمە هەڵبگرە و بە نەوەی داهاتووی ئەم شارە بڵێ کە ئێمەش لێرە بووین.'

ئیتر ئەوە دوا وتەی باپیرە خایم بوو، پاشان تەنها دوو ڕۆژ لە سلێمانی ژیا، ئێوارەی ڕۆژی دووەم، لە ماڵی زەکی بەبێ ماڵئاوایی و لە چەند هەناسەیەکدا چاوی لێک ناو گیانی دەر چوو.

ڕۆژێک دوای مردنی، لە گۆڕستانی سەیوان لە تەنیشت حەمەجانی هاوڕێیەوە ناشتیان. ئەو ڕۆژە سالار دوای زیاتر لە سی ساڵ ساباتی دایکی سارای بینییەوە، دوای ئەوەی تاوێک بەسەر یەکتریندا گریان، زیاتر هیچیان بە یەکترین نەوت و نە ناوی سارایان هێنا و نە گەڕانەوە بۆ ڕابردوویان. سابات کاتێک دەستی کردە ملی ئارۆن، بۆنی پێوە کرد و لەبەرخۆیەوە وتی، 'ئیتر بەم بەشەم ڕازیم.'

حەفتەیەک بوو باپیرە خایم مردبوو، بەڵام قسە و کردەوەکانی ئەو خەیاڵی هەمووانی داگیر کردبوو، پاشان زەکی لەگەڵ سالار و ئارۆندا چوون بۆ دۆڵی زەڵێ، تاوەکو لە ئاسەواری گۆڕەکەی سارا بگەڕێن، دێ بە دێی دۆڵی زەڵێ گەڕان، بەبێ ئەوەی سالار بتوانێت ئەو جێگایە بدۆزێتەوە کە پێش زیاتر لە پانزە ساڵ سارای لێ ناشتبوو.

## ٨

ده ساڵ بەسەر مردنی باپیرە خایمدا تێپەڕیبوو، ڕۆژی پێنجشەممەی مانگی دەی ساڵی دوو هەزار و شەش بوو، ئێوارە درەنگ، کاتێک ئارۆن لە زانکۆ گەڕایەوە، سالار بەبێ ئەوەی گوێ بە نانخواردنی ئێوارەیان بدات، خەریکی شەرابخواردنەوە بوو، ئارۆن گەیشتە ناو هۆڵی دانیشتنەکە و چۆنی و چاکیی لەگەڵدا کرد، لەو کاتەدا سالار خەریکی هەڵچڕینی بتڵێک شەراب بوو، دوای ئەوەی چەند جارێک هەوڵی هەڵچڕینی شووشە شەرابەکەی دا، پاشان ڕووی کردە ئارۆن و بە کوردی لێی پرسی، 'ئادەی مام پیاو بۆم هەڵچڕە.'

ئارۆن لێی ڕوانی و لەبەرخۆیەوە بە زمانی هۆڵەندی پێی وت، 'لێت تێناگەم؟'

'ئەگەر بە دڵ گوێت لێ بگرتمایە ئەوا دەمێکە بوو فێری ئەو زمانە بووبوویت!'

'هەڵبەتە پێویستیم پێی نەبووە بۆیە بە دڵ گوێم پێ نەداویت!'

'باوەڕ ناکەم ئەو قسەیەت لە دڵەوە بێت؟'

'خۆ درۆت لەگەڵ ناکەم.'

'ئەبەد نەمویستووە قوتابیم بە زۆری شەق و لێدان فێری خوێندن بکەم، بەڵام دیارە لەگەڵ تۆدا سوودی نییە، پەشیمانم لەوەی لە کاتی دەرسخوێندندا چوار شەقی باشم تێ هەڵنەداویت!'

'تۆ بەردەوام لێم دەپاڕایتەوە و ماستاوت بۆ دەکردم تاوەکو بێم

و له پۆلەکەتدا وەکو قوتابیت دانیشم، جا ئەگەر زۆردار بوویتایە ئەوا منیش تۆم وەکو مامۆستام قبووڵ نەبوو.'

'ئێ چی بکەم مەجبوور بووم!'

'مەجبوور... بۆچی؟'

'نازانم بۆچی، لەبەر سارا، یان تۆ تەنها قوتابیم بوویت، لەوانەشە من بەردەوام بیری پیشەکەی خۆم کردبێت و لەسەر وانەوتنەوە گیرۆدە بووبم!'

'لەبیرم نایەت بۆ جارێکیش چییە بە دڵ وانەم لەلات خوێندبێت!'

'ئاخر تۆ نازانیت بەهای زمانی کوردی چییە؟'

'بەبیرم دێت جاران پێت دەوتم، کە کەس بەقەدەر تۆ قیمەتی تەختەڕەشی قوتابخانەی لەلا نییە!'

'من دەتوانم خۆم بە نەوەی یەکەمی مامۆستای زمانی کوردی دابنێم، ئیتر بزانە دەبێت من چەند خەمخۆری گەیاندنی ئەو زمانە بم.'

'دەزانم، چاک دەزانم، بۆ لە ڕابردووماندا تۆ هێشتووتە من ڕۆژێک پشوو بدەم!'

'ئیتر کوڕم نەبوویتایە!'

'بە قەزا و قەدەر!'

'سوپاس بۆ سارای ڕەحمەتی کە تۆی بە من بەخشی.'

سالار پێکێک شەرابی تێکرد و پەرداخەکەی گرت بە دەستیەوە، لە کاتێکدا ویستی قومی لێ بدات لە ئارۆنی ڕوانی و لێی پرسی، 'قومێک شەرابم لەگەڵدا ناخۆیتەوە؟'

'باشە! پێکێکم بۆ تێبکە، هەرچەندە من وەکو تۆ لە ژیان بێزار نیم!'

'لە ژیان بێزار؟ کێ؟ من؟ ئێ، ئەگەر مردم لاشەکەم بسووتێنە،

بەڵام کاتێک جەستەم بوو بە خۆڵ تکایە نەهێڵیت زۆر لەو گۆزەیەدا بمێنمەوە، چونکە خۆت دەزانیت من ڕقم لە جێگای بچووک و تەنگەبەرە، لەوە دەچێت بەردەوام لەوێوە هاوارت لێ بکەم، مەبەستم ئەوەیە خێرا تەپوتۆزی جەستەم لە جێگایەک بڕێژە.'

'جێگایەک!'

'خۆت کوێت پێ گونجاو بوو.'

'خۆڵی جەستەت بە دۆڵی زەڵێدا دەپرژێنم، یانی دەتبەمەوە بۆ لای سارا؟'

'کەواتە تۆ بەردەوام هەستت بە ئازاری دڵی باوکت کردووە؟'

'بەڵێ، لەو ڕۆژەوەی دوکتۆرەکە پێی وتین، کە تۆ نەخۆشیی دڵت هەیە!'

'ناوی سارات هێنا، دەڵێم ئەگەر سارا لە ژیاندا بمایە ئایا ئێستا ژیانمان چۆن دەبوو؟'

'لەوانەیە تۆ...'

لە کاتێکدا ئارۆن ئەمەی وت، خێردا بەپەلەپەل هاتە ناو هۆڵی دانیشتنەکەوە، پاڵتاوێکی شینی درێژی لەبەردا بوو، پرچە زەرد و سپییەکەی بە تنۆکی باران تەڕ بووبوو، قسەکەی بە ئارۆن بڕی و هەردوو دەستی پان کردنەوە و وتی، 'ئارۆن گیان بمبوورە دوا کەوتم.'

'بووراویت، ئیتر منیش تەنیا نەبووم، ئەوەتا بەدیار ئەم سەرخۆشەوە دانیشتووم و هەر باس باسی مردنە!'

'مردن، جا ئەگەر ئێمە هەموومان مردنێک قەرزار بین، ئیتر بۆچی نەوێرین باسی بکەین؟'

خێردا ئەمەی وت و چوو بە ڕووی سالاردا نووشتایەوە و ئەملاولای ماچ کرد، سالار بەساردییەکەوە دەستی خستە سەر

شانی خێردا و وتی، 'زۆر جار ڕزگارمان دەکات لە مەینەتیی ژیان.'

خێردا و ئارۆن بەرامبەری سالار وەستابوون و لێیان دەڕوانی، خێردا سەری بە لای شانی چەپیدا لار کردەوە و بەنازێکەوە لە سالاری پرسی، 'کام مەینەتی؟'

'خۆشەویستی.'

'ئەبەد لێت خۆش نابم!'

کاتێک خێردا ئەمەی وت، بێدەنگی کەوتە نێوانیان، پاشان سالار ئەو بێدەنگییەی شکاند، دەستی برد بۆ شووشەی شەرابەکە و بەبێ ئەوەی لە خێردا بڕوانێت، لەبەرخۆیەوە وتی، 'دەڵێم خێردا پێکێکم لەگەڵدا ناخۆیتەوە؟'

کاتێک هەردووکیان پشتیان کردە سالار و ویستیان بڕۆن، خێردا ئاوڕی لە سالار دایەوە و بە دەنگێکی تێکشکاوەوە وتی، 'پێت وا نییە زۆر درەنگە، نەخێر سوپاس.'

ئارۆن و خێردا گەیشتبوونە دالانەکە، سالار بانگی لە ئارۆن کرد و لێی پرسی، 'ئەرێ ئەدرەسی سامی فەرەج و سازگارت لە ئەمریکا بۆ پەیدا نەکردم؟'

ئارۆن وەڵامی باوکی نەدایەوە و پێکەوە لەگەڵ خێردا ڕۆیشتن.

دوانیوەڕۆی ڕۆژی دوایی، کاتێک ئارۆن لە ماڵی خێردا گەڕایەوە، ڕێکەوتی سالاری کرد لەسەر زەویی ژووری دانیشتنەکە لەسەر دەم لەناو ڕشانەوەی خۆیدا کەوتبوو، دوای ئەوەی پاکی کردەوە و جلی پاکی لەبەر کرد، لەسەر قەنەفەی ژووری میوان ڕای کشاند و لە تەنیشتیەوە دانیشت و دەستی سالاری توند گوشی، کاتێک سالار بەخەبەر هاتەوە، لەبەرخۆیەوە وتی، 'هاتیتەوە، ئارۆن دوێنێ ویستم ئەوەتان پێ بڵێم، کە پێویست ناکات تۆ و خێردا گلەیم لێ بکەن، چونکە تاکە دڵشکاو لێرەدا منم، کاتێک لە سالانی ڕابردوودا

بە داواکاریی خێردا ڕازی نەبووم، دڵنیا بە ئەوە ئازاری دڵی خۆمم داوە و هیچ مەبەستم لە دڵشکاندنی ئەو نەبووە، با بزانیت لەبەر خاتری تۆ ئەوە ناڵێم، بەڵکو هەردەم هەستم کردووە سارا چاوی لێمە و ئاگاداری هەموو کردەوەکانمە، نەک تەنها ئەوە، دەڵێم ئارۆن، کوڕە باش گوێم لێ بگرە، هەموو ساتێکی ژیانم و هەروەها لە پەروەردەکردنی تۆشدا هەستم بە بەرپرسیارێتی کردووە، دوای مردنی سارای دایکت، ئیتر من وەکو... بڵێم چی، کۆیلەیەک ژیاوم، وەکو کۆیلەیەکی تۆ و لەبەر خاتری تۆ و دڵی دایکت ژیاوم، ئەگین هەردەم ڕۆحم بە تاڵەدەزوویەکی باریک بەم ژیانەوە بەستراوە، بە جۆرێک لەدوای مردنی ساراوە، بەردەوام مردنم لە ژیان پێ باشتر بووە.'

'دەزانم، دایم هەستم پێ کردوویت!'

دەستێکی لەناو دەستی ئارۆندا بوو، بە دەستەکەی تری لەسەر کراسەکەیەوە سەرسنگی گوشی، سەری بۆ ڕاست نەکرایەوە لێی بڕوانێت، توند دەستی گوشی و چاوی داخست.

ڕۆمانی نیشتمانی سارا، بەواتایەکی تر نیشتمانی دایک دەگەیەنێت، مێژووی کوردستان و بەتایبەتی شاری سلێمانییە، کە پێمان دەڵێت؛ دین ڕەگەزنامە نییە.
پیرەمێردێکی بە ئەزموونی خوێنەوار ساڵی ١٩٥٢ لە کۆڕێکدا وتبووی: ڕاگوێزان یان ڕۆیشتی زیاتر لە شەست هەزار جوو لەم هەرێمە، چ ئاسەوارێکی بەتاڵ و وێرانەیان لەداوی خۆیان بەجێهێشت!
لە شاری سلێمانی، دەرابەی دوکانی خومچییەکان بۆ ئەبەد دادرانەوە و ڕەنگی خومە گیراوەکان لەناو مەنجەڵە مسەکاندا لەودیوو دەرابە داخراوەکانەوە وشکبوونەوە و بۆ هەتا هەتایە نوسان بە بنی مەنجەڵەکانەوە و تیکڵاوی ژەنگی مس و ئاسنەکان بوون. چاڵ و گۆزە گڵینەکانی ناو حەوشەی ماڵی مۆردەخای لەسەر شیوەکەی جولەکان، لەلایەن درواسێکانیانەوە تێک و پێک شکێنران، سندووقی ترێ بەتاڵەکان ئیدی سەفەری ڕەزەکانیان نەکرد و خاوەن ماڵی نوێ وردی کردن و کردنی بە قورگی زۆپا دارینەکەیدا، تاوەکو چەند ساڵێکیش دوای ڕۆیشتی ماڵی مۆردەخای، موشتەرییەکان تاقوتەرا دەهاتن و لەدەرگایان دەداو لەژێر لێوەوە و زۆر شەرمنانە دەیانپرسی: ئەرێ عەیب نەبێت شەرابمان هەیە؟

Novel

**Sara's Homeland**

**Miran Abraham**

٨٠٠٠ دینار